تۆماری تەمەن – 1 – گەشت
کەریم زەند
چاپی یەکەم
تایپو مۆنتاج: چاپەمەنی ئەزمەر
ئۆفسێت: چاپەمەنی روون
فەرزی بەرگ: دلناز
کوردستان – سلێمانی
ژمارەی سپاردن: 92
سالی: 2004
تیراژ: 500

دیاربو تیێشووی گەشتو تراژیدیای مەرگو ژینو

جیهانی ژێروو کۆڕو خەوابکەو نارامگەو گڵکۆ -

پێشکەشە بە:

قوربانیانی ئازادیو رزگارکەرانی گەلانو جەماوەرانی

ستەمدیدەی بندەست، لە تاریکسان.

بۆ/ گەلانی روو لە رۆشنایی، خوازیارانی سەربەستی

بۆ/ خەباتگێر و شۆڕشگێڕان،

کە سەرمایەیان ئەزموونو کارامەییە،

پێشکەشە بە/

دەستی گەشمردانو شامێرانو نەمرانو جاویدانو

هەرگیز زیندووانی کوردستان

لە چرکەی لێدانی هەموو دڵێکی پڕ لە ئەڤینو خۆشەویستی

ئاشتیو دیموکراتیو تەبایی و لەخۆبایینەبوونو

سەردانەواندن بۆ لەخۆ تواناتر.

زەمەن قارەمانە، نەیبرای کورد،

حاجی قادری کۆیی وتەنی:

مەرگو ژین میسلی سێبەر و تاوە

ئەویبـاقیبـێ هــەر نــــــاوە

# گەشتی زەند

# سەرهەڵدان

**وێڵەدەر**

1936 لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، لە فێرگەی نمونەیی، کە لە پێشدا پێی دەوترا، فێرگەی دووەم، تەنها 2 فێرگە هەبوو لە هەموو شاری سلێمانیدا. گەشتێکی فێرگەیی رێکخرا بۆ گوندی وێڵەدەر بە چیای گۆیژەوە، کە زنجیرەی کێوی ئەزمرە – ئەزمیر – لەو گەشتەدا بەشدار نەکرام، بەهۆی کەمتەمەنیو لاوازیو گچکەیو لە بەزمیی و داڵدەیی باوکیش بێبە شبووم، ئەو هۆکارانە، کاریگەری دەروونی هەبوو. بۆ بەیانی کە رۆژی هەینیبوو، زوو بەرێڕێگەمکرت لە تەك خوێندکارەکاندا، کەوتمەڕێ، سووکرەویو چالاکی و پیادەییەکەم، سەرنجی فێرکارو هەڤاڵەکانی راکێشا، ئەمە هاندەربوو کە گەشتوگوزار بکەم بە پیشە.

**هەزارمێرد:**

1938بە گەشتی فێرگەیی چووین بۆ گوندی جێشانەو ئەشکەوتی هەزارمێرد، بە رابەری مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم و مامۆستا جەلال مەلا کاکە حەمە سەیفوڵا، کوڕی مامۆستای ناودار. لە گوندی وڵوبە و کانیگۆمەوە، بە چەمی ئاڵیشەدا بەرەو گوندی جێشانەو هەزارمێرد.

هەزارمێرد، لە قەدپاڵی چیای بەرانانەو، بەسەر دەشتی سەرچناردا فەرمانڕەوایە، لە چینەکانی خوارەویدا، شوێنی ئاگردانو کوانووی لێدۆزراوەتەوە، لەتەك کەمەکی ئێسکو ئامێری بەردەستی، ئەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بەردینی کۆنو ناوەند، تەمەنی لە نێوان 33-50 هەزار ساڵدایە.

لەو چەرخەدا مەردوم، خۆراکی خۆی کولاندووە، چێشتی بە ئاگر لێناوە، خۆی پێگەرمکردۆتەوە.

لە سلێمانییەوە تا زاری ئەشکەوتەکە 15 کم. زاری ئەشکەوتە گەورەکە گچکەیە، لە چوونە ژوورەوەدا گەرەکە خۆت ئەوی بکەیت، دوای چوونە ناوەوەی، 4 کەس بە پێوە بەڕیز بە ناویدا دەڕوات. ماوەی دووری 300م، نزیکەی 200م پتر رۆیشتین، ئۆکسجین کەمبۆوە، لایتەکان رووناکییان نەئەدا، تاپڕمان پێبوو، کاکە کەریم قەرەنی براو هاوڕێم تفەنگێکی تەقاند، دەنگدانەوەکەی بەخێرایی دەنگ مەزندە نەکرا بە 100م ئەو ماوەیەی کە مابوو، ویزەویزی شەمشەمەکوێرە، بۆشایی ئەشکەوتەکەی پڕ کردبوو، سامو بۆنی ناخۆشی ریقنەی زۆری ئەم زیندەوەرە، کە پەینی سروشتییە ، زۆر بەدی ئەکرا، لەبەر ئەمانە، گەڕاینەوە.

رێگەی‌تر،

سلێمانی، بەکرەجۆ، بە پێدەشتدا، بەرەو گوندی باڵچوخو بنگرد، 2گوندن لەمبەرو ئەوبەری چۆمی ئاڵیشە. لە جۆگەی کاک ئەحمەدەوە، پێدەشتی کەم بەرەو گوندی هەزار مێرد، 30 خانەیە، لە پەنا دۆڵێکدا بە دامێنی چیای بەرانانەوە، گوندی دێکۆن لای راستیەوە، گوندی داربەڕوو لای دێکۆنو لای چەپیشی گوندی جێشانەیە.

## قەڵای بارۆیی:

دوزی بارۆیی، لە بەکرەجۆوە بە پێدەشتدا ماوەی 25 خولەك، گوندی باڵچوخ ، گادانی، 12 خانە، چۆمی ئاڵیشە، بنگردی خێڵی مەحمی 35 خانە، جۆگە لە ئاڵیشە هەڵگیراوە، دووڕیانی هەزارمێرد و دێکۆن، بەرەو بنارو هەوراز، هەزارمێرد و دێکۆن لای چەپ، ناوەندی رێگەی گوندی داربەڕوو، لەمنجاوا، داربەڕوو 25 خانە لای راست، لەمنجاوا 7 خانەی لای چەپ، هەورازو بان، گوزەرگەی بەرانان ، 2 قوتکەیە، هەموو دەشتی سلێمانیو بەکرەجۆو بناری چیای گۆیژەی لێدیارە. لێژیو لابەلا بە بناری ئەودیوی چیای بەرانانندا، دارو گۆڕ بە پاڵی ئەمبەرو گوندی بارۆیی بە بناری ئەوبەرەوە، 70 خانەیە.

هەوراز بەرەو دوژی بارۆیی، ماوەی 3 چارەك بەپێ، پاشەوارى دۆژی كۆن، شێوە هێلكەیی نزیكە لە بازنەوە، درێژی تیرەكەی 104 م، سەرەوەی بانی تەخت، شوێنی بیری پڕكراوە بە بەرد، شوێنی بەرگری بووە.

جێگەی خانووەكانیو شورەكەی ماوە، بناخەی دیواری شورە دەستكردەكەی پانی 2م، كەڵەكە بەردی ڕێكخراو بەردی گەورە و گچكە، ڕەنگی ڕەشو كەڕووی سەوز و گەسك، لەسەر بەردەكانی – قەڵا سوركە بەو بەرەوە، گوندی سەرزەل قەراخ 20 خولەكە، سنووری بەخشی قەراخ نزیكە دوا سنووری بازیانە، دەشتی بازیان و سەگرمە و پشتی خاوێ دیارە.

لای خۆراوای قەڵاكە، هەمووی گەورگە داتاشراوە، شوێنی حەسانەوەو دانیشتنە بۆ سیبەری بەهانیان.

هۆكاری رووتكردنەوەو خواردن، باو ئاو و باران كاریتێكردووە، گوندە نزیكەكانی: بارۆیی گچكە لە قەدپاڵی ئەودیو، داریكەل شێخی ئەمر، كانیكە، گوندی زیپكە، كانیشایە، سەرچاوەی هاڵە، لەولایەوە نزیكی هەنجیرەی بازیانە.

**شەقامی ئۆتومبیل:**

لە ڕێگەی تاسڵوجەوە، چاخانەی ئالایی، یەكدوخانەی سەچاوەی كانیگەورە، كانیپێنجشەم 6 خانە، كانیشایە، 60 خانە، ورمزیار 4 خانە، گاولنی 50 خانە، بارۆیی دوا گوندی بەخشی بازیانە.

دوژی بارۆیی، شوێنی بەرگریبووە لە هێرشی نارامسندا و هەڵمەتەكانی ئاشوری بۆ سەر زاموا.

## هەڵەبجە:

لە سلێمانییەوە، 76 كم، داربەرولە، بەلای گۆڕستانەكەیدا، خەراجیان، ئەربەت، دووڕیانی دەربەندیخان.

سلێمانی – دەربەندیخان 69 كم، بنكەی بەخشی ئەربەت – ئاری بت، ڕێی بەرزنجە و پردی گچكەی خڕی چەناخچیان.

سلێمانی – بەرزنجە 57 کم، دوای پردی چەناخچیان بە ڕێگەی زیندا، هەنجیرە، هەورازو پێچو دۆڵ‌بان، تەختی، دەشتی زەڵێ- چاخانەی مۆرپاس، 20 خولەکە بۆ گوندی مۆرپاس، فوتکەی کوڕەکاژاو، دوزی گێڵدەرە، دیارە، دوورپانی گێڵدەرە و کوپەی حاجی – بەرزنجە لە دامێنی چیای کوڕەکاژاودا، تەختیو کەمێ هەوراز، بەرزنجە لە پردی چەناخچیانەوە بۆ هەڵەبجە. ڕێگەکەی باشنییە، کانیپانکە و موان، گوندو ئاوەدانی، فێرگەو تیمارگەی تێدایە، گوندی گرێزە، دەشتی قوڕیچیا، سەراو، گۆمێکی گچکە-گۆمی سەرای سوبحاناغا، گوندی قلرخ، سەیسایەق، بنکە ی بەخشتی شارەزوور، پردی داخراوی سەیسایەق – دوورپانی پێنجوین.

سلێمانی-پێنجوین، 105 کم، گوندی قەدەفری، پردی زەڵم، چاخانەکەی گوندەکە بە پاڵ گردەوەیە، باخو گوێچەم و درەختی بی، ڕێگەی ئەحماوا، 10 خولەکە بۆ خورماڵ-خۆرماڵ، ڕێگەکە بە نزیکی گۆمی دەربەندخاندا، تەپەگوڵاوی، بنکەی بەخشتی سیروان، کێلەسپی، دێتەوە سەر ڕێگەی کۆن، باخی کێلەسپی، لای چەپی گوندی زەمەقی، لای ڕاستی گوڵانی خواروو، هەڵەبجە، شارۆچکەیە، مۆناتی 50 هەزار کەسە، لە پێدەشتدا، مەڵبەندی بازرگانییە، بەهۆی نزیکی لە سنوورەوە شەقامێکی ڕێکە بە ناوەندیدا.

# خولیا

# بڕیـــار

**لێرەوە:**

خولیـاو بڕیـار، لێـرەوە سـەرهەڵئەدات، ڕێنمـایی بـۆ گەشـتی فراوانـو درێـژخایانو ئەپساوە، بـە ئومێـدی گـەڕانێکی سەرانسـەر بـە هـەموو کوردستاندا، بەپێ و هـەر هـەموو خاوەری میانـەو زوربـەی کیشوەرو گـەرتی ئـەوروپا و بەشـی زۆری خاکی ئەمەریکا بگەڕێم، ماوەی 13 ساڵ.

هەرلێرەوە، لە ئاکامی ئـەم گـەڕانو دەربەدەریـەدا چـەرخو چاخو دەرفـەتی ڕۆژگار گەڕیدەیی بکەم بە پیشە و جوگرافیای کوردستان سەرتاپا بە مەیـدانی لـەو هاوکێشەیەدا دابڕێژم کە جەمسەرێکی چەرخو زەمەنە و جەمسەرەکەیتری زەوییە و مرۆڤیش خۆی دروستکەرو بڕیاردەرەو خاوەنی هزرە.

جوگرافیای کوردستان، ئا لێرەوە سەرهەڵئەدات، 1945.

**بیارە:**

لە هەڵەبجەوە، 18کم، ڕێگەی زەخەڵان، پێدەشت، پرد، لە بنـاری گونـدی ئەبابـەیلێوە، جەیەلـە – چەلیلـە، بـەرەو ئەنـەب، بـە نـاو بـاخو دارو درەختـدا، چاخانەی بیاوێڵە، چاخانەی دەرەشیشی خـواروو، چـەند جۆگـەو ئـاو، دەرەشیشی ژووروو، هەوراز، خەرپانی و چۆمی بەنەو چاخانە، دووڕیانی تەوێڵە، پـردو چۆمو گوندی خاگێلان، بناری چەپی نارنجەڵەو گولپ، باخەکۆن، ئاو و پردی زەردەهاڵ.

پێشی زەردەهاڵ، بە ڕێگەی گولپدا 3کم، بۆ گوندی گولپ 30 خانـە، لابـەلاو پێچ، بەردەڵانی تا گونـدی سەرگەت، هانەی دن 3کم.

ســەرگەت 10 خانەیــە، بەولایــەوە هانــەی دن 110 خانــە، چــاخانەی زەردەهــاڵ گونــدی دەرەقەیســەر لای راســت، بنجۆی دەرە لــە نــاو شــیوەکەدا، لای چەپەوە رێگەی هەورازو بەردەلانی، پێچ، خانووەکانی پێشی بیــارەو چاخانەکەی دیارە.

بیارە، لە دۆڵێکدا، خانووەکانی بەری خۆراوای، 3 گەڕەکە، پشتجۆ، نــاو دێ، گەڕەکی شێخان، مۆناتی 5 هــەزار کەســە، فێرگەی ســەرەتایی، ناوەنــدی، تیمارگــە و چاخانەو بازاڕی گچکەی تێدایە.

لــە خانــەقا، ئارامگــەو خەوابگــەی شــێخانی رێبازگــەی نەخشــی تێدایــە، خەوابگەی شێخ ئومەر، شێخ ئەلائەدین، شێخ نەجمەدینی تێدایە.

چۆمی بیــارە، لــە چیــای شــرامەوە دێــت، کــە زنجیرەی چیــای هەورامانــە. تەمــەنی بیــارە 450 ســاڵ پــترە، لــە وشــەی بــوێرە، بێــدارەوە هــاتووە، لــە دۆڵێکــی درێژدا، دارستانو باخ دایپۆشیوە تا دەراوی دەرەقووڵو بنجۆیدەرە.

2 پرد، هەردوو بەری بیارەی بەیەکەوە بەســتووە، بــە تایبــەتی ئــەو پــردەی ناو ئاوایی، پردێکیان ئوتومبیلی پێــدا ئــەڕوات بــۆ تەوێڵــە. چۆمەکەی، لایەنــەکانی هەڵبەستراوە بە بەرد، خانووەکانی وشکەکەڵەکو دوو نهۆمە.

## تەوێڵە:

17کم لە بیارەوە، قەدپاڵو ناوباخ، رووەو هەوراز، لای راستی دۆڵ، چاخانەی دەرگاشــێخان، گوندەکــە لــە ســەرەوە، گــۆڕی ســاوا پێچــو هــەوراز و لابــەلا، هاڵــە، کانیوەزنــەی بەڵخــە، نــاو بــاخ، تاقگــەی لەســەرەوە، ســەری سەیســەلام، باخــەکانی خوارووی بیارە، دیارە، پــێچ بــۆ ئــەودیوی بەڵخە، ســەری شنروێ دیــارە، چاخانەو گوندی بەڵخە.

فێرگە، لە سەر رێگە، کانیبەڵخە، چاخانەو کانیشڵە، کانیاوی ساردوو ســێبەر، سوورەچنــاری گــەورە، گۆمــاو، لــە خــوارەوە، پێچــو لابــەلا، خــوارەوەی بــاخی شــەمی، رەزەکــانی سۆســەکان بەرانبــەری ملەشــۆپــی ئــەودیو ســنوور، باخــەکانی تەوێڵــە، بەریو گەریات، پێشی تەوێڵە، هەوراز، بۆ تەوێڵە.

خانەقاو ناوئاوایی لە دۆڵێکدا، هەردووبەری خانووی وشکەکەڵەکو دوونهۆم 10 هەزارکەس پتر، بازاڕو فرۆشگە، چاخانەو فێرگە و تیمارگە و پۆست، شوێنی دیدەنیو سەیرانگەی ئاوێسەر 45 خولەکە بەپێ، هەوراز بە ناو باخدا و سێبەرو درەخت تاکو ئاوێسەر، کانیاو و تەختیو سێبەر لە دامێنی چیای هەورامانی تەخت، سەری تەخت بە لوتکەوە، بەو دیودا گوندی هەورامانی تەخت، بەشی ژاوەرۆ، شەقامی ئوتومبیلی سەر سنوور، بۆ هەورامانی تەخت 500 خانە، ئەودیوی باخو ئەستێل، گوندی خۆشی، ئاوایی کەماڵانە.

گوندەکانی هەورامانی تەخت: سەرێپیر، سڵێنی، بلیە، نۆین، کەلجی، ژیوارە.. چاوگی سیروان، لە بەردەمی ئاوی سڵێنیەوە، هەوارگەی پیر رۆستەم، جێگەیەکی خۆشو سازگارە.

تەوێڵە، لە دۆڵێکی 3 کوچکەدایە، دەرەیەکی تاکو گوندی دزاوەر و کۆتایی باخەکانی ، دەرەگەیتری تاکو ئاوێسەر بریتیە لە 3 گەڕەك، چلانە، مالیدەر، بەرلنبەر... خانەقای گەورە 1868 ز، دروستکراوە، مەزارو ئارامگەو خەولگەی شێخ وەسمان، شێخ سیراجەدین ی تێدایە. خانووی شێخ بەوبەرەوە، سوورەچنار لە بەردەمیدا، بڵندگوی پێوەیە.

## خورماڵ – خۆماڵ:

لە هەڵەبجەوە 15 کم بە گوندی دەلێندا – گێلەسپی، چاخانە، لای راست گردی سەفا، ئاوایی حەمە، گردی ئەولا، تەپەکوڕە، زەڵم، رێگەی سلێمانی، گوندی زەڵم بە بناری گردەوە، رێگەی قیر، کوڵکنی ئاوایی حەمەی کەرەم، جانجان لای راست، چەقەڵاواو شیرەمەڕە لای چەپ، درەختو باخو سەوزی و تەختی، خورماڵ بنکەی بەخش لە پێدەشتدا، هەندێك خانووی بە گردەوە لای خاوەری، مزگەوتو رۆشنگە مێژوویەکەی لە چاخی ئوسمانیدا دروستکراوە.

ئەم هۆنراوەیەی بە فارسی لەسەر بەردی سەر دەرگاکەی نووسراوە، سەردەمی چاکردنەوەی مزگەوتەکە لە چاخی موسا بەگی بابانیدا:

| | |
|---|---|
| والی ملک جـود و کهف عبـاد | ان سـلیمان تخـت عـــزت و داد |
| ید بیضـــــاء نمـود موســـــی | له گـل گلعنبـرش ز لطف بمـــداد |
| دربنـا هـــای خیر شـد سـاعی | بهـر اجـر و پـواب روز ســــعاد |
| مسجد کردند سالٌ شاه سلیم | دید گشت است جای قزر و رماد |
| زکرم چنـــد بـدره در تعمـیر | صرفکرد ازا و بیافت حســن مراد |
| این اشـارت زغیب شـد تاریخ | بـود مســـــجد بزکـر حـق اباد |

رۆشنگەكە، لە خشتو قسلٌ دروستكراوە، 26 پليكانەيە، هەر پێپيلكەى 30 سم، سەربانى مزگەوتەكە 9 خڕگەيە چالاوى مزگەوتەكە 7 × 11 م.، سولتان ياوز سەليم 1453ز دروستيكردووە، موسابەگى بابان 226 سالٌ لەمەوبەر چاكى كردۆتـەوە. 1162، ئەحمـەد عـەلى شـەعبان نووسـيويەتى: 1393، چالاوى مزگەوتەكە، چاوگەكەى لە ناو خۆيدايە، گۆماوە، تێكەلٌ بە چۆمى زەلٌم ئەبێت، لاى شورەكەيەوە، بازاڕو فرۆشگەى هەيە... گەڕاوەكەى كبريتە، شوێنى خۆشتنى هەيە، ڕێگەى ئەحماوا زيخو خۆلە، گۆڕستان لاى چەپى، لێرەوە ئەحماوا ديارە، جۆگەى ئەحماوا، گوندى ڕۆستەم بەگ، چاخانە، ڕێى بيارە، ئاوايى ڕۆستەمبەگ، پێچى تەخت، هەوراز بۆ ئەحماوا، چاخانەكانى بن پەلك، ئەحماوا ئاو و قەلبەزە و چۆمى زەلٌم و چەند جۆگەيەك، لێى جودا ئەبێتەوە، سەيرانگە و سێبەر، پيادەڕێ بۆ گوندى زەلٌم، چاوگەوكەى بە دامێنى لاى چەپدا چۆمى زەلٌم بەلاى راستدا، دۆلٌى قوولٌ، پڕ لە درەخت، هەنارو توو گوێز، تاشە بەردى زل، خانووى سەر ڕێ، گوندى زەلٌم 160 خانە خانووى بەردوقوڕ، دوونهۆم، لابەلا تاكو چاوگ. ڕێى دۆلٌى، چاوگ بە قەدى چياوە، كەوانەى كونەكەى 2 م، سەرى تاشێكى مەزن يەكسەرى تاكو سەرى چيا، تاقگە لە بەرزى 20 م، كونێك لە تەنيشت چاوگەكەوە، وەكو زار ئەشكەوت، خوارەوەى چاخانە... خاوەرى زنجيرە چياى ڕەنگينى هەورامانە، گوندى هانەى دن، پالاٌنى پێوەيە.

**قەڵادزێ:**

قەڵادزێ 170 کم لە سلێمانییەوە، تاکو دووکان 69 کم، لە دووکانەوە 101کم، لە سلێمانییەوە تاکو دووڕیانی دووکان – تاسڵوجە 20کم... لە دووڕیانەوە بۆ دووکان 51کم، لە دووڕیانی تاسڵوجەوە لادەدات، ڕێگەی تەخت، گردەبۆر، دوای کەڵەوانان و کارگەی چیمەنتۆی تاسڵوجە، قەرەچەتان، قازیئاوا، سوسێ، چالاخ، پردی تابین.

**ئەشکەوتی زەرزی:**

نزیکی گوندی ئەوالان، ئامێری بەردو بەردەستی دۆزراوەتەوە، مێژووی ئەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی چەرخی بەردین.

هەورازی کۆتەڵ – دووڕیانی سووورداش، ڕێگەی سووورداش خۆڵو زیخە... لە ڕێگەی سووورداشەوە، لێژیو نەوی بەلای ڕاستدا، هەورازو بەردەلانی، بەرەو هۆمەرقەوم، بە ڕێگەی تەسکدا، گوندەکە 40 خانەیە، لابەلا، ئەستێڵ شەدەڵە دیارە، بەوبەرەوە 80 خانەیە، هەوراز بەرەو گەلی دابان، گاتونیو ئەبێ بۆ گوندی هەڵەدن، هەوراز بۆ سەری دابان بۆ سەرگەڵو... دووڕیان بەلای ڕاستدا، لاپاڵ نشێو بە نزیکی ڕەزەکانی سەرگەڵودا، نشێوی، هەڵەدن دیارە، بە نزیکی ڕەزەکانیدا، پیادەڕێی، دووڕیانی یاخسەمەر، بەلای چەپدا، داروگوێز، گوندی هەڵەدن، 200 خانەیە، دۆڵی جافەتییە، خێڵی جافە ڕەشکەو تێکەڵن... دێتەوە بۆ خوردەلوك، دوای کۆتەڵو دووڕیانی سووورداش، شۆڕ ئەبێتەوە، کانیمیران، کانیخان، کانیسارد، قەشقۆڵی، هەورازی دووکان بۆ سەر بەنداوی دووکان، هەوراز و نشێو بۆ دۆڵی خەلەکان.

خەلەکان بنەی بەخشە، چاخانەکانی کانیوەتمان و شێخ نوبید، گوندەکە لە سەرەوەیە، گوندی باقلان، باداوا، زوربەی دانیشتوانی شێخن، پردی باداوا، نزیکی گوندی باداوا، دۆڵی خەلەکان تەواو ئەبێت.

پردی بێستانە، دووریانی کۆیە، پردی هیزۆپ، پردێکی کراوەیە، قەسرۆکی کۆن، لەسەر ئاوی هیزۆپ، داری قەمتەران، کانیماران، پردی کراوە، قەرمنیئاغا، گرجان، چوار قورنە، بنکەی بەخشە، رانیە.

## رانیە

شارۆچکەیە، لە دامێنی کێوەرەشە، ئاودارە، گردێکی دەستکرد، ئانکی ئاوی لەسەرە، هەموو دەشتی بیتوێنی دیارە، بە تایبەتی گۆمی دووکان و گردی بازەسیان، کەلکی شمشارە، گردی بۆسکێن، ئاشی مەلازادە، بناری کێوەرەش، کە پاشماوەی خانووە کۆنەکانی ماوە، گەرەکی قەلا و رێگەی قەلادزێ بەو دیودا 32کم.

رانیە، بەری کراوەیە، سێلای چیایە، سەیداوا، گوندی بۆسکێن، قورەگۆیە، دەربەند، پردی تووەسووران، چۆمی کارفێن و پردەکەی، پردی سەنگەسەر، پردی بەستەستێن، سەنگەسەر، پردی دۆڵەبەفر.

پاسگەی سەنگەرسەر، ئاشوران لە خوارییەوە، رێگەی گڵ، گردێک، قادراوا، جۆگەی کۆنکرێت بو تەنیشتیدا 7 کم بۆ دۆڵی شەهیدان، بەنداو و ئەستێڵ، دۆڵ. دێتەوە بۆ رێگەی قەلادزێ، پردی چۆمی ژاراوا، قەلادزێ شارۆچکەیە، مۆنانی 30 هەزار کەسە، خوێندنگەو فەرمانگەو تیمارگە و بازارو فرۆشگەی تێدایە.. لە نێوانی 2 زێی، دوژی 2 زێ.. نزیکی سنوورە، لە گربداخەوە، گردەسپیان، بەرانبەر بە دێگە، شێخ جنید، دۆڵەتووان، کانیشیلان، سالاری ، کانیبۆق، بەردەگورگ، گرتسوی، کێلی سنوور، کونەسپ، دەراوی هۆدەران، بێورانی ژوورو، بێورانی خوارو، دەشتی کەپران، نیزەرۆ، سەردەشت.

## مەرگە:

لە قایخەکەوە 22 کم، لە قەلادزێوە، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ سەر زێ، کەناری زێ، لاپالۆ هەوراز، لە کلکەی چیای ئاسۆسەوە، سەرسیان 400 خانەیە، بەسەر تەپکەوە، بەسەر زێدا فەرمانڕەوایە، پێدەشت، بە دامێنی خاوەری چیای ئاسۆسدا،

ئەملای دەشتایی، بەردەگۆز بە بنارەوە، 30 خانەیە، ئاوی بیر بەکاردەهێنن، دەشتی بەپیتو فەڕ و فراوان بەملادا و زنجیرە چیای ئاسۆس بەولادا، لە بنار دوور ئەکەوێتەوە، پێدەشتی فراوان، قەرەتەپە و دێلێژە و مەمەندداوا، بە ناوەندی گوندی دێلێژەدا، قەرەتەپە لەسەرەوە هەوراز، سێوکان 40 خانەیە، کەمێ بەرز بە ناو گۆڕستاندا، هەوراز و نشێو، گۆمی دووکان بەملادا، بنگرد لە پێشەوە گردی گۆڕو ئارامگەی پیرۆتە سووری مەرگە لە خوارەوە، داروودرەختی پێوەیە، ڕێگەی بەردەڵانی، هەوراز بەرەو بنگرد.

فەرمانگە و خوێندنگە لە خوارەوە، 6 کم بۆ مەرگە، ڕێگە لە سەرەوە بەلای کۆنە سەراکەدا، لاپاڵو لابەلا، بەناو دۆڵی گەورەقەڵادا، ئاشی شێخی چۆمو دۆڵو درەخت، پێچو هەوراز، دەراوی بێدەڵ، ڕێگە بە بەری ئەوبەردا، چۆمۆ دۆڵ، ئەملای نێوانی گەورە قەڵا، ڕیزەگردو زێنوی مەرگە، بەملادا دەستانی فەروخشا ئەگێڕێتەوە... مەرگە دیارە، چۆمو پێدەشت، درەخت لە خوارەوە، هەوراز، نێوانی بەردەقەڵشت، لاپاڵی گردەکانی ئەوبەر، بەلای گۆڕستاندا، سەرئەکەوێت، مەرگە لە بەردەمتایە، کانیاوی بەرئاوایی، حەساوگە رووخاوەکەی و ناو گوندی مەرگە 300 خانەیە، لە دۆڵێکدا، باخو درەخت دایپۆشیوە، پرد هەردوو بەری بە یەکەوە بەستووە لای کانییەکەیەوە، کانیاوی باش، سەیرانگە و جێگەی بۆ چاکراوە، لای پردەکەوە، خاوەنداری تێدایە.

کانیتوو، 12 کم، 300 خانەیە، هەوارگەیە، سازگاروخۆش، لە دۆڵێکدا، باخی زۆر، توتن، میوە، بە ئاسانی ڕێگەی بۆ ئەچێت... لە مەرگەوە، هەوراز، شیوو گۆڕ و دارودرەخت، نشێوی دۆڵ، ئاوگرد، داروگۆڕ، گوندی هەڵونی، ئۆلچکە لای چەپە، لۆتەر لە خوارەوە، ڕێگەی ئوتومبیلی هەیە، هەوراز و دەوەنو ڕەز و داروگۆڕ، لابەلا و قەدپاڵ، گوندی ئاوەژێ 50 خانەیە، کانیاوی ساردو ڕەز، هەوراز و نەوی، ڕەز و باخ، گوندی چنارنە لە دۆڵێکدا، 170 خانە، هەوراز و پێچو لابەلا و نشێوی، کانیتوو دیارە، هەوراز، کانیتوو 200 خانەیە، دۆڵی سەراو لە خوارەوە تاکو کانیخەلیل و کوڕکوڕ، خانووی هاوینی و هەوارگە لە دۆڵەوە، کاتێکە، هەوراز

بۆ کورکور، کوێستانو زۆزانو هەوارگە، ئاوی ساردو سێبەری دارگوێز، کانیتوو 12 کم، 300 خانەیە، هەوارگەیەکی خۆشە، لە دۆڵێکدا، سازگارە، باخاتی زۆرە، توتنو میوەی هەیە، بە ئاسانی ڕێگەی بۆ ئەچێت، خاوەندارێتی زەویوزاری تێدایە.

## چوارتا:

38کم لە سلێمانییەوە – بۆ ئەزمڕ 15 کم، تاکو ماوەت 75 کم، ڕێگەی قیر، هەوراز و پێچ، ئاوگردان، پێچی هەوراز، بەرەو ئەزمڕ، زیخەڵانیو قیر، لوتکەی ئەزمڕ، نشێوی ، چاخانە و گازینۆ، کانیاوی سارد و تەزی، پێچی نشێوی بەناو دەوەندا، زیخەڵانیو شینکەو کەوەلە، لابەلا و هەوراز، کەمێ تەختی، چاخانەی بازەگیر، دووڕیانی ماوەت، چاخانەی سیرەمێرگ، نشێوی بەرەوچۆم، پردی داخراوی چۆمی تەگەران، بە لاپاڵی گردی چاوەشاندا، پردی داخراوی قەڵاچوالان، گوندەکەی لە سەرووترە، هەوراز بەرەو چوارتا، داری پیر ئاڵک، شارۆچکەی چوارتا بنکەی شارباژێر دووڕیانی باسنێ.

بە ڕێی باسنێدا 24 کم تاکو باسنێ، بنکەی بەخشی سیوەیل، پێچو دارو دەوەن، گوندی گەنکی لای ڕاست، پێچو نشێوی، بۆ سەرچۆمی سیوەیل، پردی کەناروێ، کەناری ئاو، پردەکەی کراوەیە 8 پایەیە، هەوراز بە ناو دارو دەوەندا، گوندی کەناروێ لە قەدپاڵدا 3 بەشە، 80 خانەیە، هەوراز و لابەلا، چاخانەی کەناروێ، مووچەکانی، گوندی کانیشوان، هەوراز بە ناو دارو دەوەندا، پێچی کوور و هەوراز، بەندەن، دارو گوێز بەسەر گوندی مرانەدا، سێبەرو دارگوێز، 70 خانەیە، فێنك پلەی گەرمی لە هاویندا 26 پلەی سەدییە... چاخانەی مرانە، بەندەنوپاڵ، گوندی بێورێ دیارە بەوبەرەوە، پێچونشێوی، دووڕیان بۆ بێورێ شۆڕ ئەبێتەوە، چۆمو پردی پیادە، لای ڕاستی گوندی بێورێ بەرەو هەوراز، 110 خانەیە، لە خێڵی بلباسن..

لە باسنێوە بۆ سیرین، 25 کم، ڕێی باسنێ، پێچی هەوراز، ڕێی خۆڵ، گۆمڵە، چاڵاو پرۆژەی ئاو، بە ناو داروەدەوەندا، نشێوی، باسنێ بە بەرزاییەوە دیارە بە دامێنی‌چیای گمۆوە، شیو و پردی پیادە، هەوراز و پێچ بەرەو باسنێ، لابەلا و پێچ،

دووڕیانی سیرێی بابە شێخ، دووڕیانی سوورە دزێ، لای ڕاست بەرەو سیرین 80 خانەیە نشێوی، پێچی کووڕ و نەوی، هەوراز ئاوایی 50 خانە، هەوراز، بەلای ڕاستدا، دووڕیانی تیمار، هەوراز بەرەو سیرین، هەوراز و دۆڵو گرد، خانووەکانی بانوان، 4-3 خانوو مووچەن، بە سنگی گردەکانەوە، دۆڵو شیو، مووچەی گوندی باری، چووك – گچکە، بە ناو تاشەبەردو شیو و دەرەو جۆگەو دارچنار، دووڕیانی بارێچووك، تاشەبەردی دابڕاو، هەوراز و خۆڵ، دارستان، کەم ئەبێتەوە، پێچی نیشوی و هەوراز، باری گەورە، دارو سێبەری گوێز پێشی ئاوایی، باری گەورە 80خانەیە، هەوراز و نەوی، پاسکە گۆنەکەی گوندی شیوەکەڵ - شیوەکەڵ، لابەلا و هەوراز و بەندەن، دارو گۆڕستان، گوندی سیرین 110 خانەیە، بناری سوورکێوە، ئەولای، ئەڵەسوو، بۆسکان، نۆرك، سوورەبان، گۆڵێ.

باسنێ، بنکەی بەخشی سیوەیلە 75 خانەیە، 40 گوندە... سیرێ 40 خانەیە، تەکییەی ڕێبازگەی نەخشییە، حاجی نوسمان کوڕی شێخ ئەبدولقادر کوڕی بابە شێخی سیرییە... پێچو هەوراز، سنووری ئالان، سوورەدزێ، پاسکەکەی دیارە، چیای خێڵەرەش بەوبەرەوە چۆمی چۆمان، سنوورە، پێچی نەوی، گوندەکانی ئەودیوی سنوور کێوەرۆ، ئەنجینیە، ماڵتە، بەردەرەشە.

گوندی سوورەدزێ 53 خانەیە، فێرگەی تێدایە لە 1934 دەرچوونی پۆلی شەشەمی نەبووە، نشێویو پیادەڕێ، گردو دەوەنو لابەلا، سووربان لە چالاییدا، جۆگەو باریکەڕێ، شیو لە خوارەوە، لە چەمەکە ئەدەیت، هەوراز بە ناو گوندی سوورەباندا، گولاویو مەروێ 20 خانە، کاتێکە لە سوورەدزێوە، مووچەی گوندی مەروێ تاکو مەروێ کاتێکە 5 کم، بۆ شاناخسی 5ر2 کم، سێبەر و جۆگە و لابەلا، نەویو سوورکە گردە سوور ئەوبەری، چۆم لە خوارەوە، چۆمانی سنوور، مووچەکانی بەو بەرەوە، چۆمەکە لە سەیرانیەنەوە دێت، مووچەی چۆمانی بن هەوراز 3 خانەی ئەمدیو، چۆمانی ئەودیو، ولتە 2 چۆمان، ئەودیو و ئەمدیو 12 خانە بەوبەرەوە هەوراز بۆ مەروێ، لابەلا و مووچەی سەرسول بە کێوی بریتی ئەو دیو سنوورەوە، گوندی زەڵێ 12 خانەیە لەودیو، کەمێ هەوراز و دارگوێز، دارو گۆڕ، مەروێ دیارە، بانو لابەلاو گۆڕستان، دارو کەمێ هەوراز، گوند و

کانیژنان، سووره چناری گەوره، مەروێ 80 خانه، لابەلاو دارو گۆڕ، خڕ و چۆم و کەمی هەوراز و دەوەن، گرد، مووچەی شاناخسێ ماشان له نشێویدا، کەمێ هەوراز بەسەر شاناخسێدا، شۆڕ دەبێتەوه، گوندەکه 35 خانەیه، هەمووی 150 خانەیه، گرگاشه، بریتیه له ماشان، دەشتی، کانیخێڵ، گوێزله، شاناخسێ، هەوارگەی هاوینی و زستانگه، میوەی زۆر، فێرگەی تێدایه.

شارۆچکەی چوارتا، کۆنه رێگەی ماوەت بۆ سەرسیر، به لابەلا و هەورازدا، کەناروێ بەوبەرەوه، پردی سەر چۆمی سیوەیل، لابەلا بەناو دەوەندا، بۆ سەرسیر.. سەرسیری سنجەڵیو گەنکی، گردی بەرز و کەمئاو. سەرسیر و چاڵاوەکەی، هەوارگه، کانیاوی سارد، سەکۆی چیمەنتۆ، کەپر بۆ حەوانەوه... لابەلا، گۆڕەدێم بەوبەرەوه دیاره، هەوراز به ناو دەوەندا، تیرەشانو بان، هەوراز ، گوندی موبرە له خوارەوه، 100 خانەیه، بەلای راستدا، چیای سوورکێو، راکشاوه، هێڵی سنوری دەستکرد دیاریدەکات... گوندی نۆرکو سوورەبان، شیوەکەڵ گوندەکانی بنار، گوندی مامەخەلان بەدیو موبرەدا، له دۆڵەکەدا، نشێوی، لابەلا، چەمیاڵه له خوارەوه دیاره، بەلای راستدا، چاخانەی بەندەن، کورەکاژاو بەلای راستدا، گوندی هاجیمامەند و دۆڵپەموو، دیارن، زێی بەلای چەپەوه دیاره، هەوراز و لاشان، دووریانی پێنجوین، له شێخەڵمارینەوه بەلای چەپی کانیکوزەڵەدا، بەرەو گوندی زییه و دووریانی نۆرك، گوندی زییه له ناوگردا، میشولان بەوبەریەوه.

دووریانی زییه، لای راست و پێچونشێوی، دارچنار، بۆ سەر چۆمی شێخەلارین، به قەدپاڵی کێوی لەرێوه 110 خانەیه، دارو گۆڕستان و ناوئاوایی. له گوندی سیرینەوه، پێچو هەوراز و پاڵ، لابەلا، شۆڕ دەبێتەوه بۆ گوندی نەڵەسوو، 35 خانەیه، سێبەرو دارگوێز و شیو، هەورازو پێچ بەرەو بناری 5 دەره، لابەلاو هەوراز و گرد و دەوەن، به سەر گوندی بۆسکاندا، شۆڕ دەبێتەوه، 25 خانەیه، شیو و هەوراز و سێبەر، گوندی نۆرك، 50 خانەیه، شیو و لابەلا و پێچ و لێژی، لابەلا، گوندی سوورەبان، شیوو لێژی بۆ سەر چۆمی سیوەیل، هەوراز و تەختی، شیو و هەوراز، خەزێنه، به پشتی زییەدا، بەندەن، پشتی گوندی موبرە، سەرسیر، چوارتا.

**پێنجوێن:**

105کم لە سلێمانییەوە، کانیبا، داربەڕولە، خەراجیان، ئەربەت، خڕی چەناقچیان، کانیپانکە، موان، گرێزە، قوڕیچیا، سەراوی سوبحاناغا، گوندی قلرخ، سەیسایەق... لێرەوە تەختی بۆ شانەدەری، لە بناری لای راستەوە ئەویو بەردەبەل، دۆلەسمت، تووتناغاج.

دۆلو هەوراز ، پردی گراوەی کەولۆس... کەولۆس، هەوراز و پێچوو بەرزی، دۆلەسوور و چاخانەکانی 70 خانەیە، فێرگەی تێدایە، لە پردەکەوە، دار ژاڵە، لە بەهاردا، وەکو تارای سوورە، هەوراز و پێچ، کانیسپیکە ، هەوراز و پێچ وەکو کێوی ئەزمڕی سلێمانی، تەختایی ، ناڵپارێز، دارەبەن، لەو بەرەوە نزیکە بە کەناری چۆمی ناڵپارێزدا، پردی سێبواران، هەوراز و پێچ، پلەی بێمەحکەمە، پێچی وشکەشیو و دۆلی شیلاناوی، پردی کانیمانگا، گوندەکە بە قەدپاڵەوە، پێچەکانی ملەکەوە، 10 پێچە، پێچو هەوراز و نەوی و لێژی هەر پێچە، تەختی ناوشاخان دوای گوندی راوگان، پێنجوێن، پرۆژەی ئاو، گۆڕ و دار خەوابگەی پیر موحەمەد کوڕی ئیمام، پێشەوا موسا کازم، چارەکی ماوە، باخەکانی جوارباخو بلیکیان، چاڵاو، کانیاوی ساردو تەزی، هەوارگەن..

هەوراگەی جوارباخ 1 کم لە پێنجوێنەوە، رەز و باخە، 1400م بەرزە لە رووی دەریاوە، پلەی گەرمی لە هاویندا 30 پلەیە، رادەی شێ 58-73٪، 1 کم تر گوندی بلیکیانە، رازاوە و رەنگە، ئوتومبیلی بۆ ئەچێت، کانیاوی ساردو تەزیو و سازگار.

پێنجوێن، شارۆچکەیە، لە وشەی 5 وێنەوە هاتووە... 5 بنەماڵە، بارامی، قوبادی، وەستا حسین، ئەحمەد ئەلی، مخە پێکهاتووە. یاخود 5 یانە، 5 بنەماڵە، لە پێشدا، لە گەندی قەڵادێ بوون، 10 خولەکە لە پێنجوێنەوە، سەردار سوور خابی لێبووە، ئەخۆشی رشانەوەی تێکەوتووە، بەر لە ئیسلام، 5 شوانکارەکەی ماوەتەوە هاتوونەتە پێنجوێن، هەر یەکەیان لە کورنەیەکدا خانووی دروستکردووە، بە پێی گوتەی هاجی کەرەمومیس لای مامۆستا مەلا ئەبدوڵا مفتی بۆ کاکە جەلال فارسی گێڕاوەتەوە: بارامی، بەرازی، قوبادی کەلورمکەلهور، وەستا حسینی ئاسنگەر مەریوانی ، ئەحمەد ئەلی سابلاخی-مەهابادی، مخە پارەزانی، ئەزریا کوڕی زەکا هەمەدانی.

## پاشەواری نەویٚ:

زینندانی گوندی نەویٚ بناری شارەزوور، زینندانی زوحاك-زوهاك، بەردی پتەوی هەڵکەنراو، بۆشایی 9م$^{2}$ ، تاقی چوارگۆشەی تێدا هەڵکەنراوە، کلاورۆژنە لەسەرەوە، شێوەی چوارگۆشەیی، پانییەکەی نیو مەترەیە، لەبەر دەمیەوە لە خوارەوە، شوێنی گرێژەنەی دەرگا و پشکۆڵی بەردینی هەیە، لە سەر چەقی ڕێگەی نەوی، چیای سوورێن، نوسراوی لەسەر نییە، قووڵی 3م، بەشی زۆری پڕبۆتەوە بە گڵ، زستانان دانیشتوانی گوندی نەویٚ گاو ئاڵفی تیدا کۆئەکەنەوە، لە بەهاردا، پەنای ئەبەنە بەر لە تاو باوبۆران.

تاقەکانی ناوەوەی، لێواریان هەیە، لەسەر تەختی بەردەکە، خانووی کۆن لای ژووررووی زینندانەکەوە، بەسەر کەڵبە شاخاوەکەوە، پاشەواری دوژێکی مەزنە، سوێو پیپیلکەی بەردو قسڵی بۆ کراوە. شوێنی پلیکانەکانی ماوە، بە دوژی زوهاك بەناوبانگە، پاشەواری کۆنە شارێکی گەورەیە، بەرانبەر بە دوژەکە و بەروپشتی، شەقامو کۆڵانەکانی دیارە. بەرانبەر زینندانەکە شوێنی کوورەی ئاسنگەری کاوە بە گەچو چاروو دروستکراوە... ڕێچکەی پاشەواری خانووەکانی ئەلکێتەوە بە خانووەکانی گوندی نەوێوە، خانووی گەورە و شەقامو ڕاڕەو... گردێکی گچکە، لەو ناوە پێیدەڵێن گردی زوهاك، پاشەواری گۆرستانی لێنییە.

دانیشتوانی گوندی نەویٚ خۆیان ئەبەنەوە سەر زوهاکو بە بەدی لێینادوێن. لە کێلانیدا، کووپەی گەورە بەدەم گاسنەوە، دەرکەوتووە، هیچی تێدانەبووە، ئاشەکۆنی زۆری تێدا نەبینرێت، لەو چەمەدا، لە ناوەندی کۆنە شارەکەدا، کە نموونەی بەرجەستەیی ژیاریو شارستانیو پێشکەوتنی ئەو چەرخەبووە.

## قەراخ – کەراخ – زەردیاوا:

46کم، لە سلێمانییەوە، قیرتاو تاکو سەر جۆمی تانجەرۆ، بەلای کوشتارگەو حاجیاوادا، کانیماسی، دووڕیانی ئەربەت، پردی تانجەرۆ، هەوراز و تەختی، چاخانەی کانیسپیکە، هەوراز، گوندی کانیسپیکە، 16 پێچی هەوراز، تەختایی و بان و دۆڵ، 15 پێچی نشێوی، لێژی و تەختی و هەوراز و نشێو بە ناو دۆڵو گردۆلکەدا دەشتی تیمار، هەوراز و نشێو و تەختی، دووڕیانی گوندی باخان بۆ تلەزەیت، هەورازی بەرازاو، دووڕیانی ولیان، کۆنە هەنجیرەکە، هەوراز و پێچی سەخت و پێچی نشێو، کوپانو ملەی دارەکووپە، وشکەشیو، نێوانی باسکە درێژ و باسکەقووچ، لێژی، داری کۆکەرەشە، قەراخ، بنکەی بەخشە لە ناو گردۆلکەدا.

بە نزیکی دەربەند داریزەرد بۆ قۆپی 15کم و لە سلێمانییەوە 61کم، نزیکترین هەوارگەیە بۆ شاری بەغداد، لە رێگەی قیرەوە، لە کەرەخان-جەلەولاوە، 288کم، بە دۆلی دێولەدا، قەدی خاوەری چیای قەراخ، زنجیرەی سەگرمەیە، بەرزی 1850م، بەسەر ئاسۆیەکی فراواندا، فەرمانڕەوایە، تاکو چیای بەخۆ و دۆڵی سیروان و جۆمی دێولە و چیای گڵەزەردە، جەنگەڵی رەندە، ناوەکانی لە چیای قەراخەوە 900-1400م بەرزە، مێشومەگەزی نییە، سازگارە.

زنجیرەی چیای سەگرمە 12 دەربەندی تێدایە، لە باتیر-خۆراواوە بۆ خاوەر بەم جۆرەیە: دەربەند باسەرە، خاوێ، سەگرمە، جافەران، داریزەرد، وەزیارە، وشك ئەستێڵ، گۆشان، دەربەند گەور، تەکیە، پەیکۆڵی.

چیای سەگرمە، لە نێوانی سەنگاو و قەراخدایە، گوندەکانی دامێنی لای کرپچنەوە: ژاڵە، رەبات، دلربەڕوو، شیوەباز، قەلاگە، بانیمۆرد، عارفاوا، تەپەگەرووس، زەردەلیکاو، چرچەقەلا، بانیخێلان... کانیخاکی، دلکە، تەپەسوورە، هەشەزینی، ناو هەمەوەند.

**هێرۆ – پشدەر:**

20 کم لە قەڵادزێوە، پێدەشت بەلای گریداخدا، پێماڵک بەمملاو هەسار بەولادا، بەردەلانیو چۆم، هەوراز، گردمەیتەر... هەوراز، باسکەدرێژ، چۆمی ئالاونی، برنجی باشی هەیە، بناری ئەوبەری شێخ ئاودەلان، تووی زۆرە، لابەلاو چەورێژ، دۆڵی دزەو کەستانە، خرە بەردان، چۆمو دەرە ئاشیزادە، هەوراز، گوندی هەڵشۆ، چۆمە بەردەلانیو جۆگە و هەوراز بۆ سارتکو هەورەبان، گوێزو سێبەرو کانیاوی سارد و هەوارگە، ماوەی 3 چارەکە.

دێنەوە بۆ لای گردمەیتەر... لای چەپی گردەسپیان، بەلای راستدا، هەوراز و نشێو، بادەڵیان، نزیکی رێگەکە، هەورازی نەویٚ نزیکی پاچکار، دووریانی دێگە، بێشیر، هەوراز بە ناو ئاواییدا، گوندی کولارە، لە دۆڵێکدا بە پەنا گردەوە، بانو دۆڵی قووڵ، سەختی بەدوادا، ئەوبەری هەوراز، چەند پێچیٚ بۆ دۆڵێکی قووڵتر شۆر ئەبێتەوە بۆ لای گوندی بێمووش، چۆمو هەوراز، خانووەکانی گوندی بادین، جۆگە و بەردەلانیو هەوراز و نشێو، داری قەڵاشکەری، پێچی نشێو بۆ سەر چۆم، نزیکی گوندی دەروونیو خوارووی مرێدا، هەوراز و پێچو لابەلا و لاپاڵ، نسیٚمری هەورازو سەختی و دۆڵو ئاو، بەو دیویدا قووڵایی دۆڵی مرێ، هەردوو گوندی دۆڵەکە، مرێو دەروونی دیارن، ئاو باخی گوندی هێرۆ، ئاو گوند، کانیسڵوت، کانیاوی سارد، خانووە بلاوەکانی هێرو 300 خانەیە، هەوارگەیە، بەرهەمی تووتنی زۆرە، دارودرەختی گوێز، چۆمەکەی تاکو خوارەوە، نزارو رەشی، گوند لە دۆڵێکدا وەکو شوێنی بیارە هەڵکەوتووە، کۆمەڵە خانووی بلاو، داری گوێز و چنار دایپۆشیوە، سێبەر و فێنکو سازگارە، رادەی گەرمی لە هاویندا 35 پلە تێپەرنابێت، نیوکات ئەچیتە باو شێخ هۆمەر، چنارو سێبەر، ئارامگەیە، سەیرانگە و جێگەی دیدەنییە... قەدو لاپاڵ، خرە بەرد و هەوراز، دەشتی قەڵادزیٚ و دەربەند رانیە و زێی دیارن.

بە پیادەڕێدا، هەوراز، مڕیو دەروونی دەرنەکەوێ بەرەو لاپاڵو باسک، گوندی هێرۆ، بنکەی بەخشە، لە ئاوابووندایە، کەڵەکو سنوور بەجێنەهێڵی، گوندی ئاوەکی لە قووڵاییدا دەرنەکەوێت... کێوی ئاسۆس بە تەواوی لەبەردەمتایە، گوندی سێوەڵە لە باسکی سەرەوە... پیادەڕێ، قەدپاڵو هەوراز، ڕەزو نزار و بانیبەرز، دەشتی قەڵادزێ بە تەواوی دیارە، لە سنوری ئەحمەندە تێدەپەڕێت، سنووری گوندی بێناسەیە، لاپاڵو کانیکەندیلان، مووچەی بێناسە، لابەلا، ئەستێلۆکانی، هەوراز و دار و درەختو ئارامگە، بەرەو بێناسە، لە دۆڵێکدا بە قەدپاڵەوە، خانووەکانی، گوندی کەم ئاو نزاروباخ، پیادەڕێ، هەوراز و لاپاڵ، ئەوی، کانی گچکە، دارودرەختو ئارامگە، ئەوی و سەختی، باوزی دەردەکەوێت، ئەوێو لێژی و لاپاڵ، گوندی ڕەزڵە لە خوارەوەی، لابەلا بەرەو گوندی باوزێ، تەلانو نێو توتڕک، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ مووچەکانی بەردێ، بە کەناری جۆگەدا بۆ ناو گوند و خانووە بڵاوەکانی لە پەنا گردا بە سنگی چیاوە، خڕ، کەوانەیی بەسەر چۆمدا ئەڕوانێ، هاوینان، خانووەکانیان چۆڵ دەکەن ئەچنە سەر ڕەز و باخەکانیان.

هێرۆ، بێناسە، کاتێکە بۆ باوزێ 2 کاتە، 10 کم بەرەو نسێ بەناو سێبەرو داروچۆمدا، بەلای گۆڕستاندا، لاپاڵ، کێلێکی کۆن ئەبینی ناوی ئەبوبەکر و ئەلی لەسەر نووسراوە، چۆمو جۆگەی بۆ بەری نسێ، دۆڵی نسێ، کە مووچەی گوندی ئەشکەنەیە، لە باوزێوە 3 چارەکە، 3ر5 کم، بۆ ئەشکەنە نیو کاتە، 2ر5 کم بەپێ، هەوراز، گوندی ئەشکەنە 94 خانەیە، کەمئاوە، هاوین 2 خانووی تێدا ئەمێنێت، هەر هەموو ئەچنە سەر مووچەکانیان.

نیسی-نسێ، هەوارگەیە 15 خانووی هەمیشەییە، دارودرەختو سێبەری دارگوێز و هەنار و چناری فرە، فێنکو ئاودار و سازگارە، گەڕەکەکانی بڵاوە... لە ئەشکەنەوە بەلای کانیسوورکیدا، لاپاڵو هەوراز، کانی لاپاڵی بە ڕۆژ، دۆڵی قووڵ لە خوارەوە، کێوی ئاسۆس وەکو کێوی سەگرمەو دەربەندەکانی، دەرئەکەون، دارودرەختو گۆڕ، خانووەکانی بالیلان، لەسەر ئەشکەنەیە، تەنها خانوویەک لە سەرەوە، پێینەڵێن، زنجەڵە، بالیلان 16 خانەیە، لێرەوە، گوندی گەناو و

پاسگەکەی و بەری ئالانی ماوەت دیارن... لابەلا و لێژی شۆڕ ئەبێتەوە بۆ بەری ئەوبەری شیوەکە، بە باسکێدا، گەناو بە تەواوی دەرئەکەوێت 2ر5 کم، لە بالیلانەوە، پاسگەی گەناو لە پشتی گوندەکەوەیە، بەلای رمز و دار بەرووددا، نشێو و هەوراز بۆ ناو گوند 50 خانەی گردوکۆیە، شوێنگەی بەرزە، مووچەکانی نزیکە، ئاودارە، بۆ سنوور 5 کم، لە گوندی هەرزنیوە، کەلەکی وەیسی 2ر5 کم، بەری ماوەت دیارە، فێرگە و تیمارگەی تێدایە، ریزە گردۆلکەی نێوانی کێوی ئاسۆس دیارن، لە گردەسوورەکەی پشتی گوندەوە، گوندی دەوژان، رازان، سەرشیو، نزیکن.

## گەناو – قەڵادزێ:

لێژیو ئەوبو هەوراز و نشێو بە دۆڵی نێوانی زنجیرەی کێوی پشدەرو ئاسۆسدا گۆڕستانی زینوی چواردەران، بە جۆگەی ئاشیلە و دۆڵی نسێ، بەمەلادا، ئاشی چەکوانو چۆمی نسێ، لە ئەودیویدا، پێدەشت، کانیبەردی، باخو دێبەر، ناو گوندی دەشتێو 75 خانەیە، تیمارگەی تێدایە، بەرهەمی توتن، گەنم بەشی خۆیان ئەکات، بەلای گۆڕستانی گوندا، لابەلا، چۆم، خانووەکانی ئەولای دەشتێو، زینوی کورەتاوڵ، دەشتی قەڵادزێ دەرئەکەوێت، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ کانیکوەلێ، بەمبەری گوندی دەلگێدا 20 خانەیە، کانی ئەولاغا، لێژی بەرەو زێ، بە کەناریدا بە نزیکی گوندی کەوێ بە پەنا گردو شینکەوە، چۆمی بەرسوول، هەوراز، کانیو ئەستێلی کاشونە، ئاوەکەی گرانە، داری کاشونە، زێی لە خوارەوە، بە کەوانەیی دێتەوە، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ تەختایی گوندی نورەدین، ئوتومبیلی جێبی پێدا ئەڕوات، بەسەر نورەدینەدا 70 خانەیە، لە پەنا گردا، بەری دەشتە، دووڕیانی گەرمکان و رەنیخاس، پێدەشتو هەوراز و ئەوی، بەلای رەنیخاسدا، کە بەشی نورەدینە، هەورازی خاس، بە بەرزییەوە، گوندی گەرمکان، لە ناو قەدی هەورازەکەوە، گوندی خاس لەسەر زێی، بە پەنا گردی خاسەوە لەسەر زێی، دیارە، دەشتی قەڵادزێ تەواو ئەبێت، ئەگەیتە قەڵادزێ.

## ماوەت:

ماوت – ماوتە، لە دامێنی کێوی گێچینییە 50 کم لە سلێمانیەوە، قیر بە ناو گردانـدا، پـردی ئـەلیاغا 12 پێچی هـەوراز، دوای دووڕیـانی خـەمزە، سـەری ئەزمڕ-ئەزمیرە، بەلای پاسگەکەیدا، گازینۆو چاخانەی ئەزمڕ، ڕێگەی زیخەلانی، سیرمێرگو چاخانەکەی، گەنکاوا 15 خانەیـە، فێرگەی تێدایـە، کـەمێ هـەورازی دارو دەوەنداوی، چوارتا دیارە، کەناری چۆمی قەلاچوالانو سیوەیل، لێرەدا بەیەك ئەگەن، گوندی کارێزە، فێرگەی تیایە 30 خانەیە، باڵخ 90 خانەیە لە دۆڵێکدا بە پاڵی ئەوبەرەوە، لە چۆمەکە ئەپەڕیتەوە، دوای کووڕەو لێژی، نشێوی بۆ سەر چۆم، فێرگەکەی بە پاڵەوە، لە چۆمەوە لە کەناردا، بنار و هەوراز و قەدپاڵ، بان بە ناو دارو دەوەنـدا، گونـدی گـاپێڵۆن 85 خانەیـە، بـەری نسێو پـەنا گـرد، پاسگە لـە خوارەوە بە دۆڵدا، بۆ گوندی مالوومە، ڕێگەی خۆڵ بە چارەکێ 1 کم، گەرەدێ لای راست، بە ناو قەدەوە، 30 خانەیە، دۆڵ ، مالوومە، دیارە ڕێگەی بەرەدەلانی، گوندی مالوومە، 130 خانەیە، نێوانی ئاسنگەران، کەمتاوە، گونـدی چۆخماخ کاتونیوێکە بە پێ 7٫5 کم.

## مۆکەبە – ماوەت:

بە سوورەقەلاتدا، چۆمی قەلاچوالان، چۆمی سیوەیل، دووچۆمان، هەورازو سـەختی، سـەرکەل، سـوورەقەلات دیـارە، نشـێوێو دارودەوەنـی چـڕ، دووڕیـانی کونجرین، کێلا، بێتواتە، 7٫5 کم، سوورەقەلات، خێوەتە 2٫5 کم، 40 خانەیە.

## کارێزە – ماوەت:

قـەدپاڵو لابـەلا پێچونشـێوی بـە نـاو گردۆڵکـەدا بـۆ سـەر چـۆم و پـردی کونەماسی، چاخانەو و خانووەکانی 10 خانەیە، کەناری چۆم ، جرتاوا 2 خانەیـە، بەوبەرەوە، دۆڵبێشکی شێخان 2 دۆڵبێشکە، دۆڵبێشکی خاڵەباس، دۆڵبێشکی مـام خۆشی، دارو دەوەنو مەزارگە، دۆڵبێشکی ژمـارە 5، چاخانەو دارودەوەنـو مەزارگە بە دۆڵـدا... دووڕیـانی دڕی، لێـژیو هـەورازو قـەدپاڵ، فێرگەی دڕی، گوندەکە 55

خانەیە، گونـدی دڕی، بـە کـاروانو بارکێشـانو گۆڕینـەوە نـەژین... پێچـی لابـەلا، چاخانە، 9 پێچی نشێوی لـە ناڵەشکێنەوە بۆ سەر چۆمی قەشـان، پـردی قەشـان، مووچـەی بـەرسماقی قەشـان بەوبـەری چۆمەوە، چاخانە، هـەورلز بـەرەو مـاوەت، دووریانی قەشان، ماوەت.

گوندی قەشان 45 خانەیە، بەردەپان، بەرسماق، مووچەی قەشـانن، یـالآنقۆز بەوبەرەوە، لابەلا و هەورلز بەرەو ماوەت، ساختمانی کارەبا، ماوەت، بنکەی بەخشە فەرمانگەی میری تێدایە.

ماوەت، بەرەو هـەورلز، سـەرکەل، لابـەلا و لێژی، گونـدی سـپیدارە، شەشۆ 6 مووچەیە... خمانە، توولو، گورینو ئالانان، هەیناڵی، گولژان، کۆی 100 خانەیە.

بەودیوی سەرای ماوەتدا، دۆڵو هەورلز، کانیبیوەکی 12 خانەیە، دارو دەوەنو مەزارگە، نشێوی، گوندی ژاژڵە لە پاڵ گردا 85 خانەیـە، مووچـەکانی کـانیبیوەکی 12 خانەیە، کانیی 27، کاولان 5، هەنجیرەسوورە 36، کانیوەستا خدر، دۆڵەکانـە 3 خانــەن، زوربــەیان خوێنــدەوارن، بەرهــەمیان تــووتن، رەزە... دارو دەوەنــو مەزارگە و لابەلا و لاپاڵ، گونـدی خەزێنـە 9 خانەیـە، لـە شـیوی خـوارەوە، گلومـان 10 خانەیـە، لەولایـەوە چـاخانە، گونـدی ئیسـاوی لـە خـوار گڵومانـەوە، هـەنجیرە سوورە لە سەرەوە، گەرمنتینە و دووچۆمان، لە خوارەوە، گوندی ئاوکورتێ هەسەنی ئەلیاغا 70 خانەیە، بێخوان 15 خانەیە 4 کم، سەرگەڵو 35 خانەیـە، 7 کـم، لـە پاسگەی گەرمنتینەوە، سەرەولێژ بەرەو دەشتی خانی و چۆمی تەیەت 1 کم پترە.

## ماوەت:

لـە دامێنـی کێـوی گێچینەیە... خـاوەری – کێـوی بـەرکێل... خـۆراوای – کێـوی بالوسـە ... بـاکووری – سـوورگان ... باشـووری – گونـدی قەشـان و پـردو چۆمەکەی، چـۆمی زێیـە، نشـینانی بـە کشـتەوە خـەریکن، تازەڵـداریش ئەکـەن، بەرهەمی دانەوێڵە، 3 هەزار دۆنم زەوی جووتی تێـدا ئـەکرێت، سـاڵی 400 باتمـان تووتنی ئەبێ.

سەر بە شارۆچکەی چوارتایە، شارباژێر، 50 گوندە، لە گوندەکانی لای خاوەری سپیدارە، لە خۆراوایەوە گوندی قامیش، لە باکوریەوە گوندی ژاژڵە، لە باشوورەوە قەشان، گوندی ناوداری گەلاڵە و کەڵەمێری دەفەرەکەش، حاجی حەمەئاغای هەیاساغای گەلاڵەیە.

**زێوێ:**

لە سلێمانییەوە، بە شەقامی قیر و تەختاییدا دووریانی قلیاسان، سەرچنار، بەرەو تاسڵوجە و دووریانی دووکان، 20 کم ، کەڵەوانان، چەقز و قاپیکەند، بەوبەرەوە، گردەبۆر بەلای پاسگەکەیدا، بە تەنیشتی ئاواییدا، ڕێگەی قیر بەرەو گوندی یالانقۆز، بەردەلانی تاکو یالانقۆز، هەوراز و نشێو، هەوراز بە دۆڵدا بە بناری لای چەپدا، شیو لای ڕاست، گوندی زێوێ، 40 خانەیە، لە بناردا، ئاو ئاوایی، ڕێگەی بەردەلانی، سەختی، هەوراز و ڕێگەی ئوتومبیل، گازینۆ و سێبەر و دارگوێز، خەوابگەی پیر، دارودرەختو ئاوی ساردو کەپر و سەکۆ و ئەستێل و چاخانە و سێبەر، بەرووپشتی ڕەز و دارترش..

مێرگەپان، لە جەمسەری کێوی ئەزمەڕو پیرەمەگروندایە 32 کم لە سلێمانییەوە، لە ڕێگەی سووردێشەوە بۆی ئەچێت، دۆڵی فراوان، بەرزی 1200م، ئاوەکانی لە پیرەمەگروونەوە دێت، بەرزییەکەی 2650م، پلەی گەرمی 30 پلە، ڕادەی شێ 58-95٪، میوەی زۆرە.

**سلێمانی – کۆیە:**

شەقامی قیر، قلیاسان، دووریانی بەکرەجۆ، چاخانەی کەندەکەوە، گوندی تەپەڕەش، لای چەپ، دووریانی تاسڵوجە، 20 کم، بۆ دووکان 51 کم، 90 کم بۆ کەرکوک، 45 کم بۆ چەمچەماڵ، دارتووی سەروو، دارتووی خواروو، بە بناری تاسڵوجەدا لای چەپ، پێدەشتو کراوەیی، کەمێ لێژی، گردو پێدەشت، بناری پیرەمەگرون، لوتکەکەی دیارە، 2000 م پتر بەرزە، لە ڕووی دەریاوە، کەڵەوانان بەملاو گوندی چەقز و قاپیکەند و تەپەڕەش بەولادا، پاسگەی گردەبۆ، یالانقۆز

لای راستی ڕێگە، دۆڵی چەرمەگا، ئەوبەری ڕیزە کێوی تاسلوجە و هەیبەسوڵتان، گوندی قازیاوا لای چەپ، کێوی ئاگرینی کوژاوەی پیرەمەگرون لای راست، گوندی قەرەچەتان ، گردی رەشکی لە تەنیشتیەوە لە دامێنی پیرەمەگروندا، دۆڵی قووڵو تەختی سووورداش، بەخشی سوسێ لای راست، گوندی چەرمەگا و موغاغ لای چەپ، چاخانەی سوسێ، بەوبەرەوە، چاخانەی موغاغ، کانیمیران، شۆڕ ئەبێتەوە بە سەر چالاخو سابوراوادا، هاجیتانی خوارو، گوندە کۆنەکە، سابووراواو چاخانەی سەر ڕێگە، چالاخ، بە لوولە ئاو دێت بۆ ئەمبەر، چۆمو پردی تابین، هەورازی کۆتەڵ، دووڕیانی سووورداش، کۆتەڵ، سوورداش.

دووڕیانی سووورداش، لێژی بە لای راستدا، ئەویو هەوراز و بەردەڵانی بەرەو گوندی هۆمەرقەوم، گوندەکە دیارە، ڕێگەی تەسك، هۆمەرقەوم 40 خانەیە، لابەلا، ئەستێل، گوندی شەدەڵە دیارە، قەدپاڵ بەرەو شەدەڵە، 80 خانەیە، بەشێکی بەوبەرەوە، چاخانە، هەوراز، کەل دابان 7,5 کم ئەگەیتە گوندی هەڵەدن، هەوراز بۆ سەری دابان، گوندی سەرگەڵو دیارە، دووڕیان بەلای راستدا، نشێویو کووڕێ، هەڵەدن دیارە، رەزەکانی، پیادەرێ، دووڕیانی باخسەمەر، لای چەپ بۆ هەڵەدن، داروگوێز، هەڵەدن 200 خانەیە، 75٪ خێڵی جافە و 55٪ بەگزادەیە، ئەویتری تێکەڵە.

### شەدەڵە – سلێمانی:

لە قزلەرەوە، بە دۆڵدا، دارو گوێز بە نێوانی دابانو کێوی پیرەمەگروندا، دار و دەوەنو کانیاوی سارد، هەوراز و تەختی، بان، دۆڵی مێرگەپان، دارو گوێزی بەختوخە، خڕو شیوو دەرە و ئاو، تەختایی ، دارو گوێز، کانیسمایل، هەواری پیرانە، رێوی سەهۆڵ لای راستەوە دیارە، خڕ و چۆم، نزیکی دارکوێز، بەرزایی کێوەکان کەم ئەبێتەوە، دەوەنو هەوراز، فراوانیو کراوەیی، رەزو باخو چنارو بیو، ئاوی قزلەر ، کچان، گوێچۆمو هەوراز، قزلەر بە پەنا زنجیرەی دابانەوە، 50 خانەیە، فراوانیو لاپاڵ بەمبەردا تاکو نێرە 18 کم، بناری پیرکە، هەوراز و نشێویو دەوەن، قەدپاڵو شینکەو کەوملە، دۆڵی هەناران لە خوارەوە 3 هەنارانە، هەوراز و پێچ،

قاراوا 5 خانەیە، لە هەناران جیابۆتەوە، هەوراز و نشێو، دۆڵەرووت، تاکو سەرچنار، گردۆڵکەیی، کانیاو و باخ، دووڕیانی هەنارانی سەروو..

لە قزلەرەوە تاکو سەرچنار، پێی دەڵێن دۆڵەرووت، گوندی هەنارانی سەروو، لە خوارەوە دیارە، هەوراز و کووڕیو نشێوی، گوندی پیرکە 7 خانەیە، کانیاو و کراوەیی پتر، تەختی گوندی قوڵقوڵە 20 خانەیە، چالگەی هاجی حەمە خورشید 3 خانەیە، باوکوکوڕن، شیو و هەوراز و دارگوێز و گۆڕ، گوندی کانیکلاو 12 خانەیە، هەوراز، گوندی کانیگۆران دیارە 20 خانەیە، کانیاوو باخەکەی ، گوندی فایال، تووەسپی 4 خانەیە، دێکۆنی ئەلیەفەندی دیارە، کانیمیکایل، ئەحەی کاکەئەولا، کوڕو کوڕەزا، کانیپیر دیارە، گوندی کانیبەردینە 70 خانەیە، ڕێگەی خێوەتە، گوندەکە دیارە، زەرگەتە 2 خانەیە، بەرزیو نزمی، سلێمانی.

**سووورداش:**

بە بنارەوە 2 بەرەیە، ئەمدیوو ئەودیو بەسەرە خوردەلوکدا شۆڕئەبێتەوە بۆ قەشقۆڵی، گوندی تەلانی کوێخا سمایل بە قەدی چیاوە، کانیهەنجیر، لەولایەوە، جاسەنە و کانیخان، 3 لوولە ئاو، پێیدا تێدەپەڕێت، قەمچوغە و کانیسارد لای ڕاست، پاسگە کۆنەکەی قەشقۆڵی، زنی، دوزی پاشاکۆر لای چەپ، تەختایو پێچ، هەوراز، بەرەو دووکان، بەخشی دووکان، هەنوکە شارۆچکەیە، پێچی ئەوی بە ناو زنرپندۆلی دووکاندا، دارو درەخت بە هەردولادا، خانووی بلاو، کەمێ هەوراز، بە ناو فرمانگە و گازینۆو خانووی کارگەراندا، گۆمی دووکان لای ڕاست، بە تەواوی دەرئەکەوێت، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ سەر پردەکەی دووکان، پردی بەنداوە، ڕێگەی زیخەلانی و پێچوو هەوراز، بەسەر قوولایی زنێدا ئەڕوانێ، بەرزایی ئەوبەر، گوندی کەلکەسماق بەوبەرەوە، پێچی ئەوی، بەرەو دۆڵی شینکەی خەلەکان، پردی کراوە، دۆڵی خەلەکان، خانووەکانی شێخاجی، ڕێگەی گڵ چاکراو، بە ناوەندی دۆڵەکەدا، بەخشی خەلەکان، چناران، دارودەوەن، چاخانەی شێخ ئوبید و کانیوەتمان، دارودرەختو دەوەن، تەختی تاکو کانیمازو، کانیوەتمان، گوندی باقلان لای ڕاست، تەختایی، پردو ناوی باداوان، دووڕیانی خدران، تەختیو ناو دۆڵو فراوانیتر،

چاخانەی بێستانە، 15 کم، بۆ کۆیە، 31 کم بۆ رانیە و 39 کم، لە دووکانەوە، بە ناو دۆڵدا، شیو و دەرە و هەوراز، خانووی تووتنەوانەکان، بەرەو گازینۆی چناروک، ناوقەدی کێوی هەیبە سوڵتان، هەوارگەی فێنکو خۆش، سێبەر و ئاو، دارو درەختی چنار و شوێنی چاکراو، دار پەڵکو هەنار و مێو، میوەی فرە، چاڵاو و کەپرو ساباتە، گازینۆیتر... پێچی هەوراز وەکو دیوی ئەمدیوی کێوی گڵەزەردە، بە گڵەسووردا، تاکو سەری رووتەنی کێوی هەیبەسوڵتان، شۆڕ ئەبینەوە، پێچی ئەویو لێژی بەرەو دەشتی کۆیە، پرۆژەی دارستانو جەنگەڵ، گۆڕو گومەز و خرگەی هەیبە سوڵتان، تەختی و کەمێ لێژی، پرد و رووباری کۆیە، لە حەمامۆکەوە دێت، کە بناری کێوی باواجییە، شاری کۆیە.

**کۆیە:**

شارێکی مێژوویییە، نشینگەی قوجپاشابووە لە چەرخی پاشا گۆڕەدا، دوژی کەکۆن، بارەگابووە، لەسەر بەرزایی کەکۆن، رووپێوی 5 هەزار م$^2$یە، هەردوولای قوللەی بەرگری، کۆڕی فراوانو گەورە لە ناوەوە، کراوە بە تاولەی سورای لەسەردەمی میری عیراقدا، بارەگای رامیاری بووە، لە چەرخی داگیرکردنی ئینگلیزدا، کەوتۆتە پشتی پانەی فەرمانبەرانەوە، بەسەر هەموو شاری کۆیەدا ئەروانێ، گۆڕستان، لە تەنیشتەوە.

کۆیە، مەڵبەندی بزاڤی بیرو هزر و رامیاری بووە، مۆناتی 180 هەزار کەس پترە... لە شوێنەوارەکانی: مزگەوتی گەورەیە 1844ز، مەلا بەکر حەوێزی دروستیکردووە، ئەم هەڵبەستە فارسیەی لەسەر نووسراوە:

طالع بشمر مهمل این بیت و یکی فرد

تاریـخ وی اینســـت کنبـد مینــا

از همت ملا بکر این مســجد ممتاز

در سالْ هزار و دووسد و شست شد انشا

## حەمامۆك:

2 كم لە كۆیەوە، هەوارگەی خۆشو نزیك، بە ڕێگەی بەردەڵانیو هەورازدا، شیو لای چەپ، داری كەندەكۆخی، سەیرانگەو جێی دیدەنی و نیازگە، گوندی كیلەخوار، بەوبەرەوە، بەرەو چاوگە، لە بناری كێوی باواجی، كانیاوی سەرەكی، سەرگیراو تەرخانكراو بۆ ئاوی خواردنەوەی شاری كۆیە، پرۆژەی لوولەكەشی، چاڵاوەكەی 4 × 6 م، دوو كانیاویتر، بە شیوی كۆیەدا ئەڕواتە خوارێ، لای سەرووی تالاوێكیشی هەیە، باخو داری میوەی زۆر، خاوەن باخەكان دێنە ئاوی لە وەرزی خۆیدا، دیمەنی ڕەند و ڕەنگین، سێبەرو فێنكی، سەیرانگەو جای دیدەنی، چوارباخی گەورە، گەرەكە ڕێكی بۆ چاكبكرێت، گازینۆو میوانگەی لێبكرێتەوە.

پاشەواریتر، جگە لە كەكۆن، كلیسەی تۆپزاوا، لە كۆیەوە بە ڕێگەی ڤیردا تاكو نزیكی ئاشەكۆن، بەلای ڕاستیدا بۆ توپزاوا، بەرانبەری ئەرمۆتە لەوبەرەوە، 3 كم باشوری كۆیە، بەپێ بەلای جۆگەی تۆپزاوا بۆ سەر گردێ، حەوشەی كڵیسە، دار زەیتوونی تێدایە، گۆڕ لە تەنیشتیەوە، دەرگای كەوانەیی، هۆڵی گچكەو خڕ، تیرەكەی 4 م، خڕگەی دەرگای گچكە، ژوور لەسەر ژوور، سەربانی گۆمەزی ژوورەكانی گچكەیە، جێی بەرگرییە.

گوندی تۆپزاوا، لە بناری كێوی باواجییە، 40 خانەیە، 3 كم لە خۆراوای كۆیە، ئاوەكەی لە پشتی گەلی گوندەكانی هۆمەراغاوە دێت، هەوارگەی ڕەندو جوانە، گەرەكە بەنداوی بۆ بكرێت، ئاوەكەی ئاشگێڕ پترە، شیوەكەی ئاودار و چڕە.

## ڕێگەی ئەرمۆتە:

نزیكترە لە تۆپزاوا، لانەدات بەلای چەپدا، تاكو ناو ئاوایی، ڕێگەی ناخۆشو بەد، 50 خانەیە، 15 كوردی ئیسلامو ئەویتری كریستیانین، باری ئابووریان گرژە، كڵیسەكەی هی پێشی ئیسلامە، 100 ساڵ ئەبێت، نوێكراوەتەوە، لاكێشە و شێوەی گۆمەزیو خڕگەیی، 2 پایە لە ناوەندا... گوندی ئەرمۆتە، فێرگەی تێدایە، ئاوی كارێز بەكارئەهێنن.

کۆیە – کەرکوك:

85 کم، شەقامی قیر بە لای خانووی نیشتەجێدا، لای راست، دووریانی ئەرمۆتە و تۆپزاوا، کۆنە کڵیسەکەی بە گردەوە، لای راست، ڕێگەی قیر، کراوەیی، پێدەشت، گوندی داربەڕوو لای چەپ لە ناو گردانندا، پێچو لێژی و شیوی کۆیە، پردی ئاسنی داخراوی رۆباری کۆیە، هەوراز و پێچو تەختی، هەوراز و نەوی بە ناوگردۆلکەدا، دۆڵ لای راست، پەناگرد، پردی گچکە، پردێکی گچکەتر، زێی کۆیە، زێی گچکە لای چەپ بە پەنا گردا، کەمێ ڕێگەی قیر، پردی گەورەی داخراوی کۆنکرێت، لەسەر زێی، پایەی کۆنکریتی ئاسنرێژ، تەنیشتەکانی پیادەڕێیە، تەختیو پێدەشت، دەشتی قەرەناو، گوندەکە بە بنارەوە، هەوراز و پێچو پەنا گرد، ئەملای دۆڵ، لێژیو پێچ هەورازی بێدەر، کەمێ تەختی، پردی گچکە، لێژی بە سەر شیوە سووردا، کە ناوەندی ڕێگەیە، جۆمی چەر، هەوراز و پێچ، گوندی هۆمەرمەندان، خرگەو گومەز و ئارامگە لای چەپ، تەختی، هەوراز و پێچی سمایل بەگیان، تەختی بەرەو بنکەی بەخشی ڕێدار، شوان، جۆمو دارو درەخت لای راست چاخانەکانی سەر ڕێگە، خانووەکانی لە دۆڵێکدا، فێرگەی سەرەتایی و ناوەندی تێدایە، کارەبای نییە، 120 خانەیە، 30 کم بۆ کەرکوك، تەختی بەرەو حەسار لە هێڵی شەمەندەفەر ئەپەڕیتەوە ، گوندی دووبزنی، پردە روخاوەکەی، دووریانی کۆیە-هەولێر، تاکو ئێرە 72 کم، بۆ هەولێر 83 کم، بۆ کەرکوك 13 کم، بە ناو گردۆلکەدا کۆمپانیای نەوت، دەرئەکەوێت، کەرکوك.

رانیە – شەقڵاوان:

بەلای گۆڕستاندا، پێدەشتو گردی بەردین بەملادا، زنجیرە کێو بەولادا، دۆڵی فراوان، دەشتی بەپیت، سەرکەپکان، لە پێدەشتدا 80 خانەیە، لە نێوانی دوو کێودا، دۆڵی شاور، جۆمی سەرکەپکان، بەلای میرەبەگدا، ئاوی زۆرە، چاوگی نزیکە لە گوندەکەوە چاخانەی سەرڕێی، جۆگەی بەردەمی ئاوایی، بۆ کرمکە داڵی، لە بناری کلکەی ئەمرود، ئەملای دۆڵی سەرکەپکان، با ئەداتەوە بۆ لای چەپ، دۆڵی فراوانو تەختی، ئەسریلان، لای چەپ، بەرەو چۆڵیاوا، دەشتی بیتوێن، بەلای

راستدا بە دامێنی گردۆلکەدا، جۆگەی کازیوە و چاخانەکەی لە کلکەی کێوی ماکۆکەوە بەلای دۆڵی نارانـدا – سەروچاوە، 200 خانەیـە، جاوگەی فرە ئـاو، جۆگەی کاکیزیوە، جۆگەی میراوای لێهەڵگیراوە، کە بە سکتانودیان ناو ئەبرێن، چاخانەو فرۆشگە و تیمارگە و فێرگەی تێدایـە، مەڵبەنـدی خۆشـناوەتییە، لە کلکەی ئەمرودەوە چەند دۆڵێکە بەمجۆرە:

دۆڵی شاور، بالیسان، گۆران – گرد گۆران، تەختیو دۆڵی فراوان، بێتواتە لای راست بە بنارەوە، دارگۆڕو مەزار، تەختی، گونـدی شکارتە لە بناری ئەملا 25 خانەیە ، بێتواتە بە بناری سەرەوە، گونـدی ئەنگۆز نزیکی شکارتەیە، بە بناری سەرەوە، لە جۆمەوە با ئەدەتەوە بەملادا، گوندی ئەننیک بە بنارەوە...

بە پەنا گرد و تاشەبەردا، هەوراز و جۆم بەولادا... بە ناو دارو گۆڕ و مەزاردا، هەوراز ، دوو ئاوی ، بەناو خانووەکانیدا، هەوراز، با ئەدەتەوە، جۆمو دۆڵی چڕ، هەوراز، خانووەکانی بێتواتە، بە پەنا کێوەوە، شوێنی قایمە، تەنیشتو پشتی ئەشکەوتی هەیـە، 200 خانەیـە، نشێوو هەوراز بۆ هەرتەل، بەنـدەنو لابەلا، قوتکەی کێو، تەپکی شینە وەکو کڵاو دیارە، ریزەکێوی ئەولا، نزار و رەشیو جەنگەڵ دایپۆشیوە، پیادەرێی، هەورازو نشێو، بێکێل 70 خانەیـە، بە قەدی گردەوە، دۆڵ لە خوارەوە، بە ناو ئاواییو بەروباخدا، سەرەوەی بازی بەرۆژی، باریکە رێی بە قەد و لاپاڵو زیخەڵانیو شینکە و کەوەڵەدا هەوراز بۆ سەری باسکێ، داروگۆڕ و ئارامگە، بە رۆژی دیارە، تەپکە کێو گەیشتۆتە کەشکەشانی ئاسمان، نشێو و لابەلا و هەراز، باسکی، داروگۆڕ، گونـدی هەرتەل، دیارە بەرووپشتی باخە، زنجیرە کێو هەروەکو دیواری بەرز، هەڵچووە، قایم بە پشتەوەیدا، گوندەکە لە

دۆڵدا، کەوانەیی سەرەوەی لە یەکنەداتەوە، نشێوی بە ناو باخو کانیاو ودارگوێز و سێبەر و خرە بەردو چۆم بە هەورازدا، ناو گوندی هەرتەل 250 خانەیە، شوێنی قایم، خێڵی خۆشناون... ئەم خێڵە، بریتییە لە میر و سویی و میر مەحمەلیو پشتگەی دێتەوە بۆ لای بەستۆرەی هەولێر و سنووری خێڵی سوورچی.

مەزنی هەرتەل، کوێخا موهەمەدە، 3 تاقگەی تێدایە لە گەرووی سەرەوە، بەرزیان 5 م، دۆڵی چڕ و ئاودار لە بێتواتەوە 6 کم پشتەوەی ریزە کێوی قایمە. لێژی، بە ناو خانووەکاندا، باخو سێبەر و نشێو و خرە بەرد و ناونزار و دۆڵ، لابەلا جاربەجار، رێگەی ئوتومبیل بۆ زیوە، گەرووی کێوەکەی زیوە، دیارە رێگەی ئوتومبیل، باخەکانی گوندی هەرمکی، گوندەکە بە بنارەوە، دۆڵ لە خوارەوەی پشتەوەی کێوی سەخت... خانووەکانیان لە خشتی کاڵ دروستکراوە، بە دۆڵدا تەنیشتی چۆم، هاوینان وشکە، ئەپەرێتەوە، شەقامی ئوتومبیل تاکو شاری هەولێر، بە شەقلاوادا ئەروات... دارو گۆڕ، دۆڵی بالیسان ، دارو گۆڕ لاپاڵی ئەمبەر، فراوانی گوندی مەلوك بەولادا، لە کەمێ تەختاییدا بە پاڵ گردی سەرسنگی کێوی پشتەوەی، دووریانی ملوکو شیرە بەملادا کراوەیی، ریزە کێوەکان دوور نەکەونەوە، گوندی مێرگی سەری 70 خانەیە، بڵاون، لە شەقام لانەدەیت بەرەو گوندی چیوە، سوێری بەملادا، چیوە دیارە، رێگەی ئوتومبیل، ئەچێت بۆ هەردوو گوندی چیوە، سەریو ژێری لابەلا و باخەکانی چیوەی ژێری بە بنارەوە لەمبەروە گۆڕستان بەولادا، لاپاڵو بادانەوە، بەرەو خاوەر، چیوەی سەری دیارە، لابەلا، جۆگە و باخ، دێبەری خوار جۆگە، بادانەوە بەلای دێبەر و دارو گۆڕدا، چیوەی سەری 130 خانەیە، خۆشو ئاوەدانە، بەرهەمی تووتنو سپیدار و مەرمزەی هەیە، فێرگەی تێدایە، خێڵی خۆشناون، لە دۆڵێکی بەپیتدا نێوانی دووکێو، نشێویو چۆم، بەلای چیوەی ژێریدا بەرەو تەختێو دۆڵی فراوان، شێرو لای راست بە بنارەوە بە ریزی بیراوا و شێخ وەسانو بالیساندا لە دۆڵەکەدا، گوندی داراش بەولادا، شەقام، سنووری شەقلاوا، بالیسان بە پاڵ گردەوە، بە قەدی ئەوبەرەوە، ئەشکەوتی گەورە، چاخانەی سەر رێی ، هەوراز بەرەو بالیسان، لە شەقام لانەدەیت، باخوشینایی

بالیسان 170 خانەیە، سەر بە هیرانی شەقڵاوایە، بە دۆڵدا، دەشتی بالیسان، لە شەقامەوە، لالوکاوا، بیروختە، ئەشکەفتە و گوندی سارتکە بە بنارەوە، دۆڵی هەروتیان، لە خوارەوە، بە زنجیرە کێوی هەرتەلەوە، بەو ریزەوە بە زنجیرەی چیای کۆرەکی رەواندوزەوە نووساوە، کێوی ئەوبەریش، کێوی هەریرە، بە گەڵ ئەلیبەگەوە نووسراوە، هەر گوندە و لە ستووریی خۆیدا رێی ئوتومبیلی بۆ راکێشراوە، دەشتی زینەی هەوار، لای بناری زینەتیرە 18 پێچی هەوراز لە کێوی زینەتیر، 6 پێچی لێژی، دۆڵیتر لە نێوانی کێوی هەریرو ئەولادا، کراوەیو فراوانی پێدەشتی شێخ مەمودیان، شەقامی قیر، لەملای گوندی سیساوا و خواری شاوەیس، بەرەو دەربەند شەقڵاوا، مامەرەوتکە، میر رۆستەم، پێچی هەورازی میراوا، 8 کم ئەمێنێ بۆ شەقڵاوای شارۆچکە و مزگەوتە کۆنەکەی کە چەرخی ئیسلامی دروستکراوە، میرانی مەحموبەگو بووکنەبەر، نوێیانکردۆتەوە تاکو هەنوکە 2 جاریتر نوێکراوەتەوە، دوا جار لە 1971دا ئەم هەڵبەستەی لەسەر نووسراوە:

| | |
|---|---|
| سەحابی بوو بانی اول | اخر گشت بوک عنبر |
| بس است اورا کە با ابن عمر | گردیدهم قیمت بهرجا مسجد افشا نمود |
| خاسە این مسجد کە میمون است | جون عرش جگە و نوش پر زینت |
| خودش بلمیر در خیرات و در سنت | میکوشند مینوشد از ان تاریخش |

## شەقڵاوا - هیران:

24 کم شەقامی قیر، لاپاڵ، بناری کێوی سەفین، بەرەبەرە، دوور ئەکەوێتەوە، نشێوی بۆ تەختی دۆڵ، کلکەی کێو، گوندی سپیکلە، 40 خانەیە، رێگەی خۆڵ، گوندی چنێران، 30 خانەیە، بڵاو بە پەنا گردا، لاپاڵی ئەوبەر، پرد، هەوراز بەرەو بناری سەفین، باسکی مەزلرگە، نشێوی، گوندی ئاقوبان بە چەپدا، خانووی میری، پێچی لێژ، ئاقوبان بە پەنا گردا، باسکی ئایشێ، ناوەندی رێی، نشێوو هەوراز و پێچ ، دۆڵی نێوانی سەفینو زینەتیر، گوندی پونگینە بەولادا، 40 خانەیە، پێچی هەورازو نشێو، پەنا گردۆلکە، دارو دەوەن، لە سەفین دوور

ئەکەوێتەوە، گردی جاسوس، پێچو هەورازو نشێو، لاپاڵی ئەملا، گوندی گەرومتە 50 خانەیە، بە ناو ئاواییدا مەزارگە، لابەلا و بەرزی بناری سەفین، خانووی دۆڵو باخەکانی، هەوراز، سوولاک، خانووی ناو باخەکانی نشێو، گوندی بێلنگە بەسەر گردەوە، هەوراز، گۆڕستان بەخشی هیران.

هیران، بنکەی بەخشی خۆشناو، هەوارگەیە، فەرمانگەو فێرگەو فرۆشگەی و ئاوەدانو فرەئاوە، ئاوی زۆر لە مزگەوتەکەی دێتە دەرێ 2 چاڵاوە... گوندەکە، لە بناری کێوە، ئەشکەوت بەوبەریەوە، پەرستگەی بەری کاکی هیرانە، رێبازگەی قادرین، لە شێخ تەهای بتلیسەوە، ئەو رێبازگەیان وەرگرتووە، دەفەرێکی ئاینییە.

## نازەنین – کۆیە:

لە هیرانەوە، هەورازی قەدی کێوی سەفین، خەوابگەی کاک لە ئەشکەفتی گۆڕی سلێمانو ئارامگەی شێخ ئەبدوڵاو شێخ مستەفاو بەرەی کاکی هیرانە، باسکێ دووڕیانی سماقوڵی، لابەلا و نشێو بە پیادەرێدا، گەڵ سماقووڵی ، لە کێوی ئەوبەر گەڵ چاکی شێخ موحەمەدە، لەوێوە، کونە فلوسە و ئەچێتەوە بۆ چیومو دۆڵی بالیسان ، گەڵ ئاوی شوور، پیادەرێ، هەوراز، کانیفەقێ برایم، لابەلا، گوندی کاموسەک، بە بناری ئەوبەرەوە، لە هیزۆپەوە، رێی ئوتومبیلی بۆ دێ بە سکتاندا، لە دووڕیانەوە ئەچێ بۆ هیرانو نازەنین، هیزۆپ، سکتان، کاموسەک، دووڕیانی هیران، نازەنین... گەڵ ئەسکەندەر، سنووری کۆیە، نشێو، باخەکانی نازەنین، گەڵ سەروکانی، بەناو رەز و باخدا بۆ ناو گوند، گۆڕستان، لابەلا، باخی سێوو هەنارو هەنجیرو سپیدار، نازەنین 75 خانەیە، مزگەوت، چاخانەی تێدایە، سوورەچناری بەر مزگەوت، هەوارگەی کۆیە، کانیاوی بڵاو، فرەمیوە، فێرگەو پاسگە، ساختمانی میری نییە، تیمارگەی تێدا نییە، بە بناری سەفینی رەشدا، لابەلا، گۆڕستان، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ ناو دۆڵی نزیکی بنار، سناوا، لە خوارەوە، وێرانەیە، خانووی نوێ لە سەرەوە کراوە، لێرەوە ئاوەگرد بەسەر چیاوە، دوژمکەی دیارە، پاشەواری پاشای کۆرە و بەر لەو وسمان پاشا بووە، شوێنی بەرگرییە.

به ناو باخه‌كانی سناوادا، مه‌زارگه‌، گوندی سناوای ئاوه‌دان، بانوو، گوندی جه‌لی دیاره‌، گۆمی دووكانو كێوی قه‌ندیل دیارن، لێزێو باسكو لابه‌لا، كه‌ده‌ملر به‌ ناردا، جه‌لی له‌ بناری ره‌ش، گه‌ره‌كی پێشه‌وه‌ی ناو گوند 45 خانه‌یه‌، باخه‌كانی تاكو سه‌رچۆمه‌، خاوه‌ندارێتی زه‌وییه‌كانن، به‌رهه‌می تووتن، دانه‌وێڵه‌ی هه‌یه‌، چۆمه‌كه‌ی ئه‌چێته‌وه‌ بۆ هیزۆبو قه‌سرۆك، ئه‌رژێته‌ گۆمی دووكانه‌وه‌، كێوی پشتی چنارۆكه‌، پێوه‌ی نووساوه‌، 15 كم بۆ كۆیه‌، به‌ری گراومیه‌، گۆمی دووكانو كێوی قه‌ندیل دیارن، شۆڕ ئه‌بێته‌وه‌ بۆ سه‌ر رێی هیران، سه‌ره‌وخوار بۆ سه‌ر جۆگه‌ و چۆمی سماقوولی، بۆنی گۆگردی لێدێت، گه‌راوه‌، چۆمه‌كه‌ ئه‌چێته‌وه‌ بۆ هیزۆپ، له‌ ته‌ك وشكه‌ چۆمی نازه‌نیندا، دارو دره‌ختوو سه‌یرانگه‌، گه‌رماوی جه‌لی، گۆگردی زۆره‌، به‌ به‌ری ئه‌مبه‌ره‌وه‌، ره‌نگه‌ رێژه‌ی گۆگردی زۆر بێت ئه‌و گه‌رمكه‌. با ئه‌دلته‌وه‌، هه‌وراز به‌ره‌و دۆڵی ئه‌سحابان، لاپاڵو هه‌ورازو نشێو، دامێنی پێوار و پێده‌شت، رێگه‌ی ئوتومبیل بۆ گه‌راوی جه‌لی، له‌ چنارۆكه‌وه‌ دێت، زنجیره‌ی هه‌یبه‌سولتانه‌، سه‌ری چنارۆكو رێگه‌كه‌ی دیاره‌، پێوار و نشێوێو چۆمی گه‌راو، هه‌ورازو ته‌ختی، مه‌یدانی قه‌رسان، رێی ئوتومبیل، با ئه‌داته‌وه‌ به‌لای مه‌زارگه‌ و كه‌مێ هه‌ورازدا به‌ره‌و دۆڵی ئه‌سحابان، نێوانی كه‌نه‌چووكو هه‌یبه‌سولتان، دارو مه‌زار و گۆڕی ئه‌سحابان به‌ ریز ئارامگه‌و كێلی بڵند و به‌رز، گۆڕی سواراغای حه‌مه‌داغا و هه‌ندێك گۆڕی نوێ، بیر به‌وبه‌ره‌وه‌، دۆڵی سه‌حابان، نێوانی سه‌فینو هه‌یبه‌سولتان، كه‌مێ هه‌وراز و ئارامگه‌، له‌ كۆته‌ڵ ئه‌چێت، سماقوولی دیاره‌، له‌ دۆڵدا، له‌ ئاكاری ئاوه‌گرد، ئه‌مدیو و ئه‌ودیوه‌ له‌ ته‌ك جه‌لیدا، رێی ئوتومبیل لێره‌وه‌ بۆ هه‌ولێر، له‌ دووریانی بێستانه‌وه‌ گه‌لییه‌كه‌ له‌ جه‌لییه‌وه‌ نزیكه‌.

ئاوی سماقوولی، له‌ گه‌لییه‌وه‌ دێت بۆ گه‌راوی جه‌لیو پردی هیزۆپ، به‌لای مه‌زارگه‌دا بۆ ناو گوند 25 خانه‌یه‌ به‌ سماقوولی گه‌لی ناو ئه‌به‌رێ، ئه‌وبه‌ری كرۆزمیه‌، ساختمانی فێرگه‌كه‌ی دیاره‌.

دووباره‌ دێته‌وه‌ بۆ رێی كۆیه‌، هه‌ورازو ده‌ره‌ بۆ چاخانه‌ی تووه‌ ره‌ش، نزیكی میرسه‌ید، 6 خانه‌یه‌، چنارۆكی بڵباسان، چنارۆكی مه‌لایان، له‌یه‌كه‌وه‌ نزیكن، كانیبی، سه‌ری هه‌یبه‌سولتان، شۆڕئه‌بێته‌وه‌ بۆ كۆیه‌، له‌وێوه‌ دیاره‌، گۆڕستانو چالاو، ئه‌ستێل به‌ره‌و شاری كۆیه‌ له‌ رێی خواره‌وه‌.

**چەمچەماڵ – سەنگاو – 60 کم:**

شەقامی قیر، تەختی، خانووی نوێ نزیکی شەقام، بەرزیو نزمیو جۆگە، گوندی گوشقوت لای چەپ، بانو ناوچەی گردۆلکەیی، بانەکە فەرمانڕەوایە بەسەر دەڤەرەکەدا، بەرزیو نزمیو پێچ، چۆمی پردی شیوەسوور، 10 کم، رۆخانە، هەوراز، شەقامەکەی پەرژینی بۆ کراوە، شیوو پرد و هەوراز، گوندی قەرەتامور 15 کم، 35 خانەیە، خوێندنگەی تێدایە، تەختیو گردۆلکەیو پێچ، چۆمو پردو هەوراز و تەختی، گوندی قەڵاچوخ 57 خانەیە، فێرگەی تێدایە، لەمبەرو ئەوبەری شیوێك، پردو 3 شیوو جۆگە و کونە ئاو، گوندی مەلاحسێن، 12 خانەیە، گوندی دووردەر بەوبەر ئاوەکەوە، 20 خانەیە، پردی چۆمی باسەرە 30کم، چاخانەی باسەرە، دووریانی هەشەزینی بۆ ناو گوندەکە 5 کم، 90 خانەیە، خوێندنگەی هەیە، دەربەند باسەرە، 5 کم، کە گوندی دێلێژەی قەراخی لێنزیکە، 7 کم ئەبێ، تەپەسوورە 5ر1 کم، 25 خانەیە، گوندنشینانی بە کشتەوە خەریکن، جوتیارو چێنەرن.

دێتەوە بۆ سەر ڕێی گۆکتەپە، گوندی فەقێحاجی، شیوو تەختی، کەڵەسووران لای چەپ، کەڵەرەش، گردۆلکەیی لای چەپو پێدەشت لای ڕاست، نێوانی کێوی ئاجداخ، کێوەڕووت، کێوی سەگرمە، بەرزیو نزمیو لادانەوە، شیوو قەڵبەزەی تافتاف، پێچو شیوو هەوراز، فەرمانڕەوای ڕێگەیە، بەسەر ناوچەکەدا، گۆکتەپەی سەنگاو، گۆکتەپە، تەپە شین، وشەیەکی تورکییە، بنکەی بەخشە، 300 خانەیە، ریزە فرۆشگەو شەقام بەخواری، یەکدووکانیاو، بان بەرێی گڵدا، بەرەو بنار، قەڵا گۆکتەپە لای ڕاست، بەرەو بنار بە مێرگە گەورەدا، ڕێی گوندی کچان، بەرەو بنار، گوندی کرپچنە 70 خانەیە، بە بناری کێوی سەگرمەوە دیارە، نزیکی دەربەند سپیە، ئارامگەو خەوابگەی شێخانی کرپچنەیە، شێخ کەریم کەسنەزان، شێخ قادر، شێخ حسین، و شێخ حسین شێخ ئەبدولکەریم، لە ساختمانی گۆندا، گۆڕستان لە خوارەوە، ڕێی کچان، بانی کەملێژ و تەختی، کچان دیارە، پێدەشت ، شیوەڵ، کچان، گوندەکە بە هەردوو بەری شیوەکەوە ، داروددرەختی زۆر، ساختمانی فێرگە لەولاوە 85 خانەیە، ئاجداخ، رووتەکێو، بەرانبەری، ئارامگەی پێشەوا زمینەلعابدین بۆ پێنج ئەموست 5 کم، چۆمی کچان بانی ئەوبەر، چۆم، ڕێی تیمار، گوندەکە دیارە، 5ر1 کم، پێدەشت، زۆنگو شیوو مێرگ، ڕێی ژاڵە، 35 خانەیە،

پێدەشت، گوندی رەبات بە بنارەوە، ڕێی گەرەچیای خالد، 7 خانەیە لەسەر رەباتە، جۆمی دووبر، ڕێی هەزارکانی، بنار، گەرەچیای خالد، رەباتی لای چەپ، گوندی رەبات بە بناری سەگرمەوە، 50 خانەیە، گۆڕستانو ئارامگە بە سەر گردەوە، لای خاوەرەوە، گۆڕی مەحموگێلە، کێلی لە بەردو گەچ بۆ کراوە 5 م، مزگەوتو ئاوی هەیە، لێژی بۆ هەزارکانیانی فایەق نوبید، زینانە لە بناری ئاجداغ، پێدەشتو مێرگو زۆنگ، قەڵاگە، بە بناری سەگرمەوە لای راست، گوندی بانیمورد لەولاوە، کێلەبەرزە بەوبەریەوە، لە خوار قەڵاگەوە، بەلای خاوەردا، کانیبەکتەش، بەو گوندی هەزارکانیانەوە.

## سلێمانی – کەرکوك – 110 کم:

شەقامی قیر، دووڕیانی سەرچنار، بۆ کەرکوك 107 کم بۆ سەرچنار 2 کم، دووڕیانی قلیاسان-تاسڵوجە 20 کم بۆ کەرکوك، 90 کم، دارتووی سەروو خوواروو بە بناری چەپی تاسڵوجەوە، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ هەردوو ئالایی، بیبیجەك، سەروو خواروو، کەلاشکەران، بەملاداو کۆیك بەولادا، دەشتی بازیان، تەیناڵ، بنکەی بەخشە، چاخانەی گۆپاڵە، 70 کم ئەمێنێ، دەربەند بازیان و پرۆژەی جەنگەڵو باخی ئاژەڵ، باسگەی نوێو چاخانەی دەربەند، دوای دەربەند، 20 کم بۆ ئاغجەلەر- ئاغاجلەر، دارستان، دارەکان، داران، هەوراز و پێچونەوی، قیر و تەختی، زنجیرەی کێوی دەربەند لای راست، شێخ وەیسو قشلاخ لای چەپ، زیخو گڵو تەختی، بەرزی، گوندی تەومەکەلی گەورە، 100 خانەیە، قەڵاکۆنەکەی، بە ناو ئاوایی تەومکەلدا، تەومکەلی گچکە لەولایەوە، فێرگەو خانووی ئاوەدانی بەلای تەومکەلی گچکەدا، هەوراز، ئاغجەلەر، پێچو نەوێو بادانەوە، گوندی ئاغجەلەر، داڵاوای کوردان، گوکتەپەی سەر زێی.

دەربەندی بازیان، کەرکوك، 60 کم، چەمچەماڵ، 45 کم ئەمێنێ، دووڕیانی سەنگاو 58 کم بۆ گوکتەپەی سەنگاو، هەوراز 40 کم.

**چەمچەماڵ:**

لە ئەنجامی هەڵکەندندا، لە بەردەبەلەکە – بەلە ـ بەلەك – بلکە، 3 کم باکووری خاوەری چەمچەماڵ، شیوەسوور نزیکی رێی کەرکوک-سلێمانی، لەسەر گردێکی کراوە، چینەکانی گەچین، لەسەر قەدپاڵەکانی، پاچەدەستی و ئامێری بەردەنەستێ دۆزراوەتەوە، پاشەواری زیندەوەری کۆنو نەماو، دۆزراوەتەوە، وەکو فیلی هیندی، ئەسپی ئاوی، پارچەئێسکی زیندەوەری کێوی وەکو کەر، گا، بزن، مەڕ، ئاسك.

**چەرمۆ:**

پاشەواری مێژوویی یەکەم نیشتەجێی کشت نزیکی چاوگی داقوقە.

چەرمگ – سپی – The white، نزیکی چەمچەماڵ، بە قەڵای رۆمی ناسراوە، قەڵا چەرمۆ، خانووی قوڕو بەرد، حەسیر و پووش بەکار هاتووە، دەنکە گەنم بۆتەوە بە خەڵوزی بەرد، تێیدا دۆزراوەتەوە.

**کەریم شاهر:**

10 کم باکووری خاوەری چەمچەماڵە، پاشەواری چەرخی بەردینی ناوەندی تێدا دۆزراوەتەوە.

چەمچەماڵ – کەرکوك، 45 کم، هەوراز، قەرەهەنجیر، رەشە هەنجیر، 25 کم ئەمێنی، هەوارگەی کەرکوکە، 20 کم بۆ کەرکوك، شاری کەرکوك.

**دەربەند بازیان – ئاغجەلەر – 17 کم:**

رێی کۆن، لابەلا، گوندی کانیشێتان، لای راستەوە، هەوراز و جەنگەڵ وەکو کۆتەڵی سورداش، نشێویو تەختی، دۆڵ، گوندی خەربەندەلو، لای چەپ 25خانەیە لابەلا، دۆڵی نێوانی زنجیرەی دەربەنـدو گردۆڵکە، پێچی هەوراز، لابەلا بە ناو دەوەنـدا، گونـدی چـنارتوو 20 خانەیـە، ئـازادی فـەقێ سـمایل 40 خانـەیە، 2 گوندن بەرانبەر بەیەکتر، چاڵاوی بۆکراوە، بۆ ئاوی خواردنـەوە، پردو شیوو دەرە، گوندی موتلیجە لای چەپ، گەرگەر لای راست، 20 خانەیە، بلوکین، 40 خانەیە لای راسـت، جـۆمو بێشـەڵانی دەمێنـی موتلیجـە کـەمێ هـەوراز و نـەوی – پـردە ئاغجەلەر.

ئاغجەلەر، بنکەی بەخشە، 250- خانەیە، 64 گونـدە، فێرگەی سەرەتایی، خوێندنگـەی ناوەنـدی تێدایـە، هـەردوولای بەرزییـە، لەسـەر جـۆمی موتلیجەیـە، پردێکی گچکە، هەردوو بەری بەیەکەوە بەستووە.

**ئاغجەلەر – عەسکەر:**

10 کم، پەناگرد و مێرگوزۆنگ، هەورازو نشێو، دووریانی گۆکتەپە، گونـدی مایلە لای چەپ، پێدەشتو هەوراز و بەردەڵانی، مێرگو هەوراز و نشێو بـە ناوەنـدی هـەردوو گونـدی سۆتکەدا – سۆتکەی شـێخ قـادر و گـردە شیری، هـەوراز و نـەوی، گوندی عەسکەر دیارە، بادانەوە، عەسکەر 95 خانەیە لە پەنا قەڵادا، جۆمی رێـزان 5 کـم، بـۆ دووکـان 6 کـم نـەبێ، مزگـەوتی باشـو فێرگـەی تێدایـە، گـردێ بەرانبەریەتی.

عەسکەر – گۆکتەپە، تەپە شین بەسـەر تەپـەوە، سەر زێی گچکە 12 کم ، جـۆمو هـەوراز ، گۆڕسـتان، چـەند گۆڕێکی پایەی بـۆ کـراوە، دۆڵو شـیوو کـەنار و پێدەشـتو مێـرگ، گونـدی هەیـدەر بـەگ، دیـارە، 60 خانەیـە، جۆگـە، دووریـانی حەیدەر بەگ، بان کۆزەبۆرە لای چەپ، 35 خانەیە، داڵاوارووتە لای چـەپ، کێلگـە، گۆکتەپە، دیارە، شیوی گردیمیل، ئاوەکەی هی هەیدەربەگـە، هـەوراز، گۆڕسـتان لای چەپ، گۆکتەپەی سەرزێی، دەشـتی کۆیـە لـەو بـەرەوە، گونـدی خەرابـەی ئـەزیزاغا 10 کم.

## کەرکوك – هەولێر – ئەربل:

93 کم، لە رەحیماوەوە، کەلبە و تاشە بەردەکان، پێدەشت بە رێی ڤیردا، دووڕیانی کۆیە، تەقتەق، تاکو ئێرە 12 کم، بۆ تەقتەق 50 کم بۆ کۆیە 70 کم، بۆ پردی ئاڵتونکۆپری 28 کم، دارامان و پاسکەکەی، 16 کم بۆ پردێ کە بنەی بەخشە، باخوباخات لە باتیر، خواراوایەوە گۆڕستان لە باشوورەوە، پرد نێوانی هەردووبەری پردێ، پردێك لە باکوورییەوە، خانووەکانی بەردوگەچە، گۆڕستان لە باکوورەوە، کۆڕو ویستگەی شەمەندەفەر، هێڵی ئاسن، چەند خانوویەك، رێی ڤیر بە تەنیشت هێڵی ئاسندا، پێدەشت، لە کەرکوکەوە بۆ پردێ 43 کم، پردێ بۆ هەولێر 50 کم، بۆ دووبز 13 کم.

پردێ، شێراوا، شێخان، دۆڵەبەکرە، هەمزەکۆر، رەسوڵ بسکوڵ، قوشتەپە، کۆراوا، هەولێر... لە شێراوای دزەییو شێخانو گازینۆ، ویستگەی هەمزەکۆر یەك کم، لە رێگەکەوە، پردی گچکە، بنەی بەخشی قوشتەپە، 20 کم بۆ هەولێر، پێشی شار، دارودرەخت بە هەردوو لای رێگەکەدا، کۆر دوای کۆر، ناوشاری هەولێر و شەقامی سەرەکی، کۆروپردی ناوەندی بازاڕن نزیکی باخی شار.

هەولێر، بنکەی ئوستانە، هەوارگەکانی لە نێوان کێوی برادۆست لە خۆراواوە، زێی باکوور لە خاوەرەوە، لە زۆزانو هەوارگەکانی ئوستانی بەهدینان، دەۆك کەمترنین، لە بوونی سروشتیدا لوتکەکانی بەفری سپی هەڵئەگرن بۆ وەرزی هاوین، سەرشانەکانی جەنگەڵو دارستانو لێرەوار و سەوزاییە، لە بەهاردا، دەشتەکانی کێلگەی پایزن، قەدپاڵو پاسکەکانی هەوارگەی فێنکی هاوینین.

## هەولێر – شەقڵاوا – 49 کم:

پۆستی مەلا هۆمەر، جەنگەڵی خانزاد، پردی بەستۆرەی سەهرانگە، گوندی هەناران قەڵاو دوژی پاشاکۆرە، لە گوندی بانەمان، چاخانەی بانەمان، 14 پێچی هەوراز، بەرەو پیرمام، سەربەن، سەلاحەدین.

پیرمام، لە بانێکی فراواندا، بەسەردەشتی هەولێردا ئەڕوانێ، ئەولای کێوی سەفینەو پێیدا ئەڕوانێ، بەرزی 1090م، پلەی گەرما لە هاویندا 38 پلەیە، رادەی

شێ 55-60٪، بە لوولەو ترومپاو ماتۆڕ، ئاوی لە چاوگی خوارووی سەفینەوە بۆ دێت، بۆ هەوارگەی سەری رەش چارەکێکە، گازینۆی گەورە بەسەر تەختی چیاوە، هەردوولای دۆڵی قووڵ، گوندی گراو، لە دۆڵی لای راست.

ناو دۆڵی هەردوولا رەز داپۆشیوە، پلەی گەرما 25 پلە، وەکو گەشتی بە ئاسمانەوەیە.

پیرمام – سەلاحەدین - سەربەن، 30 کم لە هەولێرەوە، 6 پێچی لێژی دۆڵو پردی گراوەی گچکە، نزیکی گوندی کۆڕی لە خوارەوە، گوندی ئارماوا، گوندێکی خۆشە، کارەبای تێدایە، 60 کم بۆ گەلی ئەلیبەگ، چاخانەکانی سەرڕێ، باخی زۆر، گردچاڵو حوجران، دەربەندکۆری، 10 کم بۆ شەقڵاوا، دۆڵو لابەلاو کەمێ هەوراز و دۆڵ، گوندی کاوانی وێران، 2 کم بۆ شەقڵاوا، 50 کم بۆ گەلی، شارۆچکەی شەقڵاوا لە پەنا کێوی سەفینی رەشدا.

شەقڵاوا، لە دامێنی باکووری کێوی سەفینە، لە دۆڵێکی تەسکدا گژوگیا داپۆشیوە، بەرزی 850-900 م، پلەی گەرما، 30 پلەیە، رادەی شێ 65٪، وشکی 74-94٪، بەهەشتی رووی زەمینە، ئاوی ساردوتەزی، کەشوباو ئاوی سازگار، باخی زۆر، لە هەولێرەوە 49 کم.

## شەقڵاوا – گەلی ئەلیبەگ 64 کم:

شەقامی سێبەر، شۆڕئەبێتەوە لاپاڵو چۆمو شیو، پردی گراوی گچکە، لەسەر شیوەکە، پردی دەربەند شەقڵاوا، بەرزیو پێچو هەورازی میراوا، پشتی شەقڵاوای رەشو دەربەندەکەی دیارە، پێچی نەوی، 40 کم بۆ گەلی، 18 کم بۆ هەریر، پێچەکانی مامەزەرتکە، بە نزیکی گوندەکەدا، پێدەشت، سەرتابێران، شیناوا، نزیکی بناری کێوی هەریر، سیساوای ئەوەرحمان بەگ، لای چەپ، 30 کم بۆ گەلی، 8 کم بۆ هەریر، رێی نوێ بە ناوەندی دەشتی هەریردا، دوور لە بنەی بەخش، گوندی موترانو قاسمییە لە بنار، 2 باشوورەو گوندی سەرسوورە، چاخانەی شێخ ئەسعەد لە سەر رێی ، دێتەوە بۆ پێچەکانی سپیلکە سەری سپیلکو گۆڕی خدراغای سوورچی باوکی حسین ئاغا و هۆمەرئاغای سوورچیتوورپانی دیانە – خەلیفان.

لە چاخانەی شێخ ئەسعەدەوە، دووڕیانی زەنتەیە، دێتەوە بەرزیو لاپاڵ، هەریر، بادیان بە بناردا، گەلی سویران، خەروتان لای چەپ، گەلی خانزاد و پەیکەرەکەی بەخشی هەریر، نزیکی گەلی باتاس، باتاس، 20 کم بۆ گەلی، 105 کم بۆ هاجی ئۆمەران، بە بناردا، هەنارەی وێران، پێچەکانی گولەکو گوندەکەی، پێچی سپیلك وەکو پەرامە، سپیلك، 10 کم بۆ گەلی، 95 کم بۆ هاجی ئۆمەران، گۆڕی خدراغای سوورچی، پێچی ئەوی، بە ناو گردۆلکەدا، کانیکەڵەکین نزیکی گوندی حسێن ئاغای سەرچیا، سەرۆکی خێڵی سوورچی، دوژی بایزی ، پێچی ئەوی، گوندی جۆلەمێرگ لە بناری گۆرەك، کە سەری گەلییە، لێژی بۆ خەلیفان 23 کم بۆ جندیان، 85 کم بۆ هاجی ئۆمەران، دووڕیانی بارزان، زارگەلی، ناوگەلی، گەلی ئەلیبەگی ترسناك، خاوەنی دیمەنی رەندو دلڤڕێن، 50 کم لە شەقلاواوە، بەرزی 800 م پلەی گەرمی لە هاویندا 38 پلە، درێژی 4 کم، تاڤگەی زۆری تێدایە، گەورەکەیان بێخاڵە، پردو 5 چاخانەو سەیرانگەی بڵاو، سوورەبەرد، سەوز هەڵگەراون، نزیکی تاڤگەکە، گازینۆی قەشەنگ بە ناوی ئەلیبەگ داسنی، ئێزیدی، تەرمەکەی بەوێدا هەڵواسراوە دوای کوشتنی لە لایەن پاشاکۆرەوە، پردو چاخانەو پێچی سامناك، تاڤگەی گەلی 10 م بەرز، گازینۆکانی، بە ژێر بەردا، ئاو دێتە خوارەوە، پردی داخراو، لاپاڵی ئەوبەر، ئاوی بێخاڵ دێتەوە بۆ ئێرە، پرد، 75 کم بۆ هاجی هۆمەران، 13 کم بۆ جندیان، لاپاڵی ئەمبەر و دۆڵی قووڵ لە خوارەوە، دیواری بەردی کێوی هەڵچوو لە هەردوولاوە، زارگەلی ئەودیو، باپشتیان، دووڕیانی مێرگەسوور.

**باپشتیان – مێرگەسوور – 40 کم:**

لە دووڕیانەوە بە شەقامی قیردا شۆڕەبێتەوە، پردی رۆباری باڵەکیان، هەوراز.. باڵەکیان لەسەر چۆمەکە، لە پەنا گردا، گۆڕستانی پشتی گوند، کەناری چۆم، بە لاپاڵدا، مەجیداوا، پێدەشتو مێرگ، شاراوا، بە باخەکانی هاودیاندا، بۆ گوندی هاودیان، یەکدوو گوندی کوردی مەسیحی نزیك، هەوارگەی خۆش، چارەکێکە لە باپشتیانەوە، بە نێوانی شیرو کێوو هەوراز و داروگۆڕ، گوندی مازنە،

پردی داخراوی مازنە لەسەر ناوی مازنە، هەوراز بەلای پاسگەی مازنەدا، سەرەدەرە لە خوارەوە، پێچی نەوی، بان، تەختی، پێچ بۆ لەیلوک، رێگەی خۆڵو زیخ، 20 کم بۆ مێرگەسوور، پێچی هەوراز، گردۆگۆلکە و دارستان بە ناو زیخو بەردەلانیدا، باوە، بە قەدی چیاوە لای راست، چۆمو پرد، بانی نێوانی نێوخینو کێوی پیران، گوندی باوە بەمبەرەوە، شێخ سەیدان بەو بەرەوە، پێچو لایەلا، رێی قیری بەد بە ناو دۆڵو نزاری رەشو هەورازدا بەرەو مێرگەسووری خواروو، پردو چۆمو باخ، مێرگەسوورە بە قەدی کێوی شروەدینەوە، نێوانی پیرانو نێوەخین، بنەی شارستانە دەفەری زێبار کە لە پێشدا لە گوندی بلە بوو.

فرۆشگەو فەرمانگە و کارەبا، شوێنگەی وەکو شەقلاوا وایە، زنجیرە کێوی لای باتیر، خۆراوا، گرتویەتیە نێو خۆی، بای فێنکی بۆ دێت، دەفەرەکە کوورو کەمئاوە، لە نێوانی کێوی پیران لە باکوورەوە، نێوەخین لە باشوورەوە، ناسراو بە بیاو زنجیرە کێوی برادۆستە بەسەر دۆڵی بالەکیانو دۆڵی مامزی ترسناکدا لە خاوەرەوە بەسەر جەنگەڵی چنار و دارەوە لە خۆراواوە دەڕوانێت.

**مێرگەسوور:**

گوڵستانی کەسکو سەوز، هیچ هەوارگەیەك لە جوانیدا نایگاتێ، هەرچەندە ئاوەدانیو حەساوگەی تێدا نییە، رێگەکەی باشنییە، لەبەر ئەمە میوانی کەمە، بەرزی 1250م، پلەی گەرمی 25 –30 پلە.

لە گەلییەوە بە ئوتومبیل بۆ باپشتیان، دووریانی رەواندوز، 50 کم، لای چەپی بۆ مێرگەسوور، بە ناو سەوزیو دیمەنی رەنگدو جواندا بەرەو ئارامی مێرگەسووری سازگار و ئاوو بای خۆشو ئاوی شیرینی کانی مێرگەسوور و سەروکانی و بیمرکی، کزەو سروەی بای دڵگیر و کەشی گونجاو و ساز بۆ تەندروستی پڕ سوودە و دەرمانی نەخۆشییە.

بە نزیکی سپێدارەو و ماڵە سواری قەدی کێوی ئەوبەر بۆ گۆڕەتوو لە ناوەندی دۆڵدا 30 خانەیە، لێرەوە بۆ بییە، کووران، کانیلنج، جامە، دووریانی هەرکوش بۆ شیروانی مەزن، رێگەیتر بۆ / زێتە، گەلێ، هەوراز بە ناو گردۆلکەو دەشتی دیانەدا، باپشتیان، کەمێ تەختێ، دووریانی دیانە و لێژی بەرەو کاولۆکو

پێچی هەموراز بۆ ڕەواندوز، شوێنگەی بەرزی، بنەی شارستان، کاولۆك، کەناری ڕۆباری ڕەواندوز، جندیان، گازینۆکەی.

لە ناو ئاوایی جندیان – جنیان، بەرەو ڕەواندوز، هەموراز بەلای چەپدا 1 کم کەمتر گازینۆی جادوو، جۆگەی کۆنکریت تاکو چاوگەکەی کە لە کونە شاخەکەوە دێتەدەرێ، کونەکەی فراواننییە، ئاوە زۆرەکەی لە پڕ کەم ئەبێ نامێنی، بە تفەنگی تاپڕو تەقەی دەنگدار، لەڕینەوە پەیدا بەبێ لە چیاکە ئاوەکە دووبارە، پەیدا ئەبێتەوە، لەبەر ئەمە پێی ئەڵێن کانیجادوو، جنییان، سێبەر و تەختی بۆ گراوە، خێوەتی گەشتیاری بۆ میوان، تا ڕادەیەك ڕێکخراوە.

پردی جندیان، 50 کم بۆ ڕایات، 7 کم لە ڕەواندوزەوە، 47 کم بۆ گەلاڵە، شارێ بە کەناری ڕۆباردا، لاپاڵو پێچ بە دۆڵدا هەتاکو بێت فراوانتر ئەبێ، دێبەرەکانی بە بەرزییەوە بەوبەری ڕۆبارەوە، پێچی سامناکو بیمدار، هەوارەکۆن، پردی پیادە، لە خوارەوە، 55 کم بۆ هاجی ئۆمەران، 45 کم بۆ ڕایات، لاپاڵی بەردو دۆڵی تەنگو کەناری ڕۆبارو کێوی هەڵچوو، بەرسیرین، بەوبەری ڕۆبارەوە، پردێ لە خوارەوە، پردی داخراوی بەرسیرین، لاپاڵی ئەمبەر 45 کم بۆ هاجی هۆمەران، 35 کم بۆ ڕایات، پردی گراوەی ڕێزانۆك، گازینۆ، لاپاڵو ئەوبەر، پاشکۆز بەوبەرەوە، ئاوکێلك، چۆمو دۆڵی ڕەشی نێوانی دوو زنجیرەکێو، باخی چنار، هۆمەراوا، پردی داخراوی سوور، لای ڕاست 35 کم بۆ هاجیهۆمەران، 25 کم بۆ ڕایات، ڕێزانۆك، پردی زەرد، لای ڕاست، کێلگەی توتن، گەلاڵە بە پاڵەوە... ڕێی گەلاڵە 30 کم بۆ هاجی ئۆمەران، 20 کم بۆ ڕایات، 2 کم بۆ گەلاڵە، هەموراز بۆ گەلاڵە.

## گەڵاڵە:

بەری کراوە، 3 لای کێوە، 2 گەرمکی ئەمبەرو ئەوبەرە، پردی، لە کەوانەی خاوەریەوە، بە یەکیەوە بەستوە، بە سەر چۆمدا ئەڕوانێ، دارودرەخت، تەنیشتەکانی داپۆشیوە، بنەی بەخشە، بنکەی باڵك... دێینەوە بۆ چاخانەکەی دووریانی گەڵاڵە، بە شارێدا، بە کەنار و لاپاڵو باخی چنارو کەناری چەپدا، 25 کم بۆ هاجی هۆمەران، 15 کم بۆ رایات، ناوپردان، پردی لای راست، خانووەکانی بەوبەرەوە، کۆشکی ئاشتی، پرد، چۆمانی خۆشو ئاوەدان، پردی نوێکراوە، لە بەری لای راست، دۆڵەکە فراوانتر ئەبێ، پردی ئاوەند لای چەپ، باخی چنار لە هەردوو لاوە، دەربەند، خۆشیو ئاوەدانی، گوندەکە لە پەنا کێودا، چۆم بە بەردەمیدا، 15 کم بۆ هاجی هۆمەران، 5 کم بۆ رایات، بەرزی بە لاپاڵی ئەملادا، کراوەیی، فراوانی، رایات... گازینۆ و پردی بەرزی، ئازادی، زینووی شێخ بە پاڵی لای چەپەوە، 5 کم ماوە، هەوراز و کراوەیی، فراوانی، کێوی ئاگۆیان دیارە، هەوراز، گۆمەز و خرگەی شێخی باڵەکان، هاجی ئۆمەران، لێژی بۆ سەر لوولەی ئاوی سارد و چالاو، سەیرانگە و هەوارگە و ئاوی ساردو تەزیو و سازگار.

هاجی هۆمەران، سنوورە، باکوری رایاتە، بەرزی 700-750 م، بەفر، زستانو بەهار لوتکەکانی داپۆشیوە، زستان 15 ژێر بەستنە، هاوین 28 پلە، حەساوگەی باشی هەیە، میوەی زۆرە، ئاوەکەی بۆ نەخۆشی گورچیلە بەکەڵکە.

## خەلیفان – بارزان 85 کم:

بەخشی خەلیفان، کارەبای هەیە، هەوراز بە لای خانووەکانیدا، پێچو لاپاڵی گرد و لابەلا و تەختیو دۆڵو کەمێ تەختی، سریشمە بە قەدی سەری چیای سریشمەوە، پێچی لابەلا و لێژ و دۆڵو نزار و پێچی لێژ، کنە 2 خانەیە، پردی داخراوی خەلان، لەسەر ئاوی رەواندوز کە لە بێخاڵو ئاوی هاجی هۆمەران پەیدا بووە، باخی پێشی خەلان، چاخانەو پەکدو کانی، لە خوارەوە، لە پشتیەوە، خانووەکانی لەسەرەوە 15 خانەیە، پاسگەکەی لە تەختایی سەروو گوندەکەوە لاپاڵو گردو بەرزی لای خەلان بەجێئەهێڵێ، بانی نێوانی زنجیرەی کێوی شیرینو

پێرس، ڕەشیو نـزارو جەنگەڵ، هەر دوو زنجیرە کێوەکەی داپۆشیوە، بـە تایبـەتی زنجیرەی پێرس کە هەمووی ئاوو گوندو ئاوەدانیو ڕەشیو دەربەنـدە لـە کێوی گارە ئەچێت، ڕیـزە لوتکـەکانی، لـە ڕێگەکـەوە دیـارن... لێـژی بـەرەو کـەناری چۆمی خەلان، دۆڵی قووڵو پێچی هەوراز، لاپاڵ لای ڕاست لە بەندەنەوە، 6 کم قـیری بـەد، بانی کراوە، جافرەکان، 3 خانەیە، شیوەڵو هەوراز و لاپـاڵ لەمبـەرەوە، لێـژی، گـەلی بێخمـە، دەرئەکـەوێت، لـە زنجـیرەی پێـرس، زێـی بەهـدینانی پێـدا ئـەڕوات کـە لـە ڕۆباری ڕەواندوز ڕۆکچوکو ڕۆباری شینی لای ئامیدی، پەیدابووە، ئەویو تەختی بە لوتکەی هەردوولا ئابلوقە دراوە، چۆمی خەلان لە قووڵیدا، هـەوراز و نزیکبوونـەوە لە بناری ئەمبەر، شیوەڵو ئـاو، بـانی ئەمبـەر، چۆڕان 6 خانەیـە، لای چـەپە، بـانو دەڤەری کووڕو کەمناو و شینایی، خنکە لەسەر زێی بەهدینان. زێی باکوور.

## ئەشکەوتی شانەدەر:

لە باشووری کێوی براد‌ۆستە، بەرزی 2200 پێ، لـە ڕووی دەریـاوە، بەسـەر ڕۆبـاری زێـی ژووروودا ئـەڕوانێ، لـەم ئەشـکەوتەدا، ئـامێرو کاکڵـەی بەردەئەسـتێ دۆزراوەتەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ چـەرخی کەڵچـەری سـەدەی بـەردینی ناوەنـد، ئـەوەی گرنگـە کـە تێیـدا دۆزراوەتــەوە، پەیکــەری کۆئێسـکە، کەللەسـەری مـەردومی نیاندەرتاڵە، پـێش مـەردومی هەنوکـە ژیـاوە بـەر لـە 50 هـەزار سـاڵ، ئـەو جۆرە مەردومە نەماون... بە لاپاڵی نزیکی زێدا، پێچو دوورکەوتنەوە لـە زێـی شانەدەر، لەسەر زێی و ئەشکەوتە مێژوویییەکەی لە زنجیرەی کێـوی شـیرین بـاکوری خـاوەری ئاکرێ، نزیکی سنووری دەستکرد – تورکیە، لاپاڵو زێی باکوور، گەورە، زابوایلو(*).

کێوی بەردەڵانی، نزار، پردی گچکە لەسەر دەرەی ئەمبـەری زێـی، بیلەسارو، قەڵاتو بە پاڵەوە، کراوەیی نزیکی زێی ڕێزان لەسەر زێی، ئاوەدانیو خۆشـی، پاسـگە کۆنەکەی شۆڕئەبێتەوە بۆ سەر پردی داخراوی ڕێزان لەسەر ڕۆکچۆک، لێرە تێکەڵ

---

(*) زابوایلو، ناوی کۆنی زێی گەورە، زابشویالو، زێی گچکە، ئامات–ئامێدی.

بە زێی ئەبێ، کەنارو تەختیو کراوەیی بەرەو بلە - بلێ خوارووو، سەروو، بلێ لەسەر زێیە، ئاوەدانو خۆشە، زەویوزاری هەیە، لە پشتەوە پاسگە کۆنەکەی چۆڵە، گازینوی 2 نهۆم، شوێنی حەسانەوە.

بلێ، بنکەی فەرمانداری زێباربووە، هەنوکە مێرگەسوور بنکەی زێبارو مێرگەسوورە... هەوراز و پێچ، نیو کاتە بۆ بارزان. باخو بەردەڵانیو ناو نزار و دارپەروو، لێژی، بارزان، دەرنەکەوێت، بە بناری کێوی شیرینەوە، پێچی لێژی بە لاپاڵی ئەمبەردا، ئەولای دۆڵ، بارزان دەرکەوێتەوە لە بەرزییەوە، بە تایبەتی باخەکانی خوارووی، بەردەڵانیو لاپاڵێکیتر، پردی گچکە، بە ناو باخەکانی پێشەوەیدا چەند جۆگەیەکو هەوراز و پێچو لابەلا، بنەی بەخشی بارزان، ئاوەدانو خۆش، 265 خانەیە، فێرگەو فەرمانگەو مزگەوتە کۆنەکەی کە لە پێش ئیسلامدا دێر بووە، لە تەنیشتیەوە کە نیشتەی جووە، پاشەواری ماوە، کلیسەی تێدایە، دەڤەری ئاینی بووە، زەویو نشینگەی ئاینی ئاسمانی بووە، کوردستانی ئاینگە Religions land ، بەهدینان.

### بارزان:

لە باکووری خاوەری ئاکرێوە بە 25 کم، نزیکی لای سەرووی زێی بەهدینان، مۆناتی 3 هەزار پترە، دەڤەری شاخاوی، سەختو قایم، زنجیرەی چیای شیرین ئابلۆقەیداوە، بەسەر گوندی بارزاندا فەرمانڕەوایە، لوتکە بڵندەکانی 2300 م، چیاکانی پشتەوەی 2500م ئەبن، کۆسپو تەنگیو سەختی ڕێی لێگرتووە، ڕۆبار و ڕێژەنو ئاوەڕۆی زێی و ڕۆباری ڕەواندوز و ڕۆکچوکو شەمدینان، کە دەڤەری بارزان لە ئامێدی ئەپچڕێت، ئەم کۆسپە سروشتیانە، هۆکاری قایمیو سەختی شوێنەکەی بێت، هۆی کاریگەری کەمپیتیو کەمبەرهەمی دەڤەرەکەبێت، نشینیانی ناچارکردووە کە بە لوولەی تفەنگ، ژیانی خۆیان دابین بکەن، جەنگاوەری سەختو دلاوەر و هەڵکەوتووبن.

لە سەدەی 19، یەکێ لە شێخانی ڕێبازگەی نەخشی، شێخ موحەممەد، ناو، نشینگەی خۆی لە ئێران بەجێهێشتووە، لە سلێمانی نیشتەجێبووە، دوایی

روویکردۆتە گوندی بازی، شێخ ئەبدورەحیمی کوڕی پێڕەویکردووە و گوندی بارزان چۆتە ژێر رکێفیەوە کە 7 کم دوورە لە بازییەوە، لە ساختمانە کۆنەکەی تەکیەی دروستکردووە بۆ خۆیو باوەرانی، پۆست نشین بووە.

شێخ ئەبدورەحیم 5 کوڕی لەپاش بەجێماوە، شێخ ئەبدوسەلام، شێخ ئەحمەد، خودانی بارزان، بارزانی مەلا مستەفا، شێخ سەدیق، شێخ موحەممەد بابو.. شێخ ئەبدوسەلام جێگری بوو، فەرمانڕەوایی دەڤەرەکەی ئەکرد، سەری نەوینەکرد بۆ سوڵتانی ئوسمانی، چەند جار بەرگریکرد و شکستی پێهێنا، لە 1909 پەیمانی لە تەك نازم پاشی والی عیراقدا بەست، خۆییك، باجو سەرانە و سەربازی نەئەدا... هێرشی سوپایی هێنرایە سەر بە فروفێڵ، بە کۆمەکی فارساغای زێباری بەدیل گیرا لە مووسڵ لەسێدارەدرا، 1904.

### قەراخ، سێوسێنان - 15 کم:

لێژی بە رێی لای راستدا، شیوو گرد و هەوراز، دووریانی جافەران، تافان، لێژی بەرەو بنار و تەختی، رێی قۆپی – کۆپی، کەناری چۆمی دێوانە، سەیرانگە، داروگۆڕ، لە چۆمی دێوانە ئەپەڕیتەوە، ئاوایی چەمی سمۆر، هەوراز و گردی بنار، رێی ئەستێلی ئەجم، لای راست، ئاشان، گوندی ئەستێلی ئەجم دیارە، تەختیو هەوراز و تەختی، لابەلا، داروگۆڕی کۆشکی خواروو، رێی بەلەکجاڕ، کێوە بێشکەسپی، لە کەلوش کۆتایی دێت، هەوراز و تەختی گوندی سێوسێنان 300 خانەیە، لە بناری بێشکەسپی، لێرەوە بۆ کەلۆشو دێوانە و باوەخۆشێن، دیوی دەربەندیخان لەو لایەوە، گوندی تەکیەو دەربەندگەورە لای خۆراواوە، دەربەند بەرووله – بەرەولی پەیکولی بۆ لای بانیخێلانی دەرەبەندیخانە.

### قەراخ - رێی نوێ:

لە پردی تانجەرۆوە 42 کم گوندی زرگوێزی گەورە و گچکە، زرگوێزەڵە، پێچی هەوراز، بانو نشێوی بەرەو گوندی تلەزەیت ناودار و خۆش گوندی باخان، ماوەیەکی کەم بنکەی قەراخ، زەردیاوا.

قەراخ، جافەران، گوندی تەکیە، پەیکەری نارامسن، بە رێی سێوسێناندا، دۆلیتر، گردۆلکە، رێگەی تافان، نزیکی رێی 12 خانەیە، دارو گۆڕ، چۆمی تافان، چۆمی دێوانەو کەناری، دارودەوەنو گۆڕ، گوندی ئاش لە سەر چۆمی قازی، 12 خانەیە، مووچەی جافەران، پردی چۆمی دێوانە، بەرزی، دەروپانی خوارووو لای راست، جافەران 100 خانەیە، لە بەردەمی دەربەند جافەراندا، ئاوەگەی لە دەربەندەوە دێت، کارێزو کانیاوی هەیە، قەراخو دووڕپانی سەروو خواروو، دیارن دێتەوە بۆ لای گوندی سەرکۆ و رێی سێوسێنان، رێی گۆشان، داری زەرد، ئەستێلی نەجم، لای راست، کۆشکی خواروو، لای راست، کۆشکی سەروو، رێی تەکیە، بە دۆلو چۆمدا، لە چەمی کۆشك ئەپەڕێتەوە، هەوراز و سوورکە و ناوگرد، گۆڕستانی تەکیە، سێوسێنان، خانووەکانی دیارە، کەمێ هەوراز، گوندی تەکیە، 100 خانەیە، کەمئاوە، فێرگەی تێدایە، خانووەکەی کرێیە. ئاواییەکە لە بەردەمی دەربەندا، دەربەند تەکیە 5 کم بۆ ناو دەربەند، پیادەڕێ لاپالو بەردەمەرمەڕی چەشنی بەد، هەوراز و دار و دەوەن، کونەگەچی ملەی مالەمەسۆیی، هەوراز، کۆشکی سەروو، کۆشکی خواروو، دیارن، بەلای راستی دەربەندتەکیەدا، قەپال بەرەو دەربەند گەور – گەورە، رەزەکانی شیوی گەچی تەکیە، چۆمی شیوی گەچ، ملەی هەزەلکە، شۆڕئەبێتەوە بۆ ناو دەربەند، 2 چالاوی بەردین، هەورازی ئەوبەرو پێپیلکە بۆ ناو قوڕگی دەربەند گەور، هەورازی ئەمبەرو قوڕگی قووڵ، پەیکەری نارامسن لەبەری چەپەوە، 4 م درێژ، 2 کەسی کەچکە چوارپەکی پەیکەرەکە لە ژێر پێیدا، پەکێکیان وێنەی ژنە، نیشانەی مەزنیو بزورگیو هێز و دەستەلاتو سەرکەوتنە، میلی سەرکەوتنە، روویکردۆتە باشووری خاوەر بە بەرگی سەربازییەوە، خوودە لەسەریدا، شیر بە دەستی راستیو کەوان – کوتەك بە دەستی چەپیەوە، ریشی درێژی لاکێشی، هونەری سۆمەری، لە بەرد هەلکەنراوە لە کەوانەو کەورگی کێوەکەدا، باران نایگرێتەوە بەرزی لە ناو دەربەندەکەوە، بە پەیژەی درێژی ئاسن، ئەیگاتێ کاتی خۆی لە کۆشکی ئەمارەت – ساختمان، نیشتەجێبووە، 5 کم لە پەیکەرەکەوە دوورە، پێتەختو کۆگابووە، ئاودارە.

چەرخی شۆڵکی – نۆرنیمۆ

سۆمەری

دەربەند گەور – گەورە

میلی سەرکەوتنی نارامسن

قۆپی – کۆپی، داریزەرد، 50 کم لە سلێمانیەوە، 65146 پێ بەرزە، لە قەرەتۆغان – قەرەدۆغان، هەڵۆی رەش، ناوەکە تورکییە، پردی تانجەرۆ، پێچەکانی کانیسپیکە و گڵەزەردە، بۆ ئەودیوی زنجیرەی بەرانان، گوندی تیمار، پێدەشت، قەراخ، بە جافەراندا، چاڵاوی داریزەرد، لە زنجیرەی چیای گارە ئەچێ.

**قەراخ – تیمار** - گەرمزیل، هەرگینە، تەنگیسەر..

تیمار 14 خانەیە، دوای پێچەکانی گڵەزەردە، دیوی قەراخ، لای چاخانەکەیەوە، لائەدات، خانووەکانی دیارە، فێرگەی تێدایە، چارەکێکە بۆ گوندی گەرمزیل، باخی سەروو 10 خولەکە، گوندی قارەمان، 5ر2 کم، هەوراز و گردۆڵکە و دارو دەوەنو جەنگەڵ، باخی سەروو لای راست، گوندی گەرمزیل دیارە، 26 خانەیە، فێرگەی تێدایە، گردۆڵکەو بەرزی، نشێوی، دارودەوەن، ملەو داروگوڕ، هەوراز، کانیرۆشنایی، 15 خانەیە، فێرگەی تێدایە، گوندی برایماوا 35 خانەیە، گوندی تەنگیسەر نزیکە، رێی بەدو لابەلا، کەمێ هەوراز و نزمی گوندی برایماوا دیارە، لە پەناگردا، 40 خانەیە، بەرەو تەنگیسەر لابەلا و تەختیو نشێوی، چۆمی سەرزەل، گوندەکە لە ناو دەربەندەکەدا، رێی بەد و هەوراز، تەنگیسەر، دیارە پێچو بنارو بان، گۆڕستان، شۆڕ ئەبێتەوە بۆ سەر چۆمی تەنگیسەر و ناو گوند، 55 خانەیە، فێرگەی تێدایە، تیماگەی نییە، ئاوی خاوێنی کەمە.

## تیمار – ولیان – تلەزەیت:

تیمار، پێدەشتی تیمار، ڕێی ولیان، دوای چارەگێ، پێچو نەویو تەختی، دارو گۆڕ، گوندی باخان 12 خانەیە، تەختیو چۆمو لابەلا، هەوراز و تەختی، گۆڕستانی تلەزەیت، هەوراز، شۆڕدەبێتەوە، تلەزەیت بە بنارەوە بە قەپاڵەوە، 50 خانەیە، چاوگی ئاوەکەی 10 خولەکە، چەند کانیاوێکە، لەوێوە شۆڕ دەبێتەوە بۆ گوندی ولیان، لێژی بەلای چەپدا، لێژیتر، ئاڵیاوا و چۆمەکەی چۆمی ولیان، هەوراز، گوندی ولیان 75 خانەیە، چارەکێکە بۆ سەر ڕێی قەراخ، ئاوی خواردنەوەی هەیە، فێرگەو تیمارگەی تێدایە، هەوراز و نەوی، دەوەن، گردۆلکە و خڕە بەرد، شەقامی قەراخ.

## هەولێر – کۆیە – 72 کم:

شەقامی قیر، گوندی کەسنەزان، دڵوپە، لە ناو گۆدۆلکەدا، نزیکی دەربەند گۆمەسپان، باسکەکەی نزیکە لە ڕێگەکەوە دیارە، زنجیرە چیای باواجی لای چەپ، پێدەشت لای ڕاست، دەشکەوتسەقا، 30 خانەیە، گوندی ئاربانوباقلیتی لەولاوە لای ڕاست، تەرگینە، کەمێ بەولاوە دووڕیانی پردی ئاڵتونکۆپری، دەفەری دێگەڵە، بەخشی شۆڕش، پردی دێگەڵە، گوندی سماقشیرین لای ڕاست، گۆمەتاڵ لای چەپ بە زنجیرەی باواجییەوە، تەکەول لای چەپ لە دۆڵدا، بە ناو گردۆلکەدا، دووڕیانی کەرکوک، شەقامی سێبەر و درەختی کالیبتۆس بە هەردوولای شەقامەکەدا، کۆیە.

## هەولێر-ئەربل – مووسڵ-نەینەوا 87 کم:

هەولێر، چالوک، گوندێکی گچکەیە، هەوراز و نەویو لێژی، بۆسەر کەڵەکی یاسیناغا، ئەسکیکەڵەک، کەڵەکەکۆن، پرۆژەی سامانی مردارییو (Poultry) زیندەوەرو کشتو جەنگەڵ، چەند ساختمانێکی میری، دارو درەختی کالیبتۆسو چنار، لە شیوەکەدا، تاکو ئێرە، 37 کم، پردی گچکە پردی گەورەی ئاسن ، نزیکی کەڵەک، چاخانەکانی، هەوراز، پردی خازر، لکی ڕێی باکوور لە تەک ڕۆباری گۆمڵ لە نزیکی گوندی مەندان، ڕێی ئاکرێ تێکەڵدەبن، ڕێی بادینان پەیدا دەبێ، گوندی

شێخ ئەمین، رێی قەرەقوش، بنەی بەخشە 1 کم لە ڕێگەکەوە، بەرتەلە – بەری تـل، شـارەوانیو تیمارگـە و پۆسـتو بـیری ئیرتـوازی هەیـە، بنـەی بەخشـی حەمدانییەبووە، دووڕیانی ئاکرێ، 87 کم بۆ ئـاکرێ، بـۆ مووسـڵ ، بـەری ئەینـەوا، خەوابگـە و ئارامگـەی پێغەمبـەر یـونس ، گۆڕسـتانو گـەڕەکی نەسـر، مزگـەوتی ئەجیب جادر.

## مووسڵ – ئاکرێ – 87 کم:

لە مووسڵەوە، دووڕیانی خەزنـە، تـیس خـەراب، دووڕیانی بەعشیقە، ئیمام رەزای شـێخ، جـیای مـەقلوب، دێرێکـی کـۆنی تێدایـە، 364 ژوورە، گونـدی دووبـەردان، هـەورازی جـیای مـەقلوب، بـان، پێچی لێژی، گونـدی کـانیلان، پـردی مەنـدان 53 کـم مـاوە، گونـدی کـانیلان لـە خێڵی گێـژن، هـەوراز و پێچو لێـژی، نشیوی، گوندی شیوەڕێ، بەردەڕەش، زەنگەنان، بنـەی بەخشـە، دوو گونـدی نزیـك، لێـژیو تەختیبێنەشـت، گونـدی مـەموزین، قـەرەناس، گونـدی جوجـەڕێ، گچکەو گەورە، رووپیای موشیرئاغای سەرداری خێڵی گێژ، جۆگـە و ئـاو، دەشـتی ئـاکرێ، کـە بـە بـرنج بەناوبانگـە، گرسی سـەرۆکی هـەرکی، گونـدی مـوحی، لـە سـەرانی خێڵی هەرکییە، هەوراز و پێچ، رێی بەناو دارو دەختدا تاکو ئاکرێ.

## ئاکرێ:

لە دامێنی جیای ئاکرییە، بە فەدپاڵەوە، سەیرانگە و شوێنی دیدەنییـەکانی، سیپەلە، بەرزی 40 م، تاڤگە و ئـاو، هـەروەها کانیزەرد، چاوەکەی 4 × 9 م، ئـاوی سارد، سەرەوژێر ئەچێتەوە بۆ تاڤگەی سیپەل.

## مووسڵ – دهۆك – 73 کم:

دەرگەزلێ، ئارامگـەی پێغەمبـەر جـەرجیس، رێـی تلکیـف 7کـم بـۆ گوندەکـە، پاسـگەی فلفیلـە، دووڕیـانی تەلعـەدەس مـەنارە، چـاخانەکەی بەرانبـەری جـیای ئەلقۆش و گوندەکەی، پردی ئاسنی بەفاق، کراوەو گچکە، جیای دووکان لای راسـت

، وەکو چیای مەقلوبە، پاسگەو گوندی فایدە، لێژیو پێچو دۆڵو شیو و دارودرەخت، گوندی شێخ نور مەحەممەد، هەوراز و پێچ دووریانی زاخۆ، بۆ دهۆك 8 کم، بۆ زاخۆ 51 کم، لە مووسڵەوە بۆ زاخۆ 64 کم.

## دهۆك زاخۆ – 59 کم:

لە گردی ماڵتەی نزیکی گوندی ماڵتەی پاشەوارەوە بۆ دووریانی دهۆك 8 کم، رێی تەخت و پێدەشت، گوندی سەرتەنگ، بنەی بەخشی سمێل، هەنۆکە شارۆچکەیە، لە بناری گردا، پرۆژەی ئاو و کارەبای تێدایە، پێدەشت، پردی کراوەی گچکە، دەشتی دێمی سلیڤانی، گوندی کانیسپی نیو کم، گوندی گردەرەش 1 کم، لە رێگەکەوە ، پردی کراوەی گچکە زنجیرە چیای بێخێر بەملادا و پێدەشت بەولادا، لە دەشتی چەرمەگای سووردەش نەچێت، گوندی باستکی، نزیکی پردێکی کراوەی گچکە ، پێدەشت، بنەی بەخشی سلیڤانی، ئاسی، ئاوسپی، فێرگەو تیمارگە و دامێنی چیای بێخێر، رێی تەختو قیر، ئەم دەشتە بە ئاوی دەچلە، ئەتوانرێت ئاودێر بکرێت، بە ترومپاو ماتۆرو لوولە، رێی دێربوون، پێشخابوو، باسکو زارگەلیسپی زاخۆ، پێچو هەوراز و باسکو پاسگە و کونەئاو، بەرەو زاخۆ، ماوەی گەلیسپی 10 کم کەمترە.

## زاخۆ:

114 کم لە مووسڵەوە، 1450 پێ بەرزە، لە رووی دەریاوە، مۆناتی 25 هەزار کەسە، هەنۆکە شارە ئاو و بای سازگارە، رەزو باخی زۆرە، لەسەر رۆباری خاپوورە، لە چیای ئەودیو کوردستانی باکوورەوە دێت، درێژییەکەی 160 کم، شاری زاخۆ دەخاتە نێوانی خۆیەوە لە باکوری شار ئەبێ بە 2 قۆڵەوە، وەکو دوورگەیەکە لە خواری شار دەبنەوە بەیەك، 3 پردی لەسەرە دوانیان شارەکە ئەبەستن بەیەکەوە، پری سەعدونی، فاروقی، سێیەم پردی مەزن، دەلال، 25 کلە، 5 تاقە کەوانەییە، لە ناوەندا 15 م بەرزە، 10 م پانە، تاقە گچکەکانی 7 م پانو 5 م بەرزە، بە شێوەی کەوانەیی، بنکی پایەکان لەسەر بەردی نیشتوویی

دروستکراوە، درێژی 111 م، پانی لەسەرەوە، 4 م کەمترە، رێگەیە، چەرخی میـد و رۆمان دروستکراوە، لە بەردی تاشراو و رێك، درێـژی تێکڕایی 60 × 30 سم. لە گەلی زاخۆوە، بۆ ئیبراهیم خەلیل - پردی خاپور، لە زاخۆوە 11 کم بۆ سنوور.

## زاخۆ – هەوارگەی شرانش:

گوندی تلکەبر، پرۆژەی ئاوی زاخۆی تێدایە، پێدەشت، رێی قیر، گردۆڵکە لە هەردوولاوە، گوندی داروزان، بەرانبەر گوندی گوندۆك، جەلال، گرکسندی، مێرگە، نورەدین، نزیکی رێی هیزاوا، نزیکی رێگە، گوندی گورە، دوورپانی باتوفـە، گونـدی دەرگانەجەم، لە دامێنـی چیای شـرانش، زار، شـیوی شرانشی رەنـدو جوان، پێچو هەورازی رووتەنو سەخت، پێچی نشێو، شرانشو دیمەنی دڵفرێن، شرانشی گچکە، شـیو و داردرەخـت، پێچـی هـەوراز، شرانشـی رەنگـین، دیمـەنی جـوانی خـەڵاتی سروشت، کریستیانو کورد، رێژەی کورد پترە، گوندەکە لە گەلیـدا تاڤگە لە ناوەنـدا لە شیوی شرانشدا، تاڤگە بە بەرزییەوە دارودرەختی هەمـەجۆرە، فێرگەی شرانشی کـورد، رێـی بـەردەڵانی، مـاوەی چـارەکێ، شرانشـی گـەورە، لـە شـیوی نێـوانی کلیوخـانتوردا، هـەموو کریسـتیانن، فەڵە – دیـا، درەختـی چناری زۆر، کـە داهاتی دەڤەرەکەیە، چاوگی ئاوی سارد، شاڵی مەرەز و چنین، شاڵوشەپلك، پیشەسازی.

## شرانش:

22 کم لە زاخـۆوە، کاتونیوێکە، لـە دامێنـی بـاکووری چیای دودان لـە بـانی راستی چیای خانتورە، چەند گوندێکی جوان، شرانشی کورد و شرانشی کریستیانی، گەلییـەکی قـووڵ لەیـەکتری دابڕیـون، لـە نێوانی خـانتور و دوودانـدا، بـەو دۆڵـە جوانەوە نووساوە، ئاوی خاوێنی تاڤگەی رەند، پژاو لە بەرزی 45 م، شرانشی پاس، لەسـەر تاڤگەکەیـە، بـە سـەر چـیای گـیرادا، ئـەڕوانێ، لـە زاخـۆی دابڕیـوە، کـانزای رەژووی خەڵووزی بەردی هەیە،

شرانش 1350 م بەرزە، پلەی گەرمی 26-22 پلەی سانتیگرادە، ئاووبای سازگارو شێی کەمە، دارچنار و باخو دیمەن چاو لێی تێر نابێت، بەهەشتی کوردستانو سەرزەمینە، ئوتومبیلی بۆ دێت، بە ڕێگەی سەختو پێچدا.

## دهۆك – ئامێدی – 95 کم:

لە گەڵ دهۆکەوە، نێوانی کێلی فرعینی، شەداد، ڕێی ڤیر، پێچوشیو، گردی قەسرۆك، ڕەزوباخ، گوندی بیری مرو، باشلور، پێچی هەوراز، دۆڵ، هەردوولای دارو درەخت، جۆگەو ئاو، هەوراز و تەختی، پشەگری، ڕەزوباخ، گوندی قارقاراوا، پێچی نشێو و هەوراز، چیای کەمکە لای چەپ، سندۆری خواروو، کێلگەی میری، شیوی پێچاویو هەوراز، گوندی بادی، ڕێ بە ناو داروردەختدا، گوندەکە لە سەر سنگی دەربەربوی چیاکە لە شیوێکدا، چاخانەی سەر ڕێ، هەوراز و پێچ، زاوێتەی خواروو، بنەی بەخشە، لێژی بەرەو گوندو گازینۆ، ڕێی بە ناو جەنگەڵی سروشتیدا، پێچو بادانەوە نشێوی، گازینۆی میری، چاخانە، گوند، جەنگەڵی سنەوبەر و کاری سروشتی، گازینۆی زاوێتە لە زارگەڵ داروردەختی سنەوبەر و بروو.

## زاوێتە:

لە پێچی گەلی زاوێتەدا، 90 کم، لە مووسڵەوە، 900 م بەرزە، پلەی گەرمی 32-30 پلەیە، لە هاویندا... جەنگەڵی سنەوبەر و کاژ و ئاوی سارد و سازگار و باخی جوانو حەساوگەی هەیە، بەرزی دارستانەکەی 600-800 م.

زاوێتە، شەقامی ڤیر، هەوراز و چیای ڕەش لای چەپە ڕێی قەدپاڵ، دۆڵ لای ڕاستە، بەناو جەنگەڵدا، بابلو، پێچو هەوراز، بەندەن، گوزەرگە، پێچونشێو، چەند دەربەند لای ڕاستە، گازینۆی میرونا، پێچو هەورازوبان، لابەلا، پێچی نشێو، پاسگە، پێدەشتو دۆڵی فراوانو کراوە، پاسگە، لابەلا بە ناو دۆڵو گردۆلکەدا، پردی گچکە، پاسگە، دووڕیانی ئەترۆش، هەوراز بۆ گەلی مێرگە، دوای گوندی کانیکەوکا، کورەدێری، پیدە، دزوبیدیلە، دوای ئەم گوندانە، گەلیقیرکە، بەرەو لالش،

هەورازوبان پاسگە، لالش 10 خولەکە لای راستەوە، لا ئەدمیت بۆ دۆڵی لالش، گۆڕی شێخ ئادای، شێخ هادی، پێشەوای ئێزدی، گومەزو خرگە و دێر و حەوشە و حەسار و سێبەر، فرۆشگە، خەوابگەو ئارامگەی شێخ حەسەن، شێخ ئادی، ئاو و کانیاوی ساردی دۆڵی لالش.

دووبارە شەقامی قیر، پێدەشتو شیو، پاسگە، نۆدارە، ئەینسفنی، بنکەی دەفەری شێخان، نرگزی، ئاومران، دووڕیانی ئاگرێ، فازلییە، باحزان، ئارامگەی پارساپانی ئێزدی لەملاوە، شێخ بەکر، باخاتی زەیتونی بەحشی بەعشیقە، دووڕیانی ئاگرێ، پێشەوا رەزای شەبەك، تیس خەرابی تورکمان، خەزنە.

## زاویتە – سوارەتوکە:

گۆڕی کافان، لای راست، پێچو هەوراز و تەختی، نشێوی نێوانی دوو زنجیرە چیای گەلی فەنتار، باگیرەی خواروو، پاپین، دووڕیان، بۆ مانگیش 14 کم، جۆگەو ئاو و پێچ، هەورازو تەختی، گوندی لۆمان لای چەپ، نزیکی رێ، پێچی هەوراز، سارتکێ لای راست، مێرگەدرێژ، چاخانەو کەپر، پێچی هەوراز، هەوارگەی گادرێژ، سوارەتووکە.

## سوارەتووکە:

لە مووسڵەوە 114 کم، 1250 م بەرزە، پلەی گەرمی 38 پلە لە هاویندا، لە شیوی ساینەی فراواندایە، لە زارگەلی، گازێنۆی خۆشو خانووی میری بڵاو، هەمووی 2 ژوورو گەرماوی هەیە.

## سوارەتووکە – سەرسەنگ:

پێچی نەوی، لە پشتەوە، دیمەنی خانووە نیگارینەکانی، لە پێشەوە چیای مەتینە نەبینی، گوندی کوڕە مارکە، رۆستکی لە پایینی، پێچوونشێو کونی ئاو، رۆستکی پایینی لا چەپ، داربەڕوو بە هەردوو لای رێگەدا، چیای گارە، گارێ، لای راستو، مەتینە لای چەپ، پێچی نەوی، دووڕیانی بامرنی، 20 کم، بۆ ئامێدی 40 کم، بۆ دهۆك 58 کم.

**بامرنی:**

لە دهۆکەوە 78 کم، لە دامێنی خوارووی چیای ئامێدی، مەتینە، لە دۆڵێکی تەسکدا، بەریکراوە، لە مووسڵەوە 157 کم، لە ئارادنەوە، نیو کاتە بە ئوتومبیل، 1240 م بەرزە، رادەی شێ 57-66٪، وشکی 66-73٪، پلەی گەرمی، لە هاویندا 30 پلە، ئابلۆقە دراوە بە چیای بەرز و رووتەن، لە هەندێ شوێنیدا، 400 خانەیە، ئاووبای سازگارە، باخی زۆرە، فڕگەی هەیە، رێی قیرە، لە سەرسەنگەوە نیو کاتە بە ئوتومبیل. لە دووریانی بامرنییەوە بۆ پردی بەربانگ، کانیکە، رێی قیر، هەوراز، بۆ فڕگە – فڕۆکەخانەی بامرنی، هەوراز بۆ ناو گوند لە دامێنی چیای مەتینە – میتانی، دوای پێچو هەورازی قیرتاو.

**ئارادن:**

ئارادنی ژوورو، ژێری، لەولا بامرنییەوە، لە قەدی خۆراوا، باتیری چیای مەتینە- میتانی، کە زنجیرە چیای ئامێدییە، بەسەر ئاسۆیەکی فراواندا و شیوی سابنەی جواندا ئەڕوانێ، 150 کم لە مووسڵەوە، ئارادنی پایین – ژێری، خرستیانین، بەرزی ئارادنی ژوورو، بالا 1400م، ئارادنی پایین – ژێری 1140م، ئارادنی ژووری، ئوتومبیلی بۆ ناچێ، لە لێژی چیای ئامێدیدایە، لەبەر ئەوە، زۆرکەس بۆی ناچێت، ئارادنی ژێری لەسەر رێی ئوتومبیلە، بەرەو سۆلاڤ – سێلاڤ – سێلاو، رزەو باخ، بەروپشتی گرتووە، رادی شێ 45-78٪ وشکی 67-85٪، پلەی گەرمی 76-99° ف، بەرەوخۆرە، نێوانی هەردوو گوندەکە، هەوارگەخۆشو رازاوەیە، بەهەشتی سەر زەمینە، ئاوی شیرینە، گەرمەکە کاری بۆ بکرێت.

**سەرسەنگو ئاشاو:**

120 کم لە مووسڵەوە، دوای دووریانی بامرنی، پێچو هەوراز، تەختی، گوندی سکرینی، چاخانەکەی، هەشینەو گوندکی، دارچنار، گوندی سەردراڤ نزیکی ئاشاو، هەوارگەیە، 1 کم لە سکرینەوە بە رێی خۆڵدا، نزیکی سەرسەنگە، ئەشکەوتو تاڤگەیە، فرە خۆشە، لە دامێنی چیای گارە، شارێ چیای مەتینە بەو بەرەوە،

دەوەنی پێوەیە، بادە ڕەشکەی خرستیان، سەرسەنگ، دارودرەختی هەر دوولای ڕێی، ئوتێلو میوانگەی گەورە و کۆشکو چاوگی ئاوی سارد، دارو سێبەرو نسێ، سەکۆی خڕی کۆنکریتی لە ژێر سێبەر و کەپردا، بڵاو، بۆ میوان، بەسەر بامرنیو چیای مەتینەدا ئەڕوانێ، 1070م بەرزە، پلەی گەرمی 38 پلە لە هاویندا، لە نێوانی زنجیرە چیای گارەو مەتینەدا، بە سنگی چیای گارەوە، شارێی – گارێی. بنەی بەخشە، فێرگەو تیمارگەو پۆستی تێدایە، خانووی بڵاوی لێکراوە بۆ خێزان، لە نێو دارو درەختدا، دیمەنی رەنەو رازاوە، چاڵاوی مەلە.

ئارادنو دوژی ئامێدی دیارە.

## سەرسەنگە – ئامێدی 48 کم:

پێچی نشێو، تەختی، شیو و هەوراز، لە پشتەوە سەرسەنگ ئەبینی، ڕێی پێدەشت، تەختی، کێڵگەی مەرەزە، گوندی ئینشکی لای چەپ، نەشکەوتەکەی، دەربەندی زۆری چیای گارە وەکو دەربەندەکانی چیای سەگرمە، قۆپی قەراخی سلێمانییە، گوندی قنیش، چاخانەکانی سەر ڕێ، دارودەوەن، لە دامێنی چیاکان، ڕێ بەدامێنی چیای مەتینەدا، کونەئاو، پێچی هەوراز، کەمکەم گوندی بێبادێ، لە دەربەندێکدا، خریستیانن، دارودرەخت لە دۆڵەکەدا، ئامێدی لە سنگی بەردینی چیاوە وەکو دۆژێکی بەرزی قایم، سەخت، خۆیو رۆشنگەکەی وەکو دەفرێکە لەسەر خوانچەیەك، بە ئاسمانەوە، گەشتییەکە، دوژەکەی دوو دەرگای هەیە، یەکێکیان ڕێی ئوتومبیلە، ئەویتر بۆ پیادەڕێیە، لە نێوانی چیای مەتینەو گارەدا لە شیوێکدا، پێچو نشێو بەسەر سۆلاڤدا – سێلاو، هەوارگەیە، لە چەند کونێکەوە، تاڤگەکەی دێتەخوارەوە لە بەرزییەوە، لە گەل چیای مەتینەوە، بەسەر دۆڵێکدا ئەڕوانێ، تەنگوتەسك، دارودەوەن لە دۆڵەکەدا بڵاو لە دامێنی چیا و شیو بەسەر سۆلاڤەوە، دووریانی ڕێکان، بیبۆ، پیادەڕێ 100 کم، ئامێدی.

## ئامێدی – ئەمادییە:

شارۆچکەیە، بنکەی دەفەرەکەیە، 168 کم لە مووسڵەوە، دوژی مەزنو سەخت بە سەنگی چیایەمەتینەوە، 1250 پێ بەرزە، شوێنی 5 هەزار خانووی هەیە، شەقامەکانی رێکنییە، دارودرەخت تەنها لە خانووەکانیدا هەیە، شوێنی فراوانو سەیرانگەی نییە، فێرگەی سەرەتاییو ناوەندی کوڕانو کچانی تێدایە، ئاوی لە سۆلاقەوە بۆ دێت، ماتەری پۆدی کەمە، بۆ نەخۆشی ملەخرێ بەربڵاوە، کاریگەرە، ئامێدی، دوو دەرگای کۆنی هەیە، دەرگای خاوەر، دەرگای زێبارو پاشای زیبك، دووەم، دەرگای مووسڵ ، سەقافا، بادینان، لەم دەرگایە، نەخشونیگاری پاڵەوانان و شاهانی ئامێدی لێهەڵکەنراوە، گورزو چەکیان پێیە، ئەژدەهاکی مەزن خۆی ئاڵاندووە بە دەرگاکەوە، دەرگای ناوشار، دروشمی مار و داڵی پێوەیە، دەرگای زێبار، سوڵتان ئوسمان بەگ، چاکیکردۆتەوە، بە عەرەبی نووسراوە.

رقم سلطان عثمان بک لنا بالمنی أتخذ تأريخه لک ربّ العنا

بە گوێرەی تیپی ئەبجەدی، مێژووی ساڵی کۆچی ئەکاتە 1013ز سەرەوەی رووخاوە، بە تەنیشت دەرگای مووسڵەوە، مرۆڤێ رمی بەدەستەوەیە، نیشانەی هێزە، دەرگاکانی لە داری تووە، بە پلێتی ئاسن و بزماری سەرخڕداکوتراوە، بزمارڕێژە، رمو ئەستێرەی شەش سووچ، بە سەریەوە، دواوەی، بە ئاسنو قوڵفە دائەخرێت... ئەستێرە، 6 گۆشەکە، ئەستێرەی داودە.

لای مەیدان، گۆڕستانی خۆراوای باشوور، شوێنی پەرستگە، ئەشکەوتو پایەکانی، بە تەواوی دیارە، لەولایەوە، بیری دەستکردی لێهەڵکەنراوە، لە چەرخی ئابلۆقە و گەمارۆی میری رەواندوزدا.

گۆڕستانی خاوەری، گۆڕی رەوشەن کچی سمایل پاشایە، 1787ز دروستکراوە، گومەزو خڕگەی بەردینی، بە بەردی تاشراو – نەقارێ، لەسەر دروستکراوە، گۆڕی تریشی لە ناودایە، گۆڕی سوڵتان حسین بەملاوە، تەرمەکەی لە تەختەی نەخشین کیراوە، لاکێشە، گومەزوخڕگەی بەردینی بەسەرەوە، گۆڕێتر لە پاڵیدا، تەختەکە بزماری پێوە نییە، سنگی دارە.

**ڕۆشنگەی ئامێدی:**

106 پێپلکەیە، هەریەکە 35 سم بەرزە، تاکو 40 سم، نێوانی بەردەکانی، جۆشوقورقوشمی تواوەیە، قوچکەکەی چوارگۆشەیە، بەردەکانی لاکێشە 25 × 35 سم، کەمەرەی هەیە، دوای کەمەرەکە، بە لوولەیی هەڵچووە، تاکو تەپلەسەری گومەزییەکەی، میکرۆفۆنی پێوەیە، لە چەرخی میرایەتی بەهدینانندا دروستکراوە، لە گەڕانەوەی ئاشتیدا چاکراوەتەوە.

## پاشەوار:

مزگەوتی قوبەهان لە شێوی نێوانی سۆلافو ئامێدی، شوێنی خوێندنی مەلای جەزیری، خوێندنگەی ئایینی، حەوشو شوورەی چوارگۆشەو فراوان، پایەی بەردی لوولەیی بە گەوتوویی، ئاوخانەو شوێنی نوێژ، لە شێوەی کەوانەییدا.

دوو نهۆمە، پاشەواری مزگەوتەکە بە چاکی دیارە لە بەردی تاشراو، کەوانەیی، قوبەو گومەزەکەی رووخاوە، شوێنی 2 پایەی پێشەکەی دیارە، جێگەی خوێندکار و شاگردو وتنەوەی وانە پۆلی خوێندن، ژوور لەولاوە، پاشەواری ماوە، نووسینی سەر بەردەکانی تیپی پ ، ی تێدایە، رەنگە نووسینی فارسی بێت. لە خوارووی ئامێدییەوە، گوندی ئیبراهیم زلە و هاجی ئەحمەد هەیە.

## ئامێدی – دێری:

4 کم بەپێ، سەرەولێژ بۆ رێی ئوتومبیل، بەلای خاوەردا، پێچی هەوراز، لای خوارەوەی گوندی میرستەك، لابەلا و نشێوی بەرەو دێری لە قورگی دەربەندا تاکو خوارەوەی هەر باخە، تاکو نزیکی رێی بیبۆ، گوندی کوانی لە دۆڵی نێوانی زنجیرەی گارەو مەتینەدا، دێری 6 خانەیە، ئاوی ساردو سازگارە، بەرەوەخوار بۆ گوندی کوانی، تاکو سەر پردی کەلیبا، کەرێی بەهەدینانە... کوانی 50 خانەیە، کانیاوەکانی هەمووی لوولەی هەیە، گوندەکە لە دۆڵی سابنەدا، نشینیانی فەڵەو دیانن.

## ئامێدی – کانیماسی – بەرواریباڵا – 30 کم:

لە سۆلافەوە، هەوراز بەرەو گەلی مزورکا، دوای 1 کم پتر بەلای چاوگی سۆلافدا، کانی کۆنکرێت، چیمەنتۆرێژ، لوولە، بۆ ناو گەلی، پێپلیکەکانی، کاتی خۆی ئینگلیزەکان چاکیانکردووە، کەڵبەی چیای هەردوولا بڵند و قوت، بەرەو ئاسمان، کراوەیی، ئەملای گەلی خەلافە شوێنی کۆچو ئاژاڵداری، هەورازی کوورێ بۆ سەری

ئامێدی، چاخانەکەی، یەکدوو کانیاوی سارد، لێرەوە خانووەکانی ئامێدی دیارە، کۆچو رەوی هاوینە و هاتنەوەی دانیشتوانی بەخشی کانیماسی بۆ سەر زەویو زاری خۆیان، نموونەی بەرجەستەی زیندوویی بزاڤی مەردوومە.

بەرەو سەری ئامێدی 10 خولەکە بەپێ، شوێنی کۆنە کەمپی ئینگلیز، نشێویو پێدەشتو بەردەلانیو داروەوەن پڕوچڕ داربەڕوو، تاتی گوندی هیسێ بەردەلانی، لێرەوە قوتکەی سەر زێری سنوور نزیکی گوندی دۆشنانی ئەدیوی سنوور لە گوندی دووریوە، نزیکە، گوندەکەی مارگریت جۆرج، لێژیو بەردەلانی، دۆڵو پێدەشت، چاخانەی هێسێ، ناوو جۆگەی پشتی، لە کەورگی جیاوە دێت، ناوی تەزییە، بەشی هەموو گوندەکە ئەکات، مەرەزەی لێکراوە، سپینداری زۆری هەیە، ناو گوندی هێسێ 20 خانەیە، 6 کورد و ئەویتری فەلەیەی نەستورین، گوندی خەرابە 8 خانەیە، هەموو کوردن، گوندی یەکمالەی کورد 40 خانەیە، پێدەشتو کێڵگەی مەرەزەو سپیندار، بەلای فێرگەی هێسێدا، کە تەنها خوێندنگەیە لە ناوەندی گوندی هێسێو مێرکاجیو یەکمالە و خەرابەدا... مێرکەجی 3 خانەیە، هەمووی فەلەیە، باخی سێوی زۆرە، چەشنی فەرەنسیو ئەمریکی.

مێرکاجێ، کانیماسی، بەرواریبالا، 10 کم، دۆڵو هەوراز بۆ سەری باسکێ، نشێویو بەردەلانی، دۆڵ لەمەدیوەوە، نزیکی گوندی بێتەنورە، 6 خانەیە، چارکێکە بەپێ لە تڕوانشەوە، کە 85 خانەیە، کەمێ هەوراز بەرەو کانیماسی لەسەر باسکێ، گوندی ئیات، شمایل، ناسیتەنگە دیارن، نشێویولابەلا، دیمەنی رەند، باخی چنار

بەلای رۆسوور، رۆباری سوور، لکی خابور، دێتەوە بۆ زێی لە گوندی بیدوومانی بۆ لای تروانش دێت، لە پردی بولبول، رەتئەبێت، لە بیبۆ ئەرژێتە زێوە.

دوای ئاسیتەنگ، لابەلا، رۆسوور لە خواری، باخی چنار لە شیوەکەدا، هەندێك کۆشك بەو بەرەوە... کانیماسیو برێ لە خانووەکانی، لەمبەری کانیاو، لە رۆسوور ئەپەرێتەوە، پردی لەسەر نییە بۆ ئەوبەری کانیماسی بنەی بەخشن، لە دۆڵێکدا، فراوانو خۆش، سپینداری گەورە لە شیوەکەدا، کۆنەکانیماسی، دێر و گۆرستانی فەلە، بەرەو ئاوایی خۆشو ژیانی کۆمەڵایەتی بەرز، زۆریان رەویان کردووە، لەبەر هۆی تایبەتی..

لێرەوە بۆ هەردوو گوندی رەشکی فەلەو کورد، 20 خانەیە، 5ر2 کم بۆ مائی فەلە و 10 خولەك بۆ مائی کورد، بۆ بیدو 5ر2 کم، لە دۆڵێکدا 200 خانەیە، سەر سنوورە، بازاڕو بازرگانی هەیە... لە پردی رۆسوورەوە بەرەو مائی گوندی گەشمەردە و بەهەشتی ئەنوەرمائی... ئەگەر لە کانیماسیەوە برۆیت بەرەو گوندی دووڕێ بە ناو باخو جۆگەدا، گوندەکە لە قوڕگی گەلیدا، چۆمی پێدادێت، هەوارگەیە ئەگەر بایەخی پێبدرێت، بیری ئیرتوازی بۆ لێبدرێت، رێگەی بۆ چاکبکرێت، لە زاخۆوە کە رێی ئوتومبیلی هاوینەی هەیە، تەنها پردێکی گەرەکە لەسەر رۆباری خابوور.

دێرێکی کۆنی هەیە پتر لە 1200 ساڵە هەیە، دێری مارگورگیە، لە دووڕێوە بۆ شمایل ، قەڵای بێتەنورە بەلای رۆسووردا، پردی دار، گەلی پێپیلکە، بەردەکانی سەریان لەیەکداوە وەکو گەلینبەگ، بانو هەوراز، کەمێ هەوراز، بانی دەشتەگول، نزیکی کانیچوارپی، کەمێ هەوراز، سەری ئامێدیو چاخانەکەی ئەمدیوی گەلی مزورکا و سۆلاڤ ، ئامێدی.

ئامێدی – میرستەك – سپیندار – دێرش... شۆر ئەبێتەوە، گوندی کوانی دەرئەکەوێت لە قوڕگی گەلی سەرەوەدا، نشێوو لابەلا، رێی خۆڵو داروبەرن، چیای گارە لەبەردەمتا، گەلی دێرش دیارە، لە چۆم ئەدەیت بۆ ئەوبەر، سابنە لە خوارەوە، کە لای سەرسەنگەوە دێت، بەرەوە زێی بەهدینان و ئەرژێتە ناویەوە، نشێوی بۆ سەر

سابنە، پردی کۆنکریتی 2 پایە، بۆ رێبوار و دەوار، وڵاخ، باریکەرێو هەوراز، دارودەوەن، تاکو نزیکی سپیندار، بادانەوە بەلای چەپدا، بۆ گوندی مژێ، کانیاوی ساردو چاڵاو، بلوسکی گومەزی چیمەنتۆی کانییەکە، چاڵاوی 12 × 12 م، چنار و داری میوە و باخ، دیمەنی قەشەنگ، هاوار ئەکات کە هەوارگەو زۆزانە، گوندەکە 13 خانەیە، خاوەنەکەی هاجی تەهای برا گەورەی بەهەشتی کاك عیزەت ئەبدولعەزیزە.

بۆ گوندی سپیندارە 1 کم پترە، لە باسکەوە، گوندی گۆهرز بە بناری مەتینەوە، بە بانێکەوە، دیارە... چیای مەتینە، چەند گەلییەکی تێدایە، وەکو گەلی شەریفا، مزروکا، سنجی، سەرگەلی، رەشەوا، کە زێی بەهدینانی پێدا دەرباز ئەبێ، پردی گەلییای لەسەرە، گەلییەکە دیارە، بەودیویدا دەڤەری نهیلەیە، 20 خولەکە بۆ گوندی گرگاش، با ئەدانەوە بۆ سپیندار، خەڵفو، لە ئەمدیویدا، 60 خانەیە، کاتی خۆی 170 خانەبووە، هۆکاری دوورژمنکاریو کارەسات، بڵاوەیانکردووە، فێرگە و مزگەوتی هەیە، خانووەکانی بەردە، کوێخا ئەلی، مەزنیەتی، خێڵی زێباریین، بەلای گۆرستانی گوندا، نشێوێو بەردەلانیو دەوەن، بە پشتی گەلی دێرشدا بۆ سەر جۆم، کە لە چیای گارەوە دێت، هەوراز بەرەو گوندی دێرش، دەراڤی نزیکی گوند، بانو مێرگو گۆم لای راست، نسار و گۆڕ ، ئارامگە و خەوابگەی شێخی ئیسلام شێخ ئەلی ئەحمەد یوسف جافر کوڕی ئەرفەی هەکاری بە شانێکەوە، لە ناو جەنگەڵدا وەکو هەموو ئارامگەو مەزارە پیرۆزەکانیتر کە دارودرەختیان نابڕن، گۆڕەکەی شوورەی بازنەیی، لەبەرد بۆ کراوە، ئارامگە لە ناوەندا، دەرگای نزمی لە بەرد بۆ کراوە، سەری بە بەرد گیراوە، بۆ چوونە دیدەنی، کێلەکانی پەرۆی رەنگین و ئاڵای هەمە چەشنەی پێوەیە بە دەوروبەریدا... ئەم بەرێزە، مامۆستا و فێرکار و ئامۆژگاری مامۆستای شێخی گەیلانی، ئەبدولقادر بووە لە 1018ز هاتۆتە جیهانەوە، دێرشی کردووە بە کونجی گۆشەگیری، سۆفیزمی لە کوردستاندا لەم بەرێزەوە سەرهەڵئەدات، شاگرد و یاری لە هەموو کورنە و گۆشەیەکی کوردستانو دەرەوەدا بووە، لەوانە، لە ناکاری

سۆفیگەریدا: شێخ موحەممەدی مەغریبی، پیرا موسی زیوەیی نزیکی بامرنیو، شێخ موحەممەدی مانی، شێخ موسا، لە هەکاری سالی 1093، بە خاك سپێردراوە.

گوندەکە 22 خانەیە، 2 کم نابێ لە گوندی رەزۆکەوە، لە بن کەفروز زنجیرەی زەنگڵە، لە چیای گارە، پشتەوەی سەختە، شانێك لە بەردەمی گوندا، دێرشی خستۆتە نەدیوی، دارودرەختی زۆر، گەلی بییەی چیای گارەی لێنزیکە، مەلایاسین، مەلای گوندەکەیە... بەلای گۆمێکدا لە بن چیاکەوە، لە باراناو پەیدابووە، لە پایزدا وشکە، نشێوی بەلای کانیاوی بنافو چالاوەکەیدا 9 × 4 م، درەختو چناری بەرز بەرەو گەلی سەخت، پێپیلکە و بەرزیو نزمی، بەرد سەری هێناوەتە پێشی، بەری ئەوبەری گەلی کەفری، ئەشکەوتی حول، بە پێپیلکە بۆی سەرئەکەویت، تووتنی تێدا وشك ئەکەنەوە، دارو چیلکەکانی لەو بەرەوە، دیارە، تەنگی کەم نەبێ، گراوەیی، ئامێدی دیارە، چۆمو هەوراز و نیشو بۆ سەر پردی سابنە، هەوراز بەرەو میرستەك تاکو ئامێدی.

## سلێمانی – دەربەندیخان - 61 کم:

61 کم بۆ کەرەخان، جەلەولا، 120 کم، سلێمانی ، کانیبا، رێی هەڵەبجە، بڵندونەوی، گۆزەرەقە، خەراجیان، بنەی بەخشی ئەربەت، 20 کم، بۆ دەربەند 41 کم. تەختایی، باریکە 70 خانەیە، دزکەرە، لای راستو قازاوا لای چەپ، کانوویل لەسەر رێ، گوندی زەرایەن، تەختی، بنەی بەخش لای چەپ، ئەمدیو و ئەودیو 60 خانەیە، دوو داری قەلان 50 خانە، هەوراز، میرەدێ، لە دامێنی زنجیرەی چیای قلیجەو ئەحمەدبرندە، ئەحمەدبرنەو لە بنار، بەخشی چنارە لای راست، هەوراز، گوندی بیرکێ، کاشتی، تونیلی 6 م 800 م درێژ و بانی سەلیمپرلە، دەربەندخان...

لە دەربەندخانەوە، کانیسارد 150 خانەیە، چەمەرگە 30 خانەیە، لە پێشدا بنەی بەخش وارماولبوو، فەقێجنە چەمەرگە، قلیجە، چنارە، بەم جۆرە دوایی دەربەندخان کراوە بە بنەی بەخش.

رێی بەردەلانیو ناخۆشی، چۆمو دارودرەخت، گوندی نەژدینی 15 خانەیە، لاپالو بنار، بەرەو باوەخۆشێن، نزیکی دێوانەو مەسۆیی، نیوکاتە، باوەخۆشێن،

لەسەرچۆمە، 100 خانەیە، نشێوی بۆ سەر پردو چۆمی دێوانە، بانیخێلان، هەوراز دوای دێوانە 10 خولەك، بە قەدی چیای گولانەوە 200 خانەیە، گوندی ناوبەر بەوبەرەوە، ئەشکەوتی کونەبا 5 کم بە رووی دەربەندخاندا، ستالەکتایتو ستالەکمایتی تێدایە، بەرکەل، پاشەواری مێژوویە، بە دیوی پەیکولێدا 1 کم پترە لە پەیکولییەوە.

ناوەکەی بانیخێلان گەراوە، گۆگردە، ناوی خواردنەوەی کەمە، لە پردی دێوانەوە، کەناری رۆباری سیروان، توونی بابا، گردۆلکە، زنجیرەی بەمۆ، دەربەندەۆرێن، سەرتەك، لای چەپ، بەناو گردۆلکەدا بەرانبەری مەیدان، پێچەکانی ئاوەخوێری، پردی گراوەی گچکە گوندی سەید مەحمود، ئیسایی، بەرلووت، تازدێ، بەردەسوور، بنگرد، گردەگوزین، پردی گراوەی ئاسن، شەمەنەفەری پێدا ئەروات، کەرەخان، جەلەولا.

سلێمانی – دەربەندخان 61 کم، کانیبا، کۆزەرەقە، خەراجیان، ئەربەت، 20 کم بۆ دەربەندخان 41 کم، تەختی باریکە 70 خانەیە، دسکەرە، لای راستو قازاوا لا چەپ، کانوویل لەسەر رێگە، دوای پردی خاکوخۆل، زەراپەن، بنەی بەخش، ئەمدیوونەودیو، 2 داری قەلانی هاجی دارا 50 خانەیە، پێچو هەوراز، میرەدێ لە دامێنی زنجیرەی چیای قلیجەو ئەحمەدبرنەو پێچی نشێو، ئەحمەد برنەو لە بنار نزیکی دەربەندێك، ئازەبان لای چەپ، چنارە لای راست، هەوراز، گوندی سیارە، هەسەنەکارە، لای راست، هەوراز، گۆمی دەربەندخان دیارە، پێچی نەوی، بیرکێ، هەوراز و پێچی نشێو و لابەلا، ناو تونێلی 6 م 800 م درێژ، گۆمەکە بە چاکی دیارە، 120 کم بۆ کەرەخان، جەلەولا، گولالە.

لێژی، شۆرنەبێتەوە بۆ سەر چۆمی دێوانەو پردەکەی، پردی داخراوی ئاسن، لابەلاو نێوانی گردۆلکە، بانیخێلان لای راست بە قەدی چیاوە، پردی چۆمی دەرەدۆین، قەترە، زنجیرە گۆدۆلکە، شینکەو کەوملە، کەناری رۆباری سیروان، لای چەپ، 2 پرد و چۆم، گراوەیی، پێدەشتی پیباز، باوەنور، تازەدێ، لالیخان، لای چەپ، چۆمو پرد، مەیدان لەوبەرەوە، چۆمو پرد، ئاوایی هاجی حەمە فەرەج، چۆمو پردی

قەڵاتۆپزان، چۆموپردی ئاوەخوێڕی، پارپاوڵە، گردۆلکە، لای ڕاستو ، ڕۆبـاری سـیروان لا چەپ، بنەی بەخشی باومنور، پێباز، گوندی قەرەچەم، لەوبـەر سـیروانەوە، ئـاوایی سەید مەحمود، گوندی قولەبەرزو قەڵاتەپ، لەوبـەری سـیروانەوە چۆموپردی خـڕی ژاڵەو گوندی رەند ئەلیخان 47 کم لـە دەربەنـدەوە، ئیسایی بۆ گونـدی زەماوەنگە، 15 خولەکـە، چـۆمو پـردی تـازەدێ 100 خانەیـە، بـەرلووت 120 خانەیـە، خوێندنگـەی هەیـە، گونـدی مسـتەفای کـەریم بـەگی جاف، بەردەسـوور، دەشـتی قەڵاشیروانە، کەلارمکۆن دیارە، 183 گونـد، چۆمو پـرد، کـەلاری نـوێی شارۆچکە، 2 بەخشی هەیە، پێباز و تیلەکۆ 26-11-1975 کراوە بە بەخش، شەقامی زیخ بۆ نـاو شارۆچکەی کەلار، لە کەلارمکۆنەوە سروشتی گەرمیانە، دارخورمای هەیە، پێدەشـتە، بـەرەو گونـدی گۆبـان 17 کـم بـە دەشـتی کرکوبەرینـدا 3 گونـد، سـەیدخەلەف لای راسـت، ئارامگەکـەی دیـارە، قاسماغـا لـە بنـاو گۆبـان، لـە دوورەوە، بـە پـەنا ریـزە گردۆلکەوە، گونـدی گۆبـان 70 خانەیـە، خوێندنگەی تێدایـە، بێ مامۆسـتا، گۆبـانی قەرچیل حەمە ئەمین بەگ.

ئیسایی، زەماوەنگە، 15 کم، بەلای خـڕی ژاڵەدا بـە نـاو گردۆلکەدا، هـەوراز و نـەوی، بـان دووڕیـانی ژاڵەی سـەفەر و چـەمە بیسـمیلا، زەماوەنگـە 90 خانەیـە، بـە هەردوو بەری شیوێکەوە، جافی شاترین، ئاژەڵدار و چێنەرن.

لە تازەدێوە، هەسەن محە، لادانەوە بـەلای کـەناری خـڕی ژاڵەدا، خـڕو چـۆمو هەورازی کەم، هەسـەن محـە 75 خانەیـە، بـە بانێکەوە پشـتی گـردە، سۆفین، جـافی شاترین، مچەشەل چارمکێکە، 30 خانەیە، مزگەوتی تێدایە، ئاوی باشـە، سەرچـۆمە، کانیاوی باشی هەیە، باخ بەوبەر چۆمەوە..

لە نێوانی تازدێ، ئیساوا بۆ قولە سووتاو 180 خانەیە بە لێژییەکەوە، لە سەر سیروانە، لە نێوانی گردۆلکەدا، گوندی گۆڕەشەلە بەوبەرەوە، چۆلە... بەرەو ئیسایی، چالەڕەش، 100 خانەیە، لە سەر سیروان، بە لێژییەوە لە نێوانی گردا، بەرانبەر ئەلیخالە و بانەبۆر، باخی هەیە لەسەر چۆمەکە، مزگەوتی تێدایە... خڕی قەلاتۆپزان، قەلاتۆپزان، لە خڕەکەوە، گرملك بەوبەرچۆمەوە، 10 خانەیە، تەنگی قەلاتەرزان، بە ناو چرو چۆمدا، قەلاتۆپزان، گوندی هاجی برایم شاتری، 50 خانەیە، لە لێژییەوە، لە ناوگردا لەسەر چۆمی بەکربایەف، گوندی مراوا، 2 کەلەشێرە نزیکن، 3 چارەکە، ناوی حەمەکە و کانیشێخ موسا و شێخ ئیسا ئەخوێنەوە.

کەلار، گردەگۆزینە، گێزەکان لای چەپ، شێخ لەنگەری گەورە، شێخ لەنگەری گچکە، بانناسیاو شیوو پردی پێشی قەربولاخی خواروو، کولەجۆ...

بانسنوقو کۆکس، لەولاوە لای راست.

## خانەکین – خانەقین – خان نەقی:

لە بەغداوە 170 کم، لە باقووبەوە، 105 کم، لە وشەی خانی کەیانەوە هاتووە، لە دووڕیانی باقووبەوە بۆ خانەکین 29 کم، پاسگەی ناو دوومان، گوندی دەلۆی رەزابەگو مەلەکشاهی.

خانەقین، شاری رەندو جوانو پڕ پیتوفەڕ، سامانی نەوت لەسەر ڕۆباری ئەڵوەندە، کردوویەتی بە 2 بەرەوە... بەری کۆن، جەلەوە، ئاغاو خەلیفە، ئەمبەری هاجی قەرەیە، بریتیە لە گەڕەکی حەمیدی، ئەبدولابەگ، سالح بەگ، جامع، مەیان، مەزرەعە، هاشمییە، پاشاکۆپری، ئەرکەوازیو تۆڵەفرۆش، لە ناو سنووری شارەوانیدا مۆناتی 150 هەزار کەس پترە.

پردە بەردینەکەی 1860 ز، دروستکراوە، 10 پایەی خشتی سوورە، سیانی ئەوسەری کەوانەییە، کەنیسەی تێدایە، چۆڵە... 25 فێرگەی سەرەتایی کوڕانو 12 کچانە، 2 ناوەندی کچانو 4 کوڕانو 4 ئامادەیی کوڕانو 1 کچانی تێدایە.

لە قزرابات – خوسرەواباد – سەعدییە 7 کوڕانو 1 کچان... لە کەرەخان، جەلەولا – گولالە، 16 کوڕانو 4 کچان... لە خۆرەتوو 12 کوڕان... لە مەیدان 5 کوڕان.

نوسراوخانەکەی 1957 دامەزراوە 4615 نوسراوەی تێدایە، 51 نوسراوەی کوردی، 20 فارسی، 2 ئەڵمانی، 12 فەرەنسی، 209 ئینگلیزی، 30 تورکی، ئەویتری کە 4291، عەرەبییە.

نەخۆشخانەکەی 60 پێخەفی تێدایە، 4 دکتوری پیاو، 1 ژن، 1 دوکتۆری دان، 15 تیمارگەی تێدایە هەموو دەڤەرەکە.

1782 ز، دەرەنەو دەرەتەنگ، بانیزەهاو، سنجەقی قەسری شیرین، خانەقین، خراوەتە سەر میرایەتی قەلاچوالان،

خانەقین، لە سنوورەوە 8 کم بۆ پالێوگە 5 کم، گوندی ئەرکەوازی 1 کم، قۆرەتوو، 37 کم.

جەژنی رەمەزانو قوربان 6 رۆژە، یەکەم رۆژ لە ناو شاردا، دووەم رۆژ لە ئیمام ئەباس لە عەلیاوا، سێیەم لە عەلەمدار، پشتی ئامادەیی کوڕان، چوارەم رۆژ لە باوەمەحمود، پێنجەم لە خدری زندە، شەشەم رۆژ، پاشەلەقەیە.

لە 60٪ ی دانیشتوانی خانەقین ئایینزای جەعفەرین، شیعەن، شێوەی ئەرکەوازیو سوورەمێری نزیکی زاری لوڕییە، زاری باجەلانیو جاف، تاڵەبانی، دەلۆ، کرمانجی ناڤەندە.

گوندە نزیکەکانی، یوسف بەگ، مێخاس، موبارەکە، ئەوبەری ئەلیاوا، کارێز، بانیمیل، مەلیکشاهی.

## خانەقین – قۆرەتوو – خۆرەتوو – 37 کم:

37 کم بەرەو باکوری خاوەر، بەلای تانکی ئاودا، زنجیرە چیای سنوور لای راست KO2 کۆمپانیای ئویل – خانەقین، کۆگای نەوت، گوندی تۆڵەفرۆش لای چەپ، 2 پردی کراوەی ئاسن، شەمەندەفەری پێدا ئەڕوات، رێگەی زیخەلانی، پێدەشت، گوندی مێخاس، یوسف بەگی کاکەیی، گوندی بافلاوی، ئارامگەی باوەمەحمودە، رۆژانی جەژن لێی گرد ئەبنەوە.

رێی تایبەتی لە شەقام جوێ ئەبێتەوە، زنجیرەی راکشاوی نزم، سنوور باشتر دیارە، ملەی کەنار، بە ناو گوندا، ئاوایی دارەکەنار، پردی گچکەو جۆگە، پردی کەندی سیروان، شەقکراوە بۆ خانەقین لای راستەوە، گوندی موسا ئوسمانە، گوندی تازەو سەوزبولاق، فێرگەی تێدایە، گوندی دارەخورما لای راست، کانیزەرد لای چەپ، گردۆلکە و زیخەلان، رێی چەمچەقەڵو قەڵەم کاکەیی، پاسگەی نزیکی سنوور، پێدەشت، گردۆلکە، گوندی حەوشکوری، پاشەواری مێژوویی، پەچەی ئازەڵو شوورەکەی ماوە، فێرگەی تێدایە، رەوەزو گردی بەردین، رکەبەردی نیشتوویی نزم، دەفەری گردۆلکە، پێچو قایم – خۆرەتوو، بنکەی بەخش، ئاوی خۆرەتووی پێدادێت، 2 بەرەیە، بەریکۆنی بەوبەرەوە، رێگەی خۆڵوتۆز، هەوراز و نشیو، لە چۆمی خۆرەتوو ئەدەیت پردی لەسەر نییە، ئاوەکەی لە سنوورەوە دێت، لە خۆڵدا ئەچەقێت، ئارامگە لای چەپ، کەمەکێ زیخەلانیو سەختی، دووبارە لە چۆمەکە

ئەدەیت، هەوراز و پێچو سەختیو زیخەڵانیو تەختی، گردو بەردەڵانی سوورکە، ڕەنگە کانزای مسی هەبێت، دەربەندی گچکە، گوندی گۆڕەشەلە، لەسەر سیروان، گوند لەمبەرو ئەوبەرەوە بە کەناری ڕۆباری سیرواندا، گوندی بانیبۆر، بیری نەوتی داپۆشراو، لای چەپی سیروان دوور دەکەوێتەوە، پێچو نشێوە، چۆمی کەمئاو لە هاوێندا هەوراز و پێچو گردۆلکە، زیخو پێدەشتو چوڵەوانی، گوندی زەلکەی شێخ نوری لە ناو هەردو گردۆلکەدا، بە پشتی گردەوە، گۆڕستان لای چەپە پردی گراوەی گچکە، لە وشکە شیوێکدا، وشکەشیوو پردی گچکە، هەورازو تەختی، زنجیرە چیای بڵند، لەبەردەمتا، گوندی حاجیلەر، پاسگەی شێخ ڕەزا لەولاوە، بەرانبەری پاسگەی سنوور، ئاوی کارێز دەخۆنەوە، هەورازو بەردەڵانی، سەختی، پاسکی شەڵواروشرە، تەختیو بان، وەکو کەشتی هەرد، دەشتایی نەرم لە هەردوولاوە، نشێو و پێچە تاکو سەر ئاوی هەواسان کە دەڕژێتە سیروانەوە، زنجیرە کێوی بەمۆ لای ڕاست، بەودیویدا خێڵی هەڵخانی، پێدەشت تاکو کەناری هەواسان، گوندی کانیکرمانج، لەسەر ئاوی هەواسان، لەمبەرەوە بە ناو ئاوی هەواساندا، هەوراز و تەختی، ڕێگەی خاکوخۆڵ، چەند جۆگەیەك، تەختی بۆ مەیدان، بنکەی بەخشە، گوندەکە لە نزمیدا، تۆفکە لەسەرەوە، فەرمانگە و خانووی میری، لە بانەکەدا... دێتەوە بۆ دووڕیان، هەورازو بەردەڵانی، گوندی هۆرێن لەبەردەمی قوڕگی بەمۆدا، 5 کم بە دەربەندا، هەوراز بۆ سەرتەك، هەوارگەو سازگار، پڕ لە داری میوەو باخ، 1 کم پتر بۆ کانیژاڵەو ئەودیو بەمۆ، گوندەکانی شەمێران و دێهاتەکانی 10 کم بەولاوە، سنوورە، لوتکەی باکوری خاوەری بەمۆ، لوتکەی خۆشکی بەلای دەرەبەندو زەمناکۆدا، ناو دەربەند، 2ر5 کم قەڵبەزەو تاشەبەرد، ڕێگەی سەختو قایم، بە ناو ئاوەکەدا، بە دینامیت چاکراوە، 2 دیواری چیا یەك تاشەبەرد، ڕوو لە ئاسمان، نزیکە سەر لەیەکبدەن، تەسکیو تەنگی، بە ژێر تاشەبەردا، قایموسەخت... دێتەوە بۆگوندی هۆرێن، بە ڕێگەی مەیدانو دووڕیاندا، بادانەوە بەرەو دەربەند بێلوولە، بە ڕێی خۆڵدا، زنجیرە کێوی بەمۆ، لەبەردەمتایە، لە کێوەکە نزیك دەبیتەوە، گوندی شاوازی سووتاو، زیخەڵانی، گوندی باخەهنارە، بە بنارەوە، بە ناو ئاواییدا، لە ئاوەکە دەدەیت، هەوراز و نشێوی تاکو

بێلووله، دەربەندەکەی، بە چارەکێ بە ئوتومبیل بە ناو دەربەندا، کێوی لای راستی، پاشەواری مێژوویی، میلی سەرکەوتن، پەیکەری تیروکەوانهاوێژ، منداڵێك لە ژێر پێیدا، یەکێ بە قەلغانوشمشێر لە سەرەوە، پەیکەری مرۆڤی بەپێوە، وەکو میلی سەرکەوتنی نرامسن لە دەربەندگەوری قەراخ، ئانوبانینی، یاخود ئۆرنیمۆی سۆمەری.

ئەمانە وتەی لەسەرە، ئاو بە ناو دەربەندا، دارودرەخته کانیاوی بن چنار و کونی ختەوە، دێتەخوارەوە، گوندی دەربەند بێلووله، 10 خولەکە بۆ ناو دەربەند، لێرەوە بۆ بنچنارو کونی ختە، 2٫5 کم بۆ سنوور، گوندی نیسکەجار لەمدیو، دروێی رەوەند بەودیودا، گوندی دەروێشی لەسەر قەسرە، پەهوەستی کرمنشایە...
چاخانەی بێلووله، 1٫5 کم پتر بۆ سنوور بۆ گوندی باوێس.

## خانەقین – مەندەلی – بەندنیچین - 88 کم:

88 کم لە باقووبەوە - بعقوبە، 105کم، مەندەلی، مەند، وەستاو، نیـنەوەی-چین – جێگە – جێلێژ، وشەی مەندولێژ، مەند ئەلی، مەنلیتکان لە مرووەوە واتا زۆرە – بەند نێوان.

دوورپان، بنکەی بەخشی کەنعان، لەسەر جۆگەی بەلەدروز، بەرازەروز، 47 کم بۆ مەندەلی، بیابانو چۆڵی کرك، پردی کراوە لەسەر ناوی گەنگیر، وشکە لە هاویندا، لە پێشدا ناوی زۆر بووە، ئاوەکەی میری ئێران لایداوە و دایبڕیوە، شارێکی مێژوویی کۆنە، پاشەواری چەرخی ساسانی تێدایە، وەکو قەڵاسپی، ترساق، لە ناو خێڵی قەرەئۆلوس – قەلەوس، کە چند تیرەیەکن... گێچینە، قەیتول، کونارە، هەواسی، کەپریان، قەڵاسپی، لای گوندی کەپریانە، مۆناتی شارەکە 50 هەزار کەسە، چەند گەڕەکێکە...

قەلعەبالی، قەلعە جەمیل، بازاڕی گەورە، بازاڕی کچکە، بۆیاقی، گەورەترین گەڕەکی شارۆچکەی مەندەلییە، تێکەڵە لە کورد و تورکمانو عەرەب، زۆرینەی کوردە.. لە شادروان، ئاسیاوەکەی وەکو تافگەیەکی گچکەیە، شوێنەکەی کەمێ بەرزە،

باخی زۆرە، دارخورماو دارهەناری هێجگار زۆرە، ملیۆنێ دارخورمای هەیە، شاری ملیۆنێ دارخورمایە..

لە شوێنە ئاینییەکانی، شێخی مەندەل، باوەحافز، سەیرەحمان، شوێنی بابەتایەری هەمەدانی لە گەڕەکی قەڵەمحاجی کاکەیی، بەکتاش، مەزارەکەی رماوە، بازاڕێکی چاکی هەیە، کۆنترین بازاڕی، گوزەری هەواسییە، پەتکو خەراو کڵاشو پیشەسازی دەستی ناسراوە، نووسراوخانەی گشتی هەیە، فێرگەی سەرەتایی، ناوەندی، ئامادەیی کوڕانو کچانی تێدایە، پرۆژەی کارەبای هەیە، ئاوی لە مەنسورییەوە بۆ دێت، بە جۆگە... هەنوکە بێناوە، لە بەلەدروزەوە بە تانکەرو ئوتومبیل ئاوی بۆ دێنن.

مەندەل – باوەگوررزین، ئارامگەو مەزاری پیرۆزی، دانیشتوانی دەڤەرەکەیە لە رۆژانی هێنی مانگی رەجەب ئەچن بۆ دیدەنیو سەیران، لە قەڵەمحاجی کاکەییەوە بۆی ئەچێتە رێی قەزاینیە، بنەی بەخشە قەزاینیە، کوردو تورکمانو عەرەب تێکەڵە.

لە مەندەلییەوە، بە قەڵەمحاجی کاکەییدا 11 کم بۆ قەزاینیە، لای چەپی رێگەی، قەڵاسپی نزیکی گوندی کەپریان، 2 گوندی کوردن، پاشەواری مێژوویی تێدایە، دووریانی گورزەدین، باوەگورزین، ئاوی جۆمی گەڵاڵ، لە پشتکۆوە، دێت بۆ شارۆچکەی بەدرە، رێی بەد، لای راستی قەزاینیە، بە شوێنێکی کەم بەرزییەوە، گۆرزین، خەوابگەو ئارامگەو گۆڕی گەورە، ناوەندەکەی گۆڕی پارسایە، شوێنی حەسانەوەی هەیە، رازموو هەیوانی هەیە، بە چوارلایدا، رۆژانی هێنی و رۆژانی مانگی رەجەب، بۆ دیدەنی دێن، پیرۆزگەیە، بە پارسا ناسراوە، گوندی ئەحمەدی، عەرەبین 20 خانەیە، لەسەر ئەم ئارامگەیە دەژین، خانوو دەدەن بەکرێ، لە کاتی دیدەنیدا.

گوندی دوو شێخ، سەرووی قەزاینیە، لەسەر جۆمی گەڵاڵ بە زاری لوڕی ئەدوێن، شوێنەکەی تۆزێ بەرزە، لە قەزاینیەوە، نزیکە، قەزاینیە بنەی بەخشە، 2 گەڕەکە چاییو سەرای.

لە خانەقینەوە بۆ مەندەلی، لەرێی نەوتخانـەوە کاتونیوێك دوورپـیان، گونـدی پەڵکان، هەورازونەوی، گوندی کانیماسی، پەنچنەلی، چەمەنەوت، قەشقە، مەکەتوو، بە بەرزییەوە، پاسگەی پۆلیسە، لێرەوە مەندەلی دیارە، کانیاو قامیشووقەرەم، گوندی گێچینە، گونـدێکی مەزنـە، گونـدی چـەرمەوەندی، کۆنـارە، پەنکۆکـە، نەگەیتـە مەندەلی.

خێڵی قەڵەوس، چەند تیرەیەکن، گێچینە، قەیتول، کۆنارە، هەوامی، کەپریان.

## خانەقین – نەوتخانە:

لە دوورپیانەوە، شەقامی قیر، پێدەشتی کراوەی کۆزەرەقە، گردۆڵکە، گونـدی پەڵکانـە، لای راسـت لـە پـەنا گـردا، نشێوێو هـەورازو نـەوی بـە نـاو چـینی گـردی نیشتوویدا، لوولەی نـەوتی راکشاو، لای رێگـە، پـردی ئاسیاو، گونـدی کانیماسـی لای راست، زنجیرەی چیای باغچە، ئەودیوی سنوور، خێڵی سـنجابی، بـەهاران دەیکـەن بـە هەوارگـە، خـڕی میلوگـۆم، شـوێنی پەنجنـەلی نـاوگردو بـەردەڵانی، خـڕی نەوتشـا و نزمـایی ئەوبـەری کانیخاسـان، نەوتنخانـە، بـە بەرزییـەوە، بـیری نەوتـە، بـە لوولـە دەبرێـت بـۆ پاڵیوگـەی وەنـد، پاڵشـگە 1932 دامـەزراوە، دوای 1958 بـووە بـە دامـەزراوی مـیری 27 کـم لـە نەوتخانـەوە دوورە، 340 کارگـەر و 63 کارمەنـد، لـەم ژمارەیە 10 ئەندازیاری تێدایە.

بەرهـەمی 380-430 هـەزار گـاڵۆن نـەوتی هەیـە، لەمـە 20٪ بـەنزین، 20٪ کیرۆسین، 18٪ نەوتی سپی، 9٪ تـاکو 11٪ گازۆئیلـە، 40٪-45٪ نەوتیرەشـە، 50٪ کەمتر نەوتو قیرو گازە.

نەوتشای ئـەودیو سنوور، زەوییـەکانی نزمـە، ئەوبـەری نەوتخانەیـە، نزیکـە، نەمبەرونەوبەرن، چۆم لە نێوانیاندا.

**کەرکوك – بەغداد 260 کم:**

شەقامی بەغداد، وێستگەی تەلەفزیۆنی کەرکوك، بەخشی تازەخورماتوو، 20 کم، بۆ بەغداد، 240 کم، زەوی نەوتی جانبۆر، 230 کم دەمێنی، گوندی تەمموز، پردی گچکە، نزیکی داقوق، تاوغ، 163 کم بۆ دەڵتاوا - دەوڵەتاوا، خالیس، 220 کم بۆ بەغداد.

تاوغ – داقوق، گۆڕی زەمینەلعابدین، گۆڕستانو ئارامگە، پردی درێژی گراوەی داقوق، 2 پرد، یەکێکیان درێژ، بەرەوە دوز، 190 کم بۆ بەغداد، 133 کم بۆ خالیس، دەڤەری دوزی ئاوەدانو حەساوگە و چاخانەکانی، پردی ئاقسوو، ئاوەسپی، ڕۆخانە، 1962 دروستکراوە، پردێکی درێژە لە نزیکی دوزە، 180 کم بۆ بەغداد، 123 کم بۆ خالیس، دووڕیانی کفری ، ڕێی خوڵە.

لە کەرکوکەوە بۆ کفری 120 کم لە دووڕیانەکەوە، 37 کم بۆ کفری، دوای سلێمان بەگ... لە دووڕیانەوە، پردی قوریچیا، وشکەچۆم، بۆ قاهیرە، تەلنەخزەر، کنگربان، کارێزەی دەلۆ، پێچ، کفری... دێینەوە بۆ پردی سلێمان بەگ، شەمەندەفەر بە ژێریدا دەڕوات، بەخشی سلێمان بەگ بەملادا، ئاوی بیر بەکار دەهێنن، 170 کم بۆ بەغداد، 113 کم بۆ خالیس.

دووڕیانی ئامرلی، پردی درێژ، پاسگەی کێوی هەمرین – هامرین، زەوی گردۆلکەیی نامێنی، 140 کم بۆ بەغداد، 83 کم بۆ خالیس، پاسگەی ئینجانە، ناوچەی گردۆلکەیی بەجێدەهێڵی، بەرەو عزیم، حەساوگە، 130 کم بۆ بەغداد، 53 کم بۆ خالیس ، دەڵتاوا، 67 کم بۆ بەغداد، لە ڕیگەی نوێوە، 57 کم بەخشی هەبهەب، ڕێگەی جیزانی ئیمام، غالبییە، راشدیە، تاجی، عیوازییە، بەغداد.

## مووسڵ – تەلەعفەر – شەنگار – سنجار:

126 کم ڕێی قیر، کوورەگەچ لە هەردوولاوە، گۆڕستانی مووسڵ، بڵندو نەوی، دووڕیانی کارگەی چیمەنتۆ، پێشی دووڕیانی بادۆش، وێستگەی شەمەندەفەری سابرینیە، گوند و ئاوایی لە هەردوو لای ڕێگە، دووڕیانی زممار، گوندی ئەبوماریە، دووڕیانی تەلەعفەر، تەل عەفەر، شارۆچکەیە، 69 کم لە مووسڵەوە، بۆ سنجار، 57 کم تەلەعفەر، لەسەر دوو گردە، شیو لە نێوانیاندا، لە هاویندا وشکە، پردی کراوەی گچکە، هەردوولای بەیەکەوە بەستووە، بەری ئەوبەری ئاوەدانە، بازاڕ و فرمانگەو فەرمانگە و فێرگەو تیمارگەی تێدایە، پرۆژەی ئاو، لە پێشی شاردا نەبینی، پرۆژەی کارەبای هەیە، ماوەیەکە لە ڕۆباری دەچڵەوە، ئاوی بۆ هاتووە، خانووەکانی بەردو گەچە، وەکو خانووەکانی شاری کەرکوکە، باخی گەورە، لە خوارووی شارەوە، بەرەو پشتی شارەکە سەوزییە، کشتی کەمە، لەبەر بێئاوی.

## تەلعەفەر – سنجار – 57 کم:

لە گوندە عەبرەی گچکەوە، عەبرەی گەورە، دانیشتوانی تورکمانن، لە خێڵی ئالیبەگ، گوندی عەیزولای تورکمان، گوندی سینو، باخو فێرگەی هەیە، دووڕیانی بەخشی سنون، گوندی عەینو شەبابیت، پاسگەی سەرڕێ، ڕێی قیرو تەختی چیای رووتەنی شەنگار ئەبینی، لە دامێنەوە، گردە نزیکەکانی، گوندی ئیزدییە وەکو: خان دوای بەسێخان گوندی هەممەدانی ئێزدی، هی خدر حەسۆ، لای چەپ گوندی سۆلاغ لای راست، یەکێکیان لەسەر گردێ، باخو ئاوی سازگار و شیرین، گۆڕستان پێشی شەنگار.

شەنگار – زەنگار – شەنگال - سنجار، بنەی شارۆچکەیە، لە سەر گردە، خانووەکانی بەردو گەچە، فێرگەی سەرەتایی، ئاوەندی تێدایە، کوردی ئێزدین، کەمێ خریستیانی، باخو چاوگی ئاو، لە خوارووی شارەوە، گەڕەکی پیرزەکەر، گۆڕی زەینەب کچی عەلی کوڕی ئەبی تالب (د.خ).

گەڕەکەکانی: بورج، ئێزدییە، بەرۆژ، بەرسەهی، سەرایە.

## سنجار – کەرسی – 85 کم:

سنجار، گوندی مامیس، بە پێ لە چیاکەوە، 40 کم بەلام بەرێی ئوتومبیل، 2 کاتە 85 کم.

**گوندەکانی گەلی گەرسی:**

1- ئەتو، تەلحەمدین، شامیکا، مامیس، بەخشی پێشوو، مەلاك، سمیهێستر،

2- شیشمس، شێخ شەمس، نزیکی چنری، لە خۆراوای گەلی،

3- شێخ مەند، نزیکی حەلیفی، خاوەری ئارامگەی شیشمسە،

4- ئامادین، نزیکی شێخ مەندو باشوری،

5- خاتووفەرخە، مەزنی مندالان، لە ناوەندی گوندی حەلیفەدا.

دیدەنی ئارامگەکان: لە ناوەندی وەرزی پایزدایە، هەمووی شێوە گومەزیو خرگە، لە بەردو گەچ دروستکراوە، هەموو سالێ سپی ئەکرێتەوە.

**چاوگی ئاوەکانی گەلی:**

کەهێنا زووری، لە گوندی مامیس.

* کەهێنا دمعدوش لە گوندی مەللەك
* کەهێنا پیراخایی، پیراخایا لە گوندی کولکان
* چرالا حاهەیسی، حاهیسی لە گوندی مامیسە
* کەهێنا حتو – حتو لە گوندی مامیسە

**پاشەوار:**

* گۆڕی گۆن، نێزدی نین، ملکی توربا.
* دێرەفەلەها، بەرانبەر گوندی مەللەك، پاشەواری دیارە.

**بەرهەم:** لە نزیکی مامیس، خەڵوزی بەردی هەیە و بەکاردەهێنرێت، لە لایەن شوانەکانەوە... لە گوندی مەللەك، سمیهێستر، کولکان، دارهەنجیر و هەنارو سێوو قۆخو هەڵوژەو قەیسی، رەزی مێو، زۆرە، داری میوەی تریشی هەیە... تووتن، تەنانەت درەختی بۆ ئەبرن بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگیرێت... داری جەنگەڵی، بەروو، گوێز، قەزوان، چەقالەی هەیە.

رێی ئوتومبیل، لە سنجارەوە تاکو سەنابیت، قیرە، لێرەوە تا براتە، قیری باشنییە، لە براتەوە بۆ سنوونی قیرە، لە سنوونییەوە بۆ مامیس، ئاو گەلی، قیر نییە، پێچەو شاخاوی، ئوتومبیلی پێدا دەڕوات، دوای مامیس ئوتومبیل ناڕواتە بیراخابا و مەللەك... ئەم ماوەیە 4 کم بەپێ. لە پێش گەلییەوە تاکو مامیس 2 کم، بەپێ، 15 خولەکە، لە مامیسەوە بۆ مەللەك 15 خولەکە، بۆ بیراخابا 25 خولەکە بە پێ، 2 کم نابێ.

بە بارانو کانیاو، زەوییەکان ئاودێر دەکەن، لافاو جۆگەکانی تێکدەدات، لە دەفەری کەرسی، قەیدی بە تایبەتی ئاوی چاوگی بیراخابا، دەرژێتە چاڵاوێکی گەورەی قووڵەوە 1٫70 م، لە هەموو ئاوە کانی خۆشترە، لە هاویندا ساردە.

**هەواگەکان:**

ئەم گوندانە هەوارگەن، مامیس، بیراخابا، گەرەکی، رێی چاکردنە بۆیان لە چیاکەوە، زۆر نزیکە، گازینۆو ئوتێلی بۆ دروستبکرێت لەسەر رێگەکە، داربڕین قەدەغەبکرێت.

جێگەی تریشی هەیە بۆ دیدەنی، سەیرانگە، وەکو: دێرناسی، 5 کم لە سنجارەوە، بەدەمیان خانووی لە بەرد تاشراوی تێدایە لە چیاکە، بە شێوەی ئەندازەیی، جگە لە ئەشکەوتی، قرچراغ، وەکو ئەشکەوتی جعیتای لوبنانە، بێروت،

ئاو لە سەرییەوە دێتە خوارەوە، کۆتاییەکەی نازانرێت، نیشتنی ئاو کاریکردۆتە بەردەکانی، شێوەی رەند و رازاوەی وەرگرتووە، بە کرداری کردگاری ئافەرین، سروشتی هێجگار پەسەند.

## هەولێر – دیبەگە – کەندیناوا – مەخمور – 70 کم:

هەولێر، دیبەگە، کەندیناوە، 42 کم، لە گەرەکی ئازادییەوە، بانەداتەوە بە شەقامی قیردا، گلو زیخ، گوندی قورپتان، لە پێدەشتی دێمدا، کوورە خشتەکان، رێی خاکو گڵ، گۆرستانی ئاغاکان، ئارامگەی پیرداود، گوندی پیرداودی نزیکی... بەرهەمی سەرەکییان دانەوێڵەیە، گوندی مەنارە، زورگی دیبەگە، بەرزیو نزمیو پێدەشت، بنەی بەخشی دیبەگە، کەندیناوا، خانووی قورِ و دواکەوتوویی، ئاو گوند قیرتاو و لێژە، کارەبای نییە، ئاوی کارێز و بیر دەخۆنەوە... دیبەگە، کەندیناوا، مەخمور، 25 کم، دەشتی کەندیناوا، گوندی کەندالّی چوول، هی سمایلاغا، هەوراز، چاخانەی مامەیێنی، دەربەند بازلرگە، لە چیای بەردینی رووتەنی، قەرەچوق، لێرەوە مەخموور دیارە، مەزاری برایماغا، خاوەنی دوژی برایماغا لەسەر گردێکی نزیکی شارۆچکەی مەخمور، دیارە، دەشتی قەراج، مەخمور.

مەخمور، بنکەی دەفەرە، مۆناتی 3 هەزار کەسە، فێرگەی سەرتایو ناوەندی تێکەلاوی تێدایە، شەقامەکانی قیرە، لۆکنتەو چێشتخانەی تێدا نییە، لە کەناری چەپی زێی گچکەیە، 18 کم، پرۆژەی ئاو لە زێوە بۆی دابین کراوە، کارەبای هەیە.

## کەرکوك – دووبز:

لە ئەرەفەوە، کۆمپانیای کارگەی خشتی ئۆتۆماتیکی، دووریانی فەتحە، گوندی باجوان، قەرەهەنجیرە، گوتان، قوشتایە، قەرەدەرە، دووبز، گوندی نوێ، خانووی باش، شەقامی قیرو رێك، خانووی کارگەر و کارمەندان، بنەی بەخشە، دەپەرێتەوە بۆ ئەوبەر، پردی درێژی ئاسن لەسەر زێ، رێگە، لێرەوە بۆ پردی ئالتونکۆپری، بەندەکە 10 خولەکە لە بنەی بەخشەوە... لە کەرکووکەوە بە ئوتومبیل نیو کاتە 30 کم.

**مووسڵ – بەغداد:**

398 کم، زاکە، کارگەی چیمەنتۆ، گوندی عەریج، دووڕیانی حەمام عەلیل، 2 کم، گوندی سەفیتوت، بەرانبەر نەمرود، ڕێژەنی زێی، مەخلەت، گردەکانی ناسر، گەیارە، پاڵێوگە، لەسەر ڕێگەی شەمەندەفەر، دووڕیانی حەزەر، ئورگبە، کۆشکی مشعان فەیسەڵ، بەخشی شرگات، دبز، بادیە و چۆڵیو بیابانی دوورگە، ڕێی بەد، دووڕیانی بێجی سەر بە بەغداد، تکریت، بەنداوی سەرسار، دەرگاو بەنداو، بۆ کەمکردنەوەی مەترسی لافاو بۆ سەر بەغداد، بۆ کۆکردنەوەی ئاو، بۆ هاوین، سامەڕا – سامڕێ شارۆچکەیە.

سامەڕا – سامڕێ 122 کم لە بەغداوە، ڕێی قیر، لە باکوری بەغداوە، گۆڕو ئارامگە و خەوابگەی پیرۆزی پێشەوا، عەلیهادی، حەسەن عەسکەری، نرگز خاتوونی خێزانی حەسەن عەسکەری، حەلیمەخاتونی خوشکی پێشەوا عەل هادی کچی پێشەوا جەوادی لێیە... قوبەی زێڕو خڕگە و 2 ڕۆشنگە، قوبەکانی زەرکەشە، پەیکەری سەرباز لە بەردەمیدا.

پرۆژەی سەرسار 2 کم لە سامەڕاوە، 270 کم بۆ مووسڵ، سامەڕا لە چەرخی موعتەسەم کوڕی هارونە ڕەشید، کرا بە پێتەختی جێنشینانی ئەباسی، لە کۆشکی ئاشتی، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ بەغداد، ڕۆشنگە و پێچۆکەکەی نزیکی مزگەوتە کۆنەکەیە، ئەچێتە ناو شوورەکەوە، ژوورەکانی نەماوە، شوێنی نوێژگەی ماوە، 2 دەرگا لەملاو لەولایەوە، ئەمە مزگەوتی موتەوەکیلی ئەباسییە 849 ز دوژەکانی دەرەوەی کە بە شوورەی مزگەوتەکەومیە، دروستکراوە، دیواری شوورەکە 2 م پانە، 10 م درێژە، بە پێپیلکە سەر ئەکەوێت بۆ بنکەی ڕۆشنگە پێچۆکەکە پێپیلکەکان 2 م پانە، بەرزییان لەیەکەوە5 سم، 50 سم پانو 2 م درێژە. لە خشتی سوور دروستکراوە، تاکو سەر ئەکەوێت بەرزی پێپیلکە ئەبێ بە 7 سم، تاکو ڕێڕەوی دوژەکە پێپیلکەکان تەسك ئەبنەوە، پێپیلکەی سەرەوە سەری گیراوە وەکو تونێل، کونی هەیە، لووتکەکەی بازنەییە، تیرەکەی 5 م.

دوژمکــــە لــــە دمرەوە، کەوانــــەیی بەچاڵداچــووە، جێنشــینان بــە ســواری ئەســپ، سەرکەوتوون، 9 پێچە، بە بنکەکەیەوە، دیواری شــوورەکەی چــەرخەی چــەماوەیە، مزگەوتەکــە شوێنی بەرزە، بەلای کۆمپانیای دەرماندا، بۆ لای مزگـەوتی ئـەبی دەلـەف، تاقـەکانی بـەرز، سەری مـاوە، 10 م درێژ لـە بەرزاییدا، لـە سەر رۆبـاری دەجلە، پاشەواری شووره و کەلووی دوژمکە، مـاوە، ماوەیەکی فراوانی هەیە، پشتەوەی خانووە.

کۆشکی ئاشق، لە بەرزاییدا، لەبەری ئەوبەری دەجلە، کۆشکی فـراوان، ژووری زۆر، نهۆمی خوارەوەیـو دیوارەکـانی نهۆمی سـەرەوەی رووخـاوە، پێپیلکـەکانی بـە کونێکدا ئەڕوا، کەلووی دوژمکـەی لـە کۆشـەکاندا، ڕێڕەوەکانی، لێـی سـەرئەکەون بۆ ژوورەکان، لە دەرەوە، کۆڵەکەو پاڵپشتی دیواری شوورەکەی ماوە.

## سارمەڕا – بەغداد – 122 کم:

پـرۆژەی سەرسـار و پـردی سـەر بەنداوەکـە، کارەبـا، بـەرەو بەلـەد 6 کـم لـە ڕێگەکەوە، بـەرێکی هێڵی ئاسن، لای راست، شـەمەندەفەری رێـی مووسـڵ، تارمییـە، تاجی کازمییە، ، ئەعزەمییە، بەغداد.

## بەغداد – سەلمانپاک – 31 کم:

باشوری بەغـداد، ڕێـی کـووت، پـردی دیالـە، سـەلمان، بنـەی بەخشـە، ئارامگـە و خەوابگـەی سـەلمانی فارسی، حەوشی فـراوان، گۆڕ لـە ناوەنـدا، ناوەنـدی شارۆچکە، فلکـەی هێلکـەیی، گۆڕەپـان، فـوارەی ئـاو، لـە چـەرخی موستەنیسـردا، ئارامگەکـە دروسـتکراوە لـە تـەك مزگـەوتی موستەنسـیرییە، تاقیکیسـرا، بـەرزو قـایمو پتـەو، سـەیرانگەو دیـدەنی... تاقیکیسـرا، 30 کـم باشـووری بەغـداد، پاشـەواری ساسـانی، بـەرزی 30 م، درێـژی 148 م پـانی لـە خـوارەوە، لـە بنکـەوە 7 م، چـەرخی 3 ز،

تیسەفۆن لە کەناری دەجلە، باشوری خۆرهەلاتی بەغداد، بریتی‌بووە لە سلوقییەو تیسەفۆن، خێوەتو رەشماڵی خێڵەکی عەرەبی، ئەریتو رەوشی رەسەنی کۆنمان دێتەوە یاد، چاخانەی میللی، شەقامو دار و درەخت، لە هەردوولایەوە، پارکەی منداڵان، دیمەنی رەندو دلگیر، پەیکەری نافرەت لە بەردەمی تاقەکەدا، پەرژینی تەل چنراو، کۆڵەکەی کۆنکریتی، بە پەرووپشتیدا.

## بەغداد – کەربەلا - 98 کم:

کۆری ئەسر، دووریانی فرگە، 17 کم بەخشی یوسفییە، پاسگەی حورییە، شارۆچکەی مەحمودییە، دووریانی گوندی 14 تەمموز، کارگەکانی ئەسکەندەرییە، سنووری ئوستانی بابل، حەسرە، دووریانی حیلە، بەغداد، 95 کم، بەنداوی هیندییە، بەرێکی هێڵی ئاسندا شارۆچکەی موسەیب، لا ئەکاتەوە بەلای راستدا، پرد 110 کم بۆ نەجەف، 23 کم بۆ کەربەلا، بە ناو باخی خورمادا، دووریانی حسێنییە و پێشەوا عون، ئارامگەکەی لە یارانی پێغەمبەر بووە (د.خ). بەناو زەویو باخدا، خاکی کەربەلای پیرۆز، گۆرەپانی ئەتەق، ئەبوزەری غەفاری، پێشەوا عەلی کۆڕی پێغەمبەر، ناوەندی شار، شەقامی حەرەمەین، نێوانی خەوابگەی پێشەوا حسێنو عەباسدا... دووریانی نەجەف، گۆمی رەزازە، کۆشکی ئەخێزری مێژوویی، کۆشکی رێی نەجەف، ئارامگەی حسێن.. ئەو 7 گەشەردەیەی لە تەکیا بە بەهەشت شادبوون... قاسم کوری حسێن، هاوکارییو لە جەنگی ئەتەف عاشورا، 10 مانگی موحەرەم سالی 601 لە تەك سەرداری خێڵی بەنی ئەسەد، حەبیب کوری مەزاهیر ئەسەدی، کوڕانی حسێن، عەلی گەورە، ئەبدولا، کۆرپەی نێژراو لە رێی حسێندا، شمری کوری زیجەوشەن، کوژەری پێشەوا حسێن د.، سەری بە شیر لە لاشەکەی جودا کردەوە... چیرۆکی ئەم کارەساتە، ولتای زۆری لەسەرە، بە تایبەتی لە سەر کەللەی حسێن، د. هەندێك ئەڵێن لە شامە، یا لە قاهیرە، یا لە کەربەلا، دوای 40 رۆژ هێناویانەتەوە لای لاشەکەی...

سەحەنەکە چەند دەرگایەکی هەیە، دەرگای قاضی الحاجات، القبلة، الكرامة، هەیوانەکەی میری دروستیکردووە، سەحەنەکە، لە چەرخی بوەیهیدا کراوە،

1200ز، قوبە و خرگەکانی زەرکەفتی زێـڕن، دوڕ و لوءلوء لە ناوەوە، ناوی 12 پێشەواکەی لەسەرە:

| | | لەدایکبوون | کۆچکردن |
|---|---|---|---|
| -1 | پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالب | 13 رەجەب | 21 رەمەزان |
| -2 | حەسەن زەکی | 15 رەمەزان | 7 سەفەر |
| -3 | حسێن بەهەشتی | 3 شەعبان | 10 مەحەڕەم |
| -4 | عەلی سەجاد | 5 شەعبان | 25 موحەڕەم |
| -5 | مەحەمەد باقر | 1 رەجەب | 7 زیلحەجە |
| -6 | جەعفەر سادق | 17 رەبیعی 1 | 25 شەوال |
| -7 | موسا کازم | 7 سەفەر | 25 رەجەب |
| -8 | عەلی رەزا | 11 زیلقەعدە | کۆتایی سەفەر |
| -9 | موحەمەد جەواد | 10 رەجەب | کۆتایی زیلقەعدە |
| -10 | عەلی هادی | 2 رەجەب | 3 رەجەب |
| -11 | حەسەن عەسکەری | 8 رەبیعی 2 | 8 رەبیعی 1 |
| -12 | مەحەمەد مەهدی – الحجە القائم | 15 شەعبان | زیندووە |

## گۆمی رەزازە:

18 کم لە کەربەلاوە، بەلای هێلی ئاسنندا، گەرمکی تەعلیبە گۆڕی حوررەیاحی، دووریانی کۆشکی ئەخێزری مێژوویی، دەریاچەی ناوبیابان، گازینۆی ناو ناوو کەنارەکانی، لەمو ورد و بەردی نیشتوویی، سەیرانگە، با لە خۆراواوە بەسەریدا دێت، فێنك، بە پێچەوانەی دەریاچەی حەبانییە، سوێری زۆر ئەبێ، لەبەر کەمی ئاو، ئەبێ بە هەڵم، کزی رێژگە، دەفەری سوێرەکاتە.

**کەربەلا – نەجەف – 85 کم:**

شەقامی قیر بەلای خانە کۆنەکەدا، کە حەساوگەی کاروان بووە، لە کاتی خۆیدا، خانی حەماد 35 کم، ئەمێنێ بۆ نەجەف، 100 کم بۆ دیوانییە، قادسییە، پشتێنەی سەوزی شاری نەجەفی پیرۆز، النجف الأشرف، گۆڕی خانوو لەسەرکراو، حەساوگەی نەجەف پێشی شار، شەقامە سەرەکییەکانی، فەرمانگەکان، چەقی شار، وشەی نەجەف، وللە مۆم، رۆشنایی، ئارامگەو خەوابگەی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالب (د.خ)، خرگەی بلندی زەرگەش، چەرخی بوەیهی دروستکراوە، 1200 ز، بەخشی کفل، ئارامگەی موسلیم کوڕی عەقیل کوڕی ئەبی تالبی تێدایە، مزگەوتی کۆن، شەقلی کۆنو نوێی پێوەیە.

**کوفە:**

پێتەختی جێنشینی ئیسلامەتی بووە، لە چەرخی پێشەوا عەلی (د.خ)، بەر لەوە ئوستان بووە، لە چەرخی عومەر کوڕی خەتابدا (د.خ)، سالی 17 ك – 628ز، دروستکراوە، بە فەرمانی ئەو شاری کوفە و بەسرە بناخەی دانراوە، کۆشکی میرێتی، خانووی جێنشین لە پشت مزگەوتەکەوەیە، مزگەوتەکە 18 × 7 م، ساختمانەکەی کۆنە، نوێکراوەتەوە لە لایەن حاجی ئەبود شەلاشەوە، 1370 ك – 1950 ز، گۆڕی مزگەوتەکە، فراوانە، ئارامگەکە، لە گۆڕی دووەمدایە، ڕێڕەو هەردوو گۆڕەپانەکەی بەیەکەوە بەستووە، راڕەوەکە، رۆشنگەی لەسەرە.

موسلیم کوڕی عەقیل، نمایندەی حسێن بوو (د.خ)، لە کوفە کوژراوە، گۆڕی موختار کوڕی ئەبی عوبیدەی سەقەفی، یارمەتدەری حسێن بووە (د.خ) لە نزیکی ئارامگەکەیە، لە ناوەندی سەحنەکە، کۆرەکە، چالاییەکی هەلکەنراوی تێدایە، گومانە، کە کەشتی نوح لێرەدا وستاوەتەوە، لەوبەری ئارامگەکەوە، تەرمی راکشاوی هانی کوڕی عروەیە... دێتەوە بۆ پردی کوفە، لەسەر ئاوی فورات، ڕێی حیلە، بەخشی کفل، حیلە، پاشەواری کیش، مەحاویل، گوندی نوێ، لەتیفییە، مەحمودییە، دووریانی فرگەی جیهانی، مزگەوتی ئوموتبول، گۆڕی نسور، بەغداد.

**بەغداد – کوت، 171 کم - بەسرە، 545 کم:**

پردی نوێی دیالە، زەوی سازکراو بۆ کشت بەشێوەی یاسای پەخش - بەزل، دووریانی سەلمان، 9 کم، بۆ سەلمان 22 کم لە بەغداوە پرۆژەی مرداری POULTRY سوێرە، 13 کم، جەعفرییە، باخەکانی، مەڵبەندی تەندروستییەکەی، بەخشی عەزیزییە، پێشەوە رازاوەکەی، بە ناو عەزیزییەدا، شەقامو فرۆشگە و چاخانەو فەرمانگە، لەسەر کەناری دجلە، 85 کم، لە بەغداوە، دووریانی پرۆژەی واسیت، دووریانی زبێدییە، زەوی بەکەڵك، دەبونی، مەڵبەندی تەندروستی 85 کم، دووریانی نەعمانییە، 8 کم، دووریانی بەدرە، 171 کم، پاسگە، 5 کم بۆ کوت، بۆ ناسرییە، 179 کم کوت، بنکەی نوستانی، واسیت، 171 کم لە بەغدادەوە، مۆناتی 290 هەزار کەسە، بۆ عەمارە، 196 کم.

کوت، عەمارە، 196 کم، بە زەوی کشتوکاڵدا پاسگەی جەبابە، لەوەرگە و کێڵگەی گەنم، نزیکی کەناری دجلە، چاندنگەی شێخ سەعد و بنکەی پەخش، دەفەری عەلی غەربی، بەخشی عەلی شەرقی، کمیت، شاری عەمارە، میسان، لە بەغدادەوە 394 کم ، پێشی شار، دووریانی شارۆچکەی مەیمونە 8 کم، لە عەمارەوە، لە دووریانەوە، 23 کم بۆ بەسرە 179 کم، پردی مشرەح، پردی کەحلا، کێڵگەی قامیشی شەکر، بۆ قەلعە سالح 44 کم، شارۆچکەی قەلعە سالح، عزیر، شارۆچکەی قورنە، پردەکەی، داری ئادەم، چەقاندنی سەرەکی پاشەواری بەهەشتی ئەدەن EDEN GARDEN لەسەرزەمیندا، ئیبراهیم خەلیل، نوێژی تێدا کردووە 2000 پ.ز، لێرەوە بۆ جبایش 45 کم، لە عەمارەوە، 107 کم، کۆمپانیای پەرە، گەرمە، پردەکەی بەسرە.

**بەسرە – سەفوان 48 کم:**

بۆ کوێت 168 کم، بۆ زبێر 20 کم، بۆ ئەبوخەسیب 19 کم، بۆ بەغداد 545 کم، بۆ فاو 105 کم، بۆ ئەبادان 45 کم.

بەسرە، ئەبوخەسیب، 19 کم، بە ناو باخی خورمادا، پردی خۆرە، خێزاوو نیشتاوی بەکەڵك، ئەبوخەسیب کوڕی مەنسور متوەکیل، فەرماندەی موعتەسەم، لە رۆبار دەپەڕیتەوە، حەمدان، حەمزە، سلیبیات، پردی دەرگا سلێمان، رێی قیرنەکراو، خانووی حەسیر، سەریفە، نشینیانی ناو باخ، ئەبی مەغیرە، مەڵبەندی تەندروستی، بازاڕ، پرد، ئەگەڕێتەوە بۆ رێی بەسرە، رێی بیابانە و چۆڵییە.

بەسرە – زوبێر 20 کم، سەفوان 48 کم... دووڕیانی ئوم قەسر، دارگەز، ئەسەل، شوێنو مزگەوتی پێشەوا عەلی (د.خ) پێشی زوبێر، زوبێر کوڕی عەوام لە گۆڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە، لە بەسرەوە بۆ زوبێر 16 کم، بۆ کوێت 164 کم، بۆ بەغداد 545 کم.

لە نزیکی مزگەوتی پێشەوا عەلی لای چەپیدا، ئارامگەی تەلحە کوڕی ئەبدوڵا، ژوورو گۆڕ و ئارامگە، 2 × 5 م، بنمیچی، خرگەی گچکەی نزم، رێی سەفوان، درەختی تەلبەندکراو، قیرتاوی بیابان، حەساوگەی کارگەی خشت، دوای دارگەز، بیابانو چۆڵیو لی ورد، زەوی نەوتی رمێلە، ئاگرەکەی لای راست لە دوورەوە.

چیای سەنام، بارەگای فەرماندەیەتی بووە لە جەنگی دووەمی جیهانیدا، لە خاوەری ناوەندا، بەخشی سەفوان مەڵبەندی پاسپۆرتو گومرگە، رێزی.

سەفوان - جەهرە 90 کم، رێی قیر بە بیاباندا، لە جەهرەوە بۆ کوێت 30 کم، پێتەختە، شارێکی ئاوەدان لەسەر کەناری کەنداو، لە ناو زەردەلدا، ساختمانو خانووەکانی لەسەر شێوەی ئەوروپایی، هەر گەڕەکەی شێوەی تایبەتی هەیە، لەتەخشت، دیواری کۆن نابینی، شەقامەکانی بازنەییە.

بۆ ئەحمەدی 30 کم، لەسەر کەناری کەنداو، بەندەرو ئەسکەلەیە، دووەم شارە، چیمەنەکانی بە لوولە ئاو دەدرێت، کۆشکی میر، لەسەر کەناری دەریایە، لە کوێت چەند کۆشکێك لە شەقامەکانەوە ئەبینرێت وەکو بەنان، ئەحمەدی، فحیحیل،

30 کم، پەیوەستی نەحمەدییە، لێرەوە بە فەنتاس – فینتس، حەولی، شوێنی گرنگی کوێت، سالمییە، جرێبی شیوخ... سەفوان – کوێت 120 کم.

## بەغداد – عەقەرقوف – ئاگرگف:

5 کم، لە کێلگەی ئەبوغرێبەوە، 26 کم باتیر و خۆراوای بەغداد، لوتکەی زەقورە، لە دوورەوە دیارە، وەکو پاشەواری دوژێکی رووخاو، لە شێوەی دوژدا. دەریاچەی وشك، لە نزیکیەوە، بە زەقورەی یەزدانی – خوداوەندی ئەنلیل ناسراوە، پاشەواری دەوڵەتی کاشی – کاسی کوردە، لە سەمتی چیاکانی باکوورەوە هاتوون، حیتی – هیتی، شکستیان هێناوە، لایەنگری ئەکەدییان دابین کردووە بۆ خۆیان، نووسینیان شێوەی مێخی بووە، پەیوەندییان لەتەك فیرعەونەکانی میسردا هەبووە، بە گۆڕینەوەی نامە، بە بەڵگەی ئەو نوسراوو نامە تابلۆیانەی کە نێردراوە بۆ ئەخناتونی فیرعەونی میسر لە کوری کالزۆی شاهی کاشییەوە.

زەقورەکە پەرستگەیە، ئارامگەی شاهەکانی کاشییە، لە ژێرەوەیدا، لە قوڕو خشتی چوارگۆشەی قوڕی سوورکراوە دروستکراوە، قامیش، لە نێوانی چینەکانی، دیواری تیمیتۆس 2 م پان، بەرویشتی پەرستگەی زەمینی بووە، لە جالآیی نزمی زەقورەکە، کونێکی هێلکەیی، کۆشکی کاریکالزو کوریکالزو لە پایتەخت بە دووری 1 کم لە پەرستگەوە، بەرزی خرگە – قوبەی پەرستگە 100 م خشتی زەمینی سوورە، مۆری لاکێشی، نووسینی مێخی لێیهەڵکەنراوە، دەفەری گەشتوگوزارە.

## بەغداد – ناسرییە – زیقار – 365 کم:

سەربازگەی رەشید، پردی دیالە، دووریانی سوێرە، بەخشی عەزیزییە، لەسەر رۆباری دەجلە، بە ناوەندی شەقامەکانی عەزیزییەدا، دووریانی زبێدییە، نوعمانییە، کوت... تاکو ئێرە 171 کم، بەنداوی کوت، دووریانی موەفەقییە، شارۆچکەی حەی 47 کم لە کوتەوە، رێی بە کەناری رۆباری غەرافدا، فێرگەی فاخر، بەخشی سویج شەجەر – فەجر، کەناری غەراف، قەلعەسوکەر، لە حەییەوە 45 کم، بۆ روفاعی، 15 کم ئەمێنێ، بەخشی قەلعە، دەفەرێکی خۆشە، هەوارگەی ناسرییەیە، باخوداری

میوەی زۆرە، لەسەر کەناری رۆباری غەرافە، بەری ئەمبەری ئاوەدانە، فێرگەی سەرەتایی، ئاوەندی کوڕانو کچانی تێدایە.

## روفاعی:

شارۆچکەیە، 15 کم لە قەلعەسوکەرەوە، لە سەر کەناری غەرافە، راستە شەقام، دادگەو فێرگە، فەرمانگە، پۆستی عریشی، بەخشی نەسر، ئەوبەری ئاوەدانە، 20 کم لە روفاعییەوە، لە پێشدا سویچ شەگبانی پێوتراوە، بەدعە، بەنداوەگەی بۆ دەوایە، 30 کم، بۆ نەسر 12 کم، بەنداوەکە 65 کونی هەیە، تیرەی هەر یەکێکیان 1ر5 م، 3 کم لە شەترەوە.

## ناسرییە:

لەسەر رۆباری فوراتە 250 هەزار کەس پترە، پردی گەورە لەسەر رۆبارەکە، ئەمبەری ئاوەدانە، شەقامەکانی رێکە، ئەوبەری خەریکە لە پێشکەوتنندایە، چەرخی مدحەت پاشا لەتەك شاری رومادی دروستکراوە... ناسرییە – سوقوشیوخ 29 کم، لە سەر رۆباری فوراتە، شارۆچکەیەکی کۆنە، پێشکەوتوو نییە، لە شەقامی قیرەوە بە پاس هاتوچو بۆی ئەچن.

ناسرییە – ئەلبوسالح 44 کم، لەسەید دخیلەوە بۆ فرهە، ئەلبوسالح ، بنکەی بەخشە، ئیسلاح، فێرگەو فەرمانگەو پۆلیسی تێدایە، لەسەر هۆر – زەلکاوی ئەلبوسالحە، لە کەناری کۆتایی رۆباری غەرافە، کە لێرە کۆتایی دێتو ئەرژێتە هۆرەکانەوە.

## ناسرییە – بەغداد – 375 کم:

دووریانی نور، بەتحە، بەخشی خزر و پردەکەی، پۆستی خافورە، سەماوە، تاکو ئێرە، 100 کم، بنکەی ئوستانی موسەنا، سماوە، کارگەی چیمەنتۆی تێدایە، لە پردەکەیەوە، بەری ئەمبەر ئاوەدانی، لێرەوە بۆ ئوگرسەلمان 190 کم... پردی ئاسنی سوێر، پۆستی سوێر لەمبەر، پۆستی حەجامە، بەخشی رومێسە 63 کم بۆ دیوانییە، قادسییە، پۆستی عارزیاتە، شوێنی بەیەکگەیشتنی رۆبارەکان، بەخشی

هەمزە، لەسەر رۆباری حیلە، رومێسەش لەسەر ئەم رۆبارەیە، ئارامگەی هەمزە، لە نزیکیەوە، دووریانی شەنافییە، دیوانیە، بەخشی سەنییە و قاسم، دووریانی هاشمییە، حیلە ، بەغداد.

## ناسرییە – جبایش:

لە سەید دخیلەوە، فرهە، دووریانی فهود، گەوبەع، خدری زیندە، خضر حی الدار، دووریانی عبید، دەشتو بیابان، بانەداتەوە بۆ لای سوقوشیوخ، هۆرو زەلکاو لە هەردوولاوە، لای راستی ئاوی فوراتو لای چەپی ئاوی شەترەی تێئەرژێت، باخی خورما، فهود، یەکەی بەخشە، خانووەکانی حەسیرە، سەریفەیە، فرمانگەکانی لەوبەر پردەکەوە، ئاشو گەراج، ئەچێتەوە ناو فهود، بەخشی سەر بە جبایشە، فێرگەی تێدایە، بە ناوی خەرجییەی کوڕانو کچانەوە، کارەباو لوولەکەشی ئاوی هەیە، راستە بازاڕەکەی هەمە جەشنە شتومەکی تێدایە، دارخورما و سەریفە، لە هەردوولای رێگە لە نێوانی هۆرو زەلکاودا، گومەزی سەید ئەحمەد، پردی گچکە پێش گومەزەکە، فێرگەی ئینتفازییە لە گوندی عەمائر، فێرگەی مەجد، لە گوندی ئەلبوشامە، لە خشت دروستکراوە، نزیکی هۆری حەمار، لای چەپی رێگە هەتا چاوبرپکات، هۆری حەمارە، رەنگی ئاوەکەی سوورە، مەلوبالندەی زۆر تێدایە، خانووەکانی هەموو حەسیرە، سەریفەیە لە ناو هۆرەکەدا، ئاوی تێدەچێت، بالندەو مەلەکان، زوربەیان وەکو مراوییە... نعیجی ئاو، قاز، ئەمحوس، سپیو گەورە، ماسیگرە، بەدرهان، بیوزی سودانی، خزیری، حەزاف، سەند، پریزجی خوی نقوم ئەکات، رزقی ، کەرکی، دجاجی ماء، حەممەر، زۆر گەورەیە، 7 گەزە، غاق، غەرنوك، رخیوی، بە گەلێکیان دەڵێن حور، لەبەر ئەوەی گوشتی دەخورێ، خاوێنەو بۆگەنی نییە، حلیجی، منیلی، جەهلول، کەرسوع، تەتوە، عەرموت، شهیبی، سمێکی، عویدی، وەردە... حورەکان ئەمانەن: بەربەش، کۆشەم، حەزاف، مەسو، خزیری، ئەبوزەلە... لە چەند پردێك تێدەپەڕیت، زەلو قامیشی بەردی زۆری ناو هۆر، رەشماڵو دەوار، لە کەنار، مەڕو ئاژەڵ، لە نزیکیەو، ئەلەوەڕێت، دەفەری قامیشو حەسیر، سەرچاوەی ژیانی

هۆرنشینانە، هۆی گواستنەوە، بەلەمە، مەشحوف، لەسەر ریگەکان حەسیر لیژنەکراوە، قامیش هەڵئەقلیشێنن و حەسیری لێدروست دەکەن..

وشەی جیایش – کەبائس، پەستاوتن، لە کەناری هۆری حەمارە، شارۆچکەیە، کەنارەکەی رێکخراوە، باریکەرێی بۆ کراوە، بەردەمەکەی دارو درەختو باخە، فەرمانگەکانی هەمووی لە بەردەم باخەکانە... هۆری حەمار، لە ئاوی فوراتو شەترە پێکدێت.

## ناسریە – سوقوشیوخ – 29 کم:

شەقامی قیر، بە پاس هاتوچۆ، فێرگەی حورییە، ئیمام باقر، شەریف رەزی، سوق شارۆچکەیە، پردی گەرۆك بەرەو گەرمەو عکێکە، بە ماتۆر بە ئاودا 3 کات لە سوقەوە بۆ گەرمەوتار، نیو کاتە، ئەگەیتە فێرگەی کیفاح، هەردوولا باخی خورما، خێڵەکان ناو باخەکانیان ئاوەدانکردۆتەوە، بە تایبەتی خێڵی بەنی سعید، رێی ئوتومبیل لای چەپە، رێی نوێ لای راستە، چەند دەرگایەکی ئاوی، بۆ ئاودانی باخەکان، پردی گچکە بە سەریانەوە، جۆگەکان 1 م پانن، لە کاتی بەنداودا، خێزاو، دەرگاکان دادەخرێت، بۆ ئەوەی لافاو، ناوباخەکان تێکنەدات.

ئاوی فورات لە گەرمە ئەبێ بە 3 لکەوە: 1) مزلك، 2) حەفار، 3) منخەڵە. لە تار دەبنەوە بەیەك، ئاوی فورات لای پاڵێوگەی ئاوی سوقەوە لکی عکێکەی لێجوێئەبێتەوە، لای تار دیسانەوە ئەرژێتە هۆری حەمارەوە، نزیکی رێژگەی لکەکانی تری فورات، هەروەها ئاوی شەترەش دێتەوە بۆ لای کۆتایی ئەلبوساڵح، دەرژێتە هۆری حەمارەوە، هەموویان هۆری حەماریان لێپێکدێت.

ئەم دەڤەرە خورمای زۆرە، بەلەم، هۆی گواستنەوەیانە، خانووەکانیان لە حەسیر و پووشە، بە درێژایی کەناری فورات، لە هەردوو لاوە، باخی خورمایە، بە تایبەتی چەشنی شویس، گەڵی چەشنی تر، وەکو: قونتار، ئەستی عەمران، حابسی، خەزراوی، هێری، دێری، زهدی، مەکتوم، خەساب، خەستاوی، بریم، میاسی، ودگڵ، حلاوی، خەساوی بەغەڵ، شەکەر، بەس، سەفار، هەدلە، بربەن، بە چەشنی سویسییەوە، خورما گەلی جۆرە..

جگە لە خورما، برنجی عەنبەریان هەیە.

دوای ئەوە ئەگەینە فێرگەی شروق، ساختمانەکەی لە خشت دروستکراوە، بە درێژایی کەناری فورات، سەریفە، خەرمانی خورما، هەڵدراوەتەوە، بە بەلەم ئەگوێزرێتەوە.

گەرمە، بنکەی بەخشە، لە سەر ئاوی فورات، 10 کم لە سووقەوە، ئاوی فورات لێرە ئەبێ بە 3 لکەوە، لای راستی منخەڵە، ساختمانی پولیسو فێرگەی لێکراوە، لکی حەفار، لە هەموویان پانترە، پردی گەورەی لە سەرکراوە، چەند کونێکە درێژی 75 م.

بە ماتۆڕ بە ژێر پردی مەزلەکدا 3 دەرگایتر، لە تەنیشتی گوزەرگەوە ئەیبینی، دەرگاکان 3 م پانن، گوزەرگەی ماتۆڕەکان 4 م، هەردوولای کۆنکرێتە، باخی خورما لە هەردوولاوە، نیوکات بۆ فێرگەی ئال جوبێر، خاوەن باخەکان، کارگەر ئەگرن بۆ کۆکردنەوەی خورما بێدراو، تەنها خورما وەرئەگرن، ئەم کارە، پێی دەڵێن، تەمرە، بە کارگەران دەڵێن ئاگولات.

لە کاتی خورمادا، باخەکان ئاوەدانن، بە زۆری خێڵی بەنی سعید... پاش ئەوە، ئەچێتە فێرگەی حەزارە، لە سەریفە کراوە، گامێشی زۆر لە ئاوی فوراتدا ئەبینی، دیوەخانو میوانگە ئەبینی، لێرەدا بەشی خێڵی ئال جوبێر کۆتایی دێت... لە گەرمە، جۆگەی حەمیدی، زگێتی، لێجوێدەبێتەوە، لە لکی مەزلەکەوە.

سەردلاری ئال جوبێر، حاتەم موزانە، هەنوکە حسێن حاتەمە، کوێخایە، بە تیرەی کەریم ئال موحسندا، تێدەپەڕن، فێرگەی ئال جوبێر لە خشت دروستکراوە، خانووی لێکراوە بۆ فێرکاران، مامۆستایان... گوندەکە تۆزێ لەملاترەوەیە.

بە ناو ئاودا بە ماتۆر تاکو تار، پاسگەو بیمارگەو بازاڕ، ئاوی خاوێنی تێدایە..

حەفار دێتەوە ناو مەزلەک، دوای ماوەیەک مەزلەکو حەفار و منخەڵە، دەرژێنە هۆڕی حەمارەوە، بازاڕی تار، ساختمانەکانی، لە کەناری ئاوی مەزلەکو حەفارە، فێرگەی وەتەنی تێدایە، لە خشت کراوە خانووش بۆ فێرکاران کراوە.

**بەدرە – بەد ڕێ:**

**لە واسیتەوە – کوت – 71 کم:**

ناوەکەی لە بەد ڕێوە، هاتووە، شارۆچکەیەکی کۆنە، پەیوەستی کوتە، بەری کۆنی لە ناو باخدایە، بەری نوێ فەرمانگەو خانووی لێکراوە شیو بە ناوەندیدا، لافاوی زستانی پێدا دێت، وشکە لە هاویندا، پردی کۆنکریتی لەسەر کراوە، هەردووبەری بەیەکەوە بەستووە، ناوەکەی سوێرە، لە دامێنی چیاکانی پشتکۆوە دێت، بە کانیخوێدا تێدەپەڕێت، ئاوەکە سوێر دەبێت، ڕێگەکە قیرتی کەمە، مۆناتی 10 هەزار کەس پترە، دەرامەتیان کشتو باخی خورما و ترشەمەنییە، باشترین جەشنی خورمای هەیە، لە نزیکی خانووی فەرمانبەرانەوە، گردێک پێیدەڵێن عوقر... فێرگەی سەرەتایو ناوەندی کوڕانو کچانی تێدایە، دانیشتوانی کوردی لوڕن، 2 بەخشی هەیە:

1. زرباتییە، نزیکی سنوورە، شوێنگەی بەرزو نزمی، ناوباخ، لە وشەی زڕباتی واتاکەی هاتووە، 13 کم لە بەدرەوە، مۆناتی 3 هەزار کەسە، هەموو کوردی لوڕین. دەرامەتیان، باخی خورما و ترشەمەنی، میوەیە، ئەو شیوەی کە شارۆچکەی بەدرەی شەقکردووە، بە ناو بەخشی زڕباتییەدا دەڕوات، لە دامێنی چیاکانی پشتکۆوە دێت، فێرگەی سەرەتایی کوڕانو کچانی تێدایە.
2. جەسان، لە بەدرەوە، 19 کم، زوربەی دانیشتوانی عەرەبن.

**دیوانییە – شامییە – 34 کم:**

شارۆچکەیەکی دیوانییەیە، ڕێی قیرتاو نەکراو بە ناو هۆزی شامییەدا، ڕێی خاکوگڵی بەرزکراوە، لە هەردوولاوە، ئاو، لە لای ڕاستەوە لە کونەکانی جەعفار و نورییە و 4 کونی ترەوە، دێت بۆ لای چەپ، پردی تەختە بەسەر کونی ناوەکانەوە، پێشی شامییە کۆڕ و باخو شەقامی قیری ناو شارۆچکە، پرۆژەی ئاوو ئەلەکتریک، فێرگەی سەرەتاییو ناوەندی کوڕانو کچان، فەرمانگەی تێدایە.

لە ئەبی سخیرەوە، 15 کم، خانووی حەسیر، سەریفە بەروپشی شاری تـەنیوە، چاخانەو بازاڕی گەورەی هەیە پردێك بەری نوێو کۆنی بەیەکەوە بەستووە، پردەکە لەسەر لکی فوراتە.

بەری نوێی خانووی میری زۆر تێدایە..

رێ لە شامییەوە بۆ ئەبی سخیر، بە ناو گڵو خاکدا، باخ لـە هەردوولاوە، پـردی تەختە لەسەر کونە ئاوەکان بۆ پەخشی ئاو.

## ئەبی سخێر:

شارۆچکەی دیوانییەیە، لـە ئەجەفی شکۆدارەوە 18 کم، لـە میشخابەوە 18 کم، لە شامییەوە 15 کم، ساختمانی نوێو فێرگەی سەرەتایی، ناوەندی کوڕانو کچانی هەیە، پرۆژەی ئـاوو ئەلەکتریکی تێدایـە، شـەقامەکانی قیرە، پـردی گـەرۆلە، نزیکی پێشی شارۆچکەکەیە، باخی هەیە.

## بەغداد – تاران:

لە کاسل پۆستەوە، خان بەنی سـەعد بـەرەوە باقووبـە، شارەبان، 45 کـم، 70 کم بۆ خانەقین، مەنسورییە، کەڕی هـەمرین، قزرابـات، سـەعدییە، خوسـرەواباد، بـۆ دووڕیان 1 کم بۆ خانـەقین 26 کـم، رێـی بـە نـاو گردۆڵکەدا، 15 کـم بـۆ خانـەقین، پێدەشتی گراوە، خانەقین، لـە بەغـدادەوە 159 کـم، پۆسـتی گومرگـە، رێـزی سـنوور 8کـم، مونزرییـە، خەسـرەوی، سـاختمانی مـیری کۆتـەڵی شێر، سـاختمانی گـومرگی فراوان، حەساوگە، کەشو ئاو و بای کتومت لە خانەقین ئەچێت، دارخورمای زۆرە، بۆ قەسـری شـیرین 15 کـم، لـە قەسـرەوە بـۆ کرمنشـا 200 کـم، گونـدی خەسـرەوی لـە نێوانی گردا، رێی بە ناو زورگەزراودا، تـەختی، پـردی گـراوە، بۆ کرمنشا، 190 کـم، پێچو لابەلاو هەوراز، تـەختی، رێـی قـیر، زنجـیرە چـیای راکشـاو لەبـەر دەمتـا، چۆکی داداوەتە سـەر سـنگی زەوی، درێژبۆتـەوە لـە بـاکوری خۆراواوە بـۆ باشـووری خـاوەر، قەسری شیرین، بەروپشتی گیراوە بە باخی خورما لـە نێـوانی گردۆڵکەدا، هـاڕەی ئـاو لـە بـاخی نــاو شـیوەکاندا، سـاختمانەکانی لەســەر گــرد بــە بەرزاییــەوە بـڵاو، بەهـەردوولای رێگـەدا، گۆڕسـتان لای راسـت، فرۆشـگەو چـاخانە بـە هـەردوولای

شەقامدا، باخ لە پشتەوە، خانووەکانی لە خشت کراوە، پرۆژەی ئاوی تێدایە، ڕێی بە تەختاییو پێدەشتدا، دووریانی کۆمپانیای نەوت، بۆ کرمنشا 160 کم، گوندی گچکە لای ڕاست، گوندی پڕ لە داروددرەخت لای چەپ، سەرپۆلی زەهاو، پردوئاو داروددرەختوو خانوو تا گەروو، تەنگی شارۆچکە، بە ناو دەربەندا، وەکو دەربەند بازیانە، لە بەروپشتەوە پێدەشت لە پێشیەوە، 140 کم بۆ کرمنشا، زنجیرە چیا لە هەردوولاوە، لە پێشەوە ئاوو پردو کون، چاخانەی نزیکی گوند، دێهات لە هەردوو لاوە، ڕێی شاخاویو سەخت لە پایتاقەوە دەست پێدەکات، وەکو پشتەوەی دەربەندخانە، هەوراز و بەرزی کەمکەم بەسەر شیوێکدا ئەڕوانی، گوند لە ناو شیوەکەدا، نەوتخانە، دامێنی چیا لای چەپەوە، گەروو، تەنگی، دەربەند و هەوراز، لە ڕێی سۆلاڤ دەچێت، داروددەوەن بە کەژەکانەوە، بای فێنکو سازگار، پێچی شاخ، سەرپاتاق، نشێویو نەوی، پێچ، داروددەوەن بە کەژە نزیکەکانەوە، هەر دەڵێت ڕێی زاوێتەیە، دارچنار لە تەنیشتی ڕێکەوە، 120 کم بۆ کرمنشا، پێچی هەوراز، تەختی، بەرزایی کەژەکان کەم ئەبنەوە، چاخانە و هەوراگەی سەرمیل، وەکو هەوارگەی بادینیە، هێجگار خۆشە، ڕێی بەناو پێدەشتدا، چاخانە، پەیوەستی سەرمیلە، تەختی، کرند و باخە دڵگیرەکانی لە دامێنی چەپی چیا، پشتەوەی تەنگیو دەربەند، ڕێی بەناو دارچنارو باخدا، فرۆشگەو چاخانە، پێدەشت 100 کم بۆ کرمنشا، شائاباد، لای ڕاست، 70 کم ماوە، پادگانی شائابادی خۆراوا، باختەر، باتێر، شائابادی غەرب، بەنزیخانە، داروددرەختی چڕو مەزن، هەردوولای ڕێی تەنیوە، دووریانی ئیلام، بە ناوەندی شارۆچکەی شائابادا، باخ، لای چەپ، تەختایی، 60 کم ماوە بۆ کرمنشا...
زنجیرە چیا لای ڕاست، دووریانی مەلاوی – ئابادان، تەختیو هەوراز، گوندێکی گچکە، فێرگەو چاخانەی تێدایە، 50 کم ماوە، دەربەند ئەبڕێت، بەرزایی لە شەقامەکەوە 7-4 م، بەسەر دەشتێکی کراوەدا دەڕوانی، پێچی نشێویو پەستی، بە دەربەندەکاندا، تەختیو دەربەندیتر وەکو دەربەند بازیانی سلێمانی، داروددەوەن، لە هەردوولاوە، پێچی نشێوی، چاخانەی چار زەعفەر، پێدەشت، چاخانەیتری سەرڕێ، ماهیدەشت، ڕێی تەختیو هەورازو نەوی، 10 کم بۆ کرمنشا.

## کرمنشا:

شارێکی مەزنە، 600 هەزار کەس پترە، شەقامی شاپور، دووکەرتی کردووە، کۆڕو مەیدانی شا، شوێنگەی لیژی، کەشوئاووبای خۆشی، دلگیر، هەوارگەکانی، تاق بوستانە 2 کم لە ناو شارەوە، پاشەوانی ئەردەشیری 2، خەسەروی پەروێزو شاپووری 2، لە چیاکە لە بەرد هەلکەنراوە، چالاوی گەورە لە بەردەمی کەژەکەدا، چاوگە، باخودرەخت لە هەوارگەی سەرچناری سلێمانی دەچێت، هەوارگەی بێستون، پەیکەرەکانی هەرقەل، بە بەرجەستەیی ژمارەیەك، چاوگی ئاوی سارد لە ژێرەوە، دەڕوات، باخەکانی درێژ بۆتەوە، جۆگاکانی لکی لێبۆتەوە، لە چاوگەوە، بەهەشتی سەرزەمینە، 40 کم لە کرمنشاوە، گوندی بێستونی گچکە، بازاڕو فرۆشگە، کارگەی شەکر، خاوێنگەی شیر، پردی شائەباس، لەسەر رۆباری دینەوەر، دێهاتی سەرڕێی، کرمنشا، بێستون ئەمانەن: کاگییە، پاسگەو چالاوە، دووڕیانی هەرسین، خورەماباد.

## کرمنشا – سنە – 128 کم:

ڕێی قیرو دەشتایی بە ڕێکی زنجیرە چیای بێستوندا، گوندی قازانچی، دیدەنگەی خدری زیندە، باخەڕازاوەکانی، پێدەشت، گوندی ناودەربەند، برنجان، خاوەن باخوبێستان، ڕێی لە دامێنی کەژەوە بە شیوێکدا، پردی کراوەی تازاوا، لە سەر ئاوی تازاوا، پێدەشتی کراوە، بەخشی کامیاران، لەسەر سنەیە 70 کم لە سنەوە، گوندی وەردە، ڕێی دەچێتەوە بۆ دامێنی چەپ، بە شیوێکدا، دەربەند بەسەر شیودا دەڕوانێ، ئاوی پێدا دەڕوات، گەردنەی برواری پێدەلێن، هەوراز، کۆتایی دەربەند، 60 کم بۆ سنە، پێچی نەوی پێشەوەی کەژ، باخی چناری بلاو، سەختوشاخاوی، هەوارگەی سەربناو، چاخانەکەی.

ڕێی دێتەوە لای چەپ، 50- کم بۆ سنە، پردی کراوەی ئاورۆشن، ڕێی دەڕواتەوە لای راست، تونێلی ئەباساوا، 20 م، پێچی بردراو، تونێلی تر وەکو هی پێشوو، گوندی شیلان، هەوراز، دەربەندەکان نەبڕێت، پێدەشت، گوندی کرێزە، هەوراز، سنە لە چالێو پەستیدا، لەسەر چەند گردێك، گەژوکێو بە برویشتیدا.

**سنە:**

سنە، ساناندوژ، قەلآی سانان، سولتانان، سینەدوژ، سنگ کێو، قەلآی سنگ، بنکەی ئوستانی کوردستانە، لە شاری سلێمانی دەچێت لە مەزنیدا، 2 شەقامی سەرەکی چوار گەرتیکردووە، لە گۆڕی شا یەکئەگرنەوە، گۆڕپەترێشی هەیە وەکو ئیقبال زەمان، هیتر، شەقامەکانی فیرو رێکە، پەیکەری شا، لە گۆڕی شا، فەرمانگەی میری تێدایە.

**سنە – هەمەدان – 180 کم:**

رێی سەختوشاخاوی، فێرنەکراو، گوندی فەرەج قشلاخ، پردی گراوە، سایلوی دانەوێڵە، نزیکی دارودرەختوو رۆبار، رێی شاخاوی بە دۆڵدا، کێوی رووتەن لە هەردوولاوە، دۆڵی پڕ دارودرەخت، گوندی گچکەپێچی هەوراز، چاخانە، پێچی لابەلاو تەخت، سەڵوەتاوا، سەرکەل، دۆڵ لە خوارەوە، کێوی رووتەن، لێژی، ئاووبای سارد، پێدەشتی فراوانو گوشاد، بەخشی دەهگلان، ناوەدانو رازاوە، پێدەشت، گوندی ئاردەسەر، هەسەناوا، دارو درەختو فێرگە، گوندی کاشگرا، شارۆچکەی غەروە، قەروەی تورکی، ناوەندی رێی سنەو هەمەدانە، پێدەشت، ئەچێتە ناو مەڵبەندی تورك زمانەوە، گوندی نازماوا، سالحاوا، تورکمانن، فێرتاو سەربازگەی هەمەدان، دووریانی بیجار، شاری هەمەدانی رازاوە، فێنکوسازگار، دارودرەختو بێستانو میوە، شارێکی گەورەیە لە دامێنی کێوێکی رەشدا، هەوارگەیە، شەقامەکانی، لە ناوەندا، لە گۆڕی جوانی شادا یەکئەگرنەوە، پەیکەری رەزاشای تێدایە، بە سواری ئەسپەوە، گۆڕو ئاوی پڕاو، فوارە، دارودرەخت.

**هەمەدان – ئەکباتان:**

شارێکی رەند و جوانە، بنکەی ئوستانە، تورکماتی زوربەن، لە دامێنی چیای ئەلباساوادایە، 225 کم لە قەزوێنەوە، دوورە.

**هەمەدان – قەزوین – 225 کم:**

دووڕیانی پایگای شاروخی، پێدەشتو ڤیر، گوند و چاخانەی سەرڕێ، گردۆلکە، چاخانەی گەرمك، شارۆچکەی ناوج، لۆکنتە و ئوتێل، فرمانگە و دبیرستان و ناوەندی، زورگەزراو و گردۆلکە، پێچی نشێویو لێژی، چاخانە، پێچی نشێویو لێژی، گردۆلکەی بەردینی سوور، پردی کراوە، تونێل 7-5 م، پەستی، گردۆلکە و گوندو پێدەشت، گوندی ئاوەدانو پڕ دارودرەخت، ئیرەماباد، هێڵی ئاسن، شارۆچکەی تاکستان، دەشتی کراوە، ڕێنمای پۆلیس، فێرگەی رەزەوی، 15 کم بۆ قەزوین، قەزوین، باخەکانی ڕێکنەخراوە، بەرەو تاران.

**قەزوین – تاران:**

دەشتی کراوەو دارودرەخت، بە هەردوولادا، کارگەی شەکر، ڕێنمای پۆلیس، لۆکنتەو چێشتخانەو حەساوگە، شاری پیشەسازی قەزوین، 90 کم بۆ کەرەج، ڤیرتاوی باش، دەشتی کراوەو بەرین، دووڕیانی تالقان، پێدەشتی لا چەپ، چیای پاسگەی ئابیك 45 کم بۆ کەرەج، جەلیلاوا، دووڕیانی نەزەراباد، کارگەی چنین، گوندی هەشتگورد، 30 کم بۆ کەرەج، پەنگئیمام، دووڕیانی ویلیان، کۆمپانیا و چاخانە، کێلگەی حەمیدیو سوهەیلیر حەکیمی، دووڕیانی بورغان، خانووی گوندەکان، لە ڤوڕ دروستکراوە، وەکو گوندەکانی باشووری ئیراق، پرماینە، دووڕیانی کەمالاباد، گوندی حەسارکو باخوبێستانەکەی، کەرەج، دەروازەکەی، باخەکانی ڕێکوپێکن، دووڕیانی گوڵشەهر، دارودرەخت لە دوولاوە، ڕێی تەنیوە، ساختمانو هەوارگە، ئەم راستە شەقامە بە تارانەوە نووساوە، پەیکەری شا، پردی داخراو، کەژوکێو لای چەپ، پرۆژەی جەنگەڵ، خانووی یەك لەسەر یەك وەکو پێپیلکە، باخو بێستان لای راستی، بە ژێر پردا، شەقامی تەنراو بە درەخت، لە هەردوولاوە ڤیرتاو، دارودرەخت نامێنێ، دووبارە، دارودرەخت، کەژوکێوی لای چەپ، 20 کم بۆ تاران، فرودگەی میهراباد، نووساوە بە تارانەوە، کەنارو دەروازەی تاران، نزیکی چیاکە، هەمووی شارۆچکەو خانوو ئاوەدانییە، کارگەی زۆر بە هەردوولادا، تاران.

## تاران:

شارێكى رەنـد جوانــە، پێتەختـە، 5 مليـۆن كـەس پـترە، شـەقامەكانى، لالـەزار، بزورجەمهەر، مەولەوى، شاپور، شارەزا، لە فرودگاى تارانەوە، بۆ تارانپارس، شەقامى پەهلەوەى، فيردەوسـى، سـەعدى، هەوراگـەى شـەمێران، دەربەنـد، سـەربەند، پـولى تـەجريش، بەهارسـتان، كـۆڕو گۆڕەپـانو مەيدانـەكانى، مەيـدانى سـوپا، تۆپخانــە، سێراى سپەند، مەيدانى سەعدى ، شوش.

## تاران – رامسەر – 265 كم:

لـە كەرەجـەوە، هەوراگـەى گـەورە و نـاودار، پێچـو دارودرەخـت، نـاوى سـاردى كەرەج، لە چياوە دێت، 140 كـم بـۆ چالوس، ڤينـە، رێ بـە دۆڵـدا، سـەختو شـاخاوى بەسەر شيودا ئەڕوانێ، تونێـل 20 م درێـژ، تـونێلى دووەم، درێـژتر، تـونێلى سـێيەمو چوارەم 100م، چالاو و بەنـداوى ئەميركـەبير، لـە بەنـداوى دەربەنـدخان دەچـێت، دەرياچەيە، تـونێلى پێنجـەم 70 م، شەشـەم تونێـل 3 كـم، رووناكـە، دەرياچـەكە لـە بـەردەمتا، تـونێلى هەشـتەم، 8 كـم، نۆهـەم 10 م، چاخانەى دەقانـان، دۆڵـى تـەنگو تەسك، نـاو لـە تەنيشـتيەوە، چاخانەى سـەررێ، گونـدى نيسـار، هەوارگـە و خـانووى بڵاو، لە ناو باخدا، بەردەگەچ، لە شاخەكە دەردەهێنن، بـۆ كـوورەى گـەچ، هەوارگـەى كچسـەر، خانووەكـانى بـڵاوە، پـردى كـراوەى كـۆن، دووڕپـانى گاچـرە، دوو تـاقى كۆنكرێت، چەند تاقێكىتر، بەرانبەرى، پێچى هەوراز، 2 تاقيتر، تونێلى 3 كم، لێژى، دووڕپـانى ئيلكـا، تـەنگيو گـەرووى درێـژ، نـاوى پێـدا دەڕوات، كـەژوكێو و نـزار، هەوارگەى سيابێشە و ڤاليئاباد، لێژيو پێچو پردو ناو، ركەبەردى گەورە و تاشەبەرد، كەژونزار، گەروو، تەنگى دزين، دوژە، چاخانەى هەميشـە بـەهار، رێـى پشـتى چياو زنجيرە چيا لە بەردەمتا، 30 كم بۆ چالوس، شاخى گڵى ، رێ بە نێو ديوارە چياكاندا، مـەزرانئاباد، پۆسـتو فەرمانگـەى لێيـە. هەوارگـەى خـۆش، نهالنـاز، دووڕپـانى دەشتنەزێر 20 كم بۆ چالوس، ناوو دارودرەخت، لە ناو شيوو دۆڵدا، پـرد، جەنگـەڵى چـڕو رەش، نـاو دێتـە خـوارەوە، رێـى قـير و پێچـو لارى، پێچـو لوولخـواردوو، وەكـو

رەشمار، هەور بە سەرەوە، ساردو دەنمی باران، لە نیوەی دووەمی مانگی ئابدا، گەڵای داری رەونەقدار، شۆراوە بە نمەی باران، خاوێن، روونـاکی چاوی گەشتیارە، کێڵگەی هەسـەن زەمەوری، جەنگەڵی چرو پڕ، لـە هـەردوولاوە، شـاری چـالوس، فەرمانگـەو پەیکەری رەزاشا، لە مەیدان، بـاخی گشتی، پـردو ئـاو، شاری رازاوە، بـەرەو رامسـەر، باخوباخـاتی سەر رێ، 75 کـم بـۆ رامسـەر، عـەلی سەرای لەسـەر دەریـای گـەزبین، دەریاکە دەبینی، باخ لە کەناری، شەپۆل دەریا، شڵپوهوڕپەتی، رێ بە کەناری دەریادا، موتـول غـو، جەمشیدخان، ئەباساوا، موتـول دیانـا، ئەشتارود، موتـول مـەرجان، شاری شاەسوار، گازینۆ، تونێل، هەوراگەی رامسەر، شاری رامسەر، پەیکەری شا لـە دەروازەی شـاردا، فەرمانگـەو نەخۆشخانە، شـاری شـاخاوی لەسـەر کـەناری دەریـای گەزبین، بەرەو رەشت.

## رامسەر – رەشت:

رێی کەناری دەریای گەزبین، چیا جەنگەڵ، چڕو رەش لای چـەپ، شارۆچکەی چابوکسەر، باخوباخـات، بـە کـەناری دەریـادا، شارۆچـکەی گەلاچـایی، لـە دەریـا دوور ئەکەوێتـەوە، بەرەبـەرە، تەسـکەرمەحەلە، رێ بـۆ رامەدەشـت، لەسـەر دەریـا، شـاری جووسەر، پەیکەری رەزاشا لە چەقی شاردا، شەلا، شەقامی فیر کۆتایی دێت، دووبـارە فیر، شاری لەنگەرودی رەندو جوان، کێڵگەی چا، مەرەزە، کارگەی چـا، ئوتێـل ئیشار، شـاری لاهیجـان، کـە بـە بەرهـەمی چـایی ناوبـانگی دەرکـردووە، بنکـەی ئوستـانە، جەنگەڵ بە هەردوولادا، شارۆچکەی لولومند، کوچی سفهان، مـەرەزەو داروەدرەخـت، لە هەردوولاوە، شاری رەشت، دڵگیر و خاوەنی باخوباخات.

## رەشت:

بنکەی ئوستانی گیلانە، شارێکی جوانە، هەمیشە هەوری بەسـەرەوەیە، بـارانی زۆر دەبارێ، شێو هـەڵمی هەیـە، بەرهـەمتاوی گـەرمو سـێبەری فێنکە، کـۆڕو مـەیدانو باخی گشتی، پارکی فەرەح پەهلەوی، پەیکەری شا، شەقامی رێك، فەرمانگە، ناوەکەی لینجاو و سوێری هەیە، لە دەریاوە دێت.

## رەشت – بەندەر پەهلەوی – 40 کم:

لە شارۆچکەی خەمامەوە، بەرەو بەنـدەر، ئەسکەلەی پەهلەوی، بلاجی سەر دەریـای کـەزبین، شـوێنگەی مەلـەی ئافرەتوپیـاو، دیمـەنی سـەرنج ڕاکـێش، بەنـدەر پەهلەوی، شارێکی جوانە، پارکی ڕازاوە، شەقامی کۆرنیش، خۆشو دلگیر.

## رەشت – ئەستەرە:

بە ئوتوبیس، هەردوولای ڕێ مەرەزەو باخە، شەقامی قیر، شارۆچکەی خەمام، گوندی مەتروپۆڵ، نزیکی دەریا، ڕێی بە ڕێکی دەریادا، بەنـدەر پەهلەوی، کوپروکی، جەنگەڵ، لـە هـەردوو لای ڕێگـە، ڕێـی کـەنار، زۆر باشـنییە، خـانووی تـەنها لـە نـاو باخەکانـدا، بـۆ ئەسـتەرە 120 کـم، چـاخانە و گونـدی گچکەی سـەر ڕێ، بەخشـی ڕێزوانـدە 110 بـۆ ئەسـتەرە، ئەسـتارا، جەنگەڵ لـە هـەردوو لاوە، کێوی جەنگـەڵی، لەبەردەمتا، خانووی تەنها، لە ناو باخدا، سەری بـە زەل گیراوە، هەنـدێکی بـە گـونج ڕێی قیر نییـە، تـاکو ئەسـتارا، گونـدی ئـەردەجان، نهالستان پلـەدا، پاراسـەر، گونـدی دنیاچاڵ، خالیسەرا، 59 کـم کارگـەو فابریکـەی تەختـە بـڕین، هەشتپەرشارە، شـاری هەشتپەر، دیهاتیتر، بەرەوە ئەستارا، لەسـەر کـەناری دەریـای خـەزەر، کـەزبین نزیـکی سـنووری سـۆڤیەت، رووسـیا، بـەرەوە ئـەردەبیل، ڕێـی شـاخاوی، جەنگـەڵ، پـێچ، هەورازونشێوی زۆر، دوای ماوەیەك جەنگەڵ نامێنێ، رووتەنە، چەند گوندێ لەسـەر ڕێ، نشێوو لێژی بۆ شاری ئەردەبیل، لە ئەستارەوە، 80 کم، ڕێی سەختوبەد.

## ئەردەبیل:

بنکەی ئوستانە، دەڤـەری ئازربیجانـە، تـورکی ئازەرین، مۆنـاتی 150 هـەزار کەس پترە، ڕاستەشەقامێ شەقی دەکات، پاشەوارەی مێژوویی کۆنی ئێرانـو ڕووائـەتی ژیـاری و شارسـتانێتی لـە سـاختمانی شـێخ سـەفی، دەردەکـەوێت، شـوێنگەی فراوانـو خۆشی ناوشار، پلەی گەرما 25 پلە لە هاویندا، نزیکی کوێستانی سـەبولانە، گـەرماو، ئابی گەرم، 30 کم لە ئەردەبیلەوە، جێی دیدەنیو سەیرانگە.

**ئەردەبیل – ئابی جەرم – گەرم – 30 کم:**

لە ئەردەبیلەوە تاکو سەرێناب 80 کم، تاکو دووڕیانی ئابیجەرم، 20 کم، لە دووڕیانەوە، 9 کم بۆ ئابیجەرم، دەفەری گردۆلکەییە، زنجیرە چیاکانو کێوەکانی سەبولان، دیارن، رووتەنو بەفری پێوەیە، هەور بە سەریانەوە، لە مانگی ئابدا، بارانی لێئەبارێت، بەخشی تیر، شارۆچکەی مزاب، رێی گڵۆخاك ، خەرمانی گەنمو دانەوێڵە، دروێنە بە دەستوکومباین، لە هەردوولای رێوە، پێدەشت، گوندی رۆستەماباد، دێهاتی ئاوەدان بە هەردوولادا قورگول، گۆمێکی کچکەیە، پێچو هەورازی سائین، ئوتومبیلی بیمارستانی گەرۆك، ئامادەیە بۆ کارەسات، لێژی دووڕیانی تەهران، تەورێز، کێوی سەهەند، دەردەکەوێت، نزیکی تەبرێزە.

**تەبرێز:**

شاری گەورە، خۆشو فێنك، سازگار، پێتەختی ئوستانی ئازربیجانە، مۆناتی 500 هەزار کەسە، دانیشتوانی تورکی ئازەرین، ئازربیجانی خاوەرە، ئازربیجانی خۆراوا، پێتەختەکەی شاری ئورمییەیە، جێی دیدەنی و سەیرانگەی، باخی گوڵستان، شاگوڵییە، شەقامی پەهلەوی، فیردەوسی، سەرەکییە.

**تەبرێز – ئەرزوڕووم – 900 کم:**

لەرێی فیرەوە تاکو مەرەند، 64 کم، نزیکەی 10 کم بە رێگەکەدا، لە نیشانگەوە، 54 کم، گوندی سۆفیان، 30 کم ئەمێنێ بۆ مەرەند، بەرێکی هێڵی ئاسندا، چەند پردێ شەمەندەفەر بە ژێریدا دەڕوات، شیوو دەرە و پرد، گردۆلکە، 18 کم بۆ مەرەند، باخی چنار، کێوو کەژ، لە هەردوولاوە، چاخانەی پەیام نزیکی گوند، لێژیو ئەوی بەرەو دەشتی مەرەند، 6 کم ئەمێنێ بۆ مەرەند، باخودارو درەخت، ریزە کێوی بڵند، لە بەردەمتا، شاری مەرەند، درەخت بە هەردوولای شەقامەکانیدا، تەنیوەتی، پەیکەری شا لە چەقی شاردا، کۆڕی جوان، 180 کم بۆ ماکۆ، 200 کم بۆ بازرگان، قیرتاو و پێدەشت، باخی میوە، بە زۆری دارقەیسی، قەیسییەکەی وشك دەکەنەوە، لەم دەشتانە وشتری کوێستانی بەخێو دەکەن، شیوو

**ئەنکەرە – دیاربەکر – 1000 کم:**

لە ڕێگەی کۆنیەوە، بە ناو گردۆڵکەدا، بۆ کۆنیە، 253 کم، کراوەیی، دووڕیانی قەیسەری، گردۆڵکەو چۆمو باخو دارچنار، ڕێی قەیسەری، گردۆڵکەی دێم، کراوەیی، بان، بۆ قەیسەری 400 کم، بۆ شارۆچکەی کامان، 53 کم، قرشە شەهر، قەیسەری، دووڕیانی سیواس، ڕێی مەلاتییە، دەڤەری گردۆڵکەیی، بۆ مەلاتییە 80 کم، دووڕیانی سەرەش، گردۆڵکەو هەوراز و وشکایی، تاکو تەرا، دڵری پێوەیە، ئاوەدانی هەردوولا، گردی بەرزتر، پێچو دارستان، پێچی لێژی، دارچنار، سەربانی خانووەکانی تەختە، وەکو لای خۆمان، کراوەیی، زنجیرە کێوی راکشاو، لە پێشەوە، دوور، 30 کم بۆ مەلاتییە، چۆمو پردو گردۆڵکە، ئاوایی بەملادا، کراوەیی، پردو هێڵی ئاسن بە ژێریدا، دووڕیانی مەلاتییە، غازی ئەنتاب، مەرەش، بۆ مەلاتییە 21 کم، لاپاڵی گردودۆڵ بەولادا، لە پێدەشتدا، کێو لە باشوورییەوە نزیکە، دارو درەخت بە کەناری شەقامەکەدا، سەنتەری شار، 2 پەیکەری ئەتاتورک بە پاڵتۆوە، مۆناتی شارەکە 400 هەزار کەسە، ڕێی ئەلازیغ 90 کم، زنجیرە کێوی رووتەن، لای راست چۆمو گردو پردو چۆمو پرد، شەقامی قیرو 2 پردی سەرچۆمی وشک، ڕێی نوێ، گردۆڵکەو کەوەکێو، پردو رۆباری فورات، هەوراز، بۆ ئەلازیغ 50 کم، کراوەیی، کێو لای راست، ئاوایو باخو چنار و دێبەر دیارە، فراوانی ، هێڵی ئاسن لە ژێرەوە، پرد لەسەرەوە، دووڕیان، شاری ئەلازیغ، لە دامێنی کێوەوە تاکو پێدەشت داگیرکردووە، کارگەی چیمەنتۆی تێدایە، دوژە کۆنەکەی بەسەر کێوی پشتەوەی، بەلای وێستگەی هێڵی ئاسندا، دووڕیانی بینگۆڵ، هەزارکانی، بۆ دیاربەکر، 153 کم، پێدەشت، بۆ ماردین 59 کم، هەورازو ناوگرد، هێڵی ئاسن، لە ژێرەوە، هەزار گۆڵ، 5 کم درێژە، کەناری گۆمەکە، لاپاڵ ئەولای، گرد ئاپلۆقەیداوە، لە کۆتایی گۆمەکەوە بۆ دیار بەکر 110 کم، گردۆڵکەو ئەنیشتو ناوەندی دۆڵ، چەند تونێلێ بۆ هێڵی ئاسن، دۆڵو کێوو پێچو گەلیو دەرە، لە خوارەوە وەکو گەلیەعلیبەگە، درێژەدارە، بۆ مادن 9 کم، بۆ دیاربەکر 90 کم، ژێر پردو هێڵی ئاسن لەسەرەوە، باری کۆمەلایەتی نافرەتان تا رادەیەك پارێزراوە، چارشێو ئەپۆشن لەم دەڤەرەدا کانیاوی زۆر و کێو، فابریکەو کارگە لە کێواتی مادەن، فابریکە لە سەرەوە، پرد، گەلی کۆتایی نایەت، 20 کم بۆ ئەرگەنی،

80 کم بۆ دیاربەکر، ژێر پردو سەری هێلی ئاسن، پردیکراوە، ناوی قوڕاوی فابریکە، لە خوارەوە، چەند تونێلێ، لە ناو گەلییە قوولەکەدا، بۆ شەمەندەفەر کراوەو کە پێیدا بڕوات، کۆتایی گەلی، دۆلی کەمێ کراوە، درێژەی گەلی، کۆتایی دێت، درێژی گەلییەکە 10 کم، کراوەیی، بۆ ئەرگەنی 2 کم، ئەرگەنی لە پێدەشتو نزمیو تەختی، ماوەی 40 کم، بۆ دیاربەکر.

## دیاربەکر:

بنکەی ئوستانە، مۆناتی 250 هەزار کەسە، دوژە مێژووییەکەی، دیوارەکانی بە ناوەندی شاردا 4 × 10 م، بە درێژایی شارداو شارەکۆنەکەی خستۆتە ناو خۆیەوە، ناوبەناو شەقامی پێدادەڕوات، ژوورو پەنجەرەکانی ماوە، جێگەی دانیشتن بووە، کورنەکانی قوللەی بەرگریبووە... پاشەواری ئولو مزگەوت – ئولو جامع، کڵێسە بووە، 2 هەزار ساڵ لەمەوبەر، ئەو مزگەوتە گەورەیە، موزەخانەی هەیە، لە خانی هەسەن پاشا، لە پشتەوەی مزگەوتەکە دوژە کۆنەکەی لە خاوەرەوە بەسەر ڕۆباری دەجلەدا فەرمانڕەوایە، ڕۆباری دەجلە بە خاوەری شارەکەدا دەڕوات، لە سەنتەری شار چوارڕیان، پەیکەر بە بەرگی سەربازییەوە، شوێنگەی شارەکە، دەشتە، کێوی لێدوورە، نزمایی نییە، پلەی گەرمی 42 پلە پترە، لە هاویندا و ساردە لە زستاندا، ئاوەدانی لەوبەری کەمە، پردی کۆنی بەرد، لەسەر ڕۆباری دەجلە، لە خوار دەرگای ماردینەوەیە، زانکۆی زیاگجویکلەپ، لەوبەری دروستکراوە، دیاربەکر، بتلیس، ئەتوان، ئەردیش، ئەخلات، ئەرجواز، ڤان، ئەم ڕێگەیە 500 کم تەتوان، گاوەش، ڤان، شاری ڤان لەبەر گۆمەکەوەیە.

**دیاربەکر – ماردین – جزیرە:**

لە دەرکی ماردینەوە بە کەناری دەجلەدا پردی کۆنی بەردین، بەسەر دەجلەوە بەولادا ، کەناری دەجلە، بۆ مادرین 90 کم، بۆ چنارە 26 کم، ژێر پردو شەقامی قیر و پردو چۆمو دارودرەخت لە هەردوولای ڕێگەوە، ڕێژگەی گچکە و ڕەشە بەرد بەملادا، کراوەیو قووڵی ڕێژگەی دەجلە بەولادا، پردو دەرەو نزمی، بەرزیو تەختی، شارۆچکەی چنار، شوێنی بە بەرزاییەوە، مۆناتی 50 هەزار کەسە، بۆ ماردین، 60 کم، دۆڵو ناوگردو شینایی، هەورازو پێچو ناوگرد و دووڕیانی دیرک، پێچی ئەویو نزار و ڕەشی، ریزە گردی بەرزتر، ناودۆڵ، سوڵتانکۆیی، پردو وشکەچۆم، ناودۆڵ، دەربەند و پاسگەی ئەمدیو، دۆڵی قووڵ بەملادا، لاپاڵو ڕووەوکراوەیی، 10 کم بۆ ماردین، پاسگە، هەوراز و سەختی، کێوی بەردین، دووڕیانی ئورفە، ماردین بە کێوەکەوە، بەمسیودا، ڕەزو باخو خانوو، هەوراز و پێچ، سەردەکەوی، سەختیو بەردەڵانی بۆ ئەودیو بەلای گۆڕستانو پارێگەدا، هەوراز بۆ ناو شار، شوێنگەی بەرزی، کێوی سەخت، پشتەوەی رووتەن، بەرەوخوار، مۆناتی 150 هەزارکەسە، بنکەی ئوستانە، بە زمانی عەرەبی دەدوێن، پتر تاکو زمانی کوردی، تێکەڵن، لە بنەڕەتدا مەسیحی – کریستیانی بوون، زمانەکە پاشماوەی سریانییە – ئارامییە و وەکو زمانی ئایینی ماوەتەوە، ئەمەش تەنها ناو شارەکە... دوژەکەی، سەربازخانەیە، سەرەوەی کێوەکە هەمووی دوژە، بۆ بەرگری... ڕێگە لە خوارەوە، خانووەکانی چین لەسەر چینە، بە دامێنی شاردا، قووڵایی ئەملای بۆ سافور 57 کم، بۆ جزیرە 190 کم، پێچو لێژی ئەودیو شار و پۆپی کێوەکەی پشتی دیارە، پردی سەر چۆمی وشکو کێوی بەردەڵانی، گوند بە بناری کێوی ئەولادا، هەوراز و ڕەز و باخ، لە هەردوو لاوە، دێهاتی گەورە یەملادا، لە خوارەوە ڕێی لاپاڵ، پێچ، ناو ڕەزو باخو دێبەری مەزرونەدا، پێچو هەوراز، پاسکو پاسگەی سەری، نشێوی ئەودیو، ڕەزو گرد، دووڕیانی ئومرلی، ڕێی خۆڵ، ناو دۆڵو پێچی، سەختی، شینایی، پەڵە چنار، بە ناو پەنار دەرەدا، دۆڵو کێوی بەرز، لە هەردوولاوە، دامێنی جۆگە و دارچنار، پێچو دۆڵ، 7 کم بۆ سافور، 150 کم بۆ جەزیرە، چۆمو چوخوردو چری، ئەملا، شارۆچکەی سافور، مۆناتی 7 هەزار

کەسە کوردن، عەرەبی تێدایە، پێش شارۆچکە، لای چاخانەی سەر رێی، باخو فێنکی، هەوارگەیە، گوندەکە بە بەرزییەوە... بە رێی جەزیرەدا، بە ناو باخو سێبەردا، جۆگە بەلای رێدا، هەورازو پێچو لابەلا، بۆ مدیات 45 کم، بۆ جەزیرە 140کم، دۆلی چرو دارچنار و دیمەن، بە ناو فلچدا، تەختیو دۆلو پێچو کراوەیی بەملادا، تەختی، گوندی مۆتکۆیی، کراوەیو فراوانی، گوند و ئاوایی، بەسەر گردەوە، مدیات 15 هەزار کەسە بەلای پەیکەری گچکەی ئەتاتورکدا، بۆ ئیدل 60 کم، بۆ جەزیرە 90- کم، پێدەشتو بەرزیو نەوی، نشێوی، گرد، گوند بەولادا لە بنارەوە، هەوراز، دووریانی خەبیرل، تەختی، کاپالە، گردو تەختیو دۆڵ، پێدەشت، زنجیرە کێوی راکشاو لە پێشەوە، نشێویو هەوراز، شارۆچکەی ئیدل سەر بە ماردین، 30 کم بۆ جەزیرە، بەرزیو نزمیو پرد، تەختیو پێدەشت، کێوی دیرو، بەولادا، زنجیرە کێوی جودی – گودی – گۆدی لە خوارەوە، کەشتی پێغەمبەر نوح (د.خ) لێی نیشتۆتەوە، دەرەبندی نێوانیان، گوند ئەملای ، نشێویو لاپاڵ، شۆڕ دەبێتەوە بەسەر جەزیرەدا.

**جەزیرە:**

شارۆچکەیە، سەر بە ئوستانی ماردینە، مۆناتی 20 هەزار کەسە، لەسەر ڕۆباری دەجلەیە، لە شوێنگەی نزمدا، پێدەشت بەرەو خابور و زاخۆ 55 کم بۆ زاخۆ، بۆ سلۆپی 31 کم، بە سەر پردو ڕۆباری دەجلەدا، شەقامی قیر، بۆ سەر پردی سنوور 49 کم، کەناری دەجلە و لێی دوور دەکەویتەوە بەلای چەپدا، چۆمو ڕۆبار، 14 کم بۆ سلۆپی، تاکو ئێرە لە جەزیرەوە 40 کم، هەوراز و تەختی، کێوی جودی — گودی، لای چەپ، کێوی بێخیر لەبەردەمتا، نشێوو هەوراز، تەختیو کراوەیی، سلۆپی شارۆچکەی سەر بە ماردین، بەولادا، مۆناتی 5 هەزار کەسە، پردی خابورو هێزل بە 20 م درێژی، لەسەروو پەرگەوە تێکەڵدەبن، خابوری زاخۆ هێزلی بۆتان، شوێنی گومرگو ڕێژیو فیزەو پاسپۆرت، پردی درێژی سەر ڕۆباری خابور، بەری ئەمدیو، میزۆپۆتامیا، بەخشی ئیبراهیم خەلیل، پۆستی گومرگو فیزەی زاخۆ، بۆ زاخۆ 11 کم، پێدەشت تاکو شاری زاخۆ.

**تاشکەند:**

شارە بەردینە، پێتەختی ئوزبەکستان، لە شەستەکاندا، تووشی بوومەلەرزە — زەمین لەرزە بووە، ئاوەدانکراوەتەوە لەسەر شێوەی نوێ، لە ئاسیای ناوەند و کازاخستاندا... بارەگای کاروباری ئیسلامییە... پلەی گەرمی لە هاویندا 45 پلەیە... ساختمانو بیناکانی بەرگەی گەرماو بوومەلەرزە دەگرن... لە شەقامەکاندا، فوارەی ئاو دەپەرژێت بە دارەکانی سەر شەقامەکاندا، لە مەیدانەکاندا، چاڵاوی گەورە هەیە... شارێکی پیشەسازیو ڕۆشنبیرییە..

بنەماڵەی باباخان، مەجید خان، ئیشانخان کوڕی زیائەدین خان، پشتاوپشت، مفتی و پێشەوای ئایینی ئەم هەرێمەبوون.

حەمید عینایەت، مێژوووناس، مامۆستای عەرەبی، بارزانی ساڵح توشی، لە زانکۆ، وتاربێژبوون... قورئانی پیرۆزی ئوسمانی کوڕی عەفان، لە موزەخانەی ئوزبەکستان، لە قاسەی پۆڵای ساردا، لە پێستی تەنک 353 پەڕە، 68 × 35 سم، هی

سەدەى یەکەمى کۆچى، تەیمورى لەنگ لە هێرشەکەیدا، هێناویەتى بۆ نووسراوخانەى سەمەرقەند، 4 سەد ساڵ لە مزگەوتى خواجە ئەحرار پارێزراوە. لە شەستەکانى سەدەى 19 دا، یەکێ لە جەنەراڵەکانى رووسى زەوتیکرد و بردى بۆ نووسراوخانەى پەترسبورگ، بە تەقەلاى ئیسلامەکان، دواى شۆرشى ئۆکتۆبەرى 1917، بە فەرمانى لینین، بردیانەوە، لە شارى ئوفە مایەوە، لە 1923 گەرایەوە بۆ ئوزبەکستان، لە موزەخانەى مێژوویى میللەتان، پارێزراوە.

## بوخارا:

شارى پێشەوا بوخارى، خاوەنى فەرمایشتەکانى پێغەمبەر محەمەد (د.خ) نوسراوەى جامع الصحیح، دواى قورئانى پیرۆز دووەم کتێبە و نووسراوەیە... بوخارى سالى 256 کە 878 ز، لە گۆرستانى خۆرتانغ، نزیکى سەمەرقەند، نێژراوەو خەوابگەیەتى.

نوسراوى الأدب المفرد، 350 پەرە، مفتى باباخانوف نووسیویەتى، ژیانو بەرهەمى پێشەوا بوخارییە... کۆشکى عالمخان، زیندانى... دواى پارانەوە، گوتووان، مردنیان، لاشەکانیان بۆنیدەکرد، ئەوساکە لا دەبران، کۆشکێکى یەکنهۆمى گەورەیە، لە ناوەندى باخێکى دلگیردا، تاوسى رەنگینى تێدایە.. ساختمانەکە لە دارى هەمەرەنگ، لەسەر شێوەى خاوەرى دروستکراوە.

## سەمەرقەند – سەمەرکەند:

پایتەختی تەیمووری لەنگە، لە کەناری رۆباری زرافشان، 2 جۆگەیە، دراچۆم، سناب... لەبەر چیای ئورتاوی قووچ، بەرەو ئاسمان، جەمسەری رێی ئاسن و ئوتومبیل، شەقامی راست، باخچەی گەشاوە، کۆشك، فێرگە، کۆشکی چەند نهۆم، زانکۆ، مێژووی سەمەرقەند - سەمەرکەند 15 سەدە لەمەوبەر، سوارەی ئەسکەندەرو شیربەدەست، ئارەب، لێرەو تەیمووری لەنگ و هێرش بۆ سەر وڵاتان.

هونەری ئەندازیاریو بیناسازی بابلی، فیرعەونی، چینی، یۆنانی – گریکی، مزگەوتی بیبیخان – بیبیخانم، گۆڕستانی تەیموور و شەقامی شازەند، بنکەی ئەستێرەناسی، ئولوخبەگ، مەیدانی دیکستان، مزگەوتی بیبیخانم، زانکۆی میرئارەب، لەسەر شێوەی بینای موستەنسرییە، مەیدانی فراوانی لەبەردەمدا، لە شەقامی شازەند، گۆڕی قوسەم عەبباس، ئامۆزای پێغەمبەر (د.خ) لەوێیە.

رۆباری زرافشان، دراچۆمی لێهەڵگیراوە، کشتوکاڵو چای بۆندار، پیشەسازیو مەزار، مۆزەخانەی سەمەرکەند، کە لە بەر دەرگاکەی کۆتەڵ تا پشتوێناوی تەیموور، بە بەرگی سەربازییەوە، زرێپۆش، کڵاوی مس، دوای هەڵدانەوەی گۆڕی تەیموور لەنگ، لە لایەن یۆنیسکۆوە، لە شێوەی کەللە ئێسك، دروستکراوە...

گۆڕستانی تەیموور، دایکی، مامۆستاکەی، 2 کوڕی لە ژێر خرگەی مەرمەڕی جواندا، لەم شارە، رووداکی، فیردەوسی، خەیام، جانی، ئیبن سینا، بابر، ئولوخبەگ، ژیاون.

شیرتەوانی موقیمی، دانش سەدرەدین ئەینی، بە هەڵبەست، میللەتیان هۆشیار کردۆتەوە.

# ڕەوت

## زەند، بۆ ئەوە دەدوێ

## داستان، دەگێڕێتەوە

## بەلگەو سەودا

18 دانانو وەرگێڕان، بە نووسراوەکانی فێرگەوە.

25 کۆنگرەو کۆنفرانس، بەشداربووم

2 کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوا 1959-1960.

7 کۆنگرەی نووسرانی کورد لە 1970.

1 کۆنگرەی کارمەندانی نووسراوخانەکانی عیراق لە زانکۆی سلێمانی 23-27/1977.

1 کۆنگرەی یەکێتی ئافرەتان لە سلێمانی 1978/12/10.

1 کۆنگرەی زمانگۆرانی جیهانی لە لوبنان، بێروت، ڕۆشە 1974.

1 کۆنگرەی مێژووناسانی عەرەب لە هەولێر – ئەربل 1986.

1 کۆنگرەی نێودەوڵەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری، بەغداد 1976.

1 کۆنگرەی ئەنجوومەنی شارەکان لە بەغداد.

1 کۆنگرەی یادی جەنەراڵ بارزانی ئەمر مستەفا لە پیرمام، سەریەن 1993/9/14.

300 زنجیرە وتار لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا، گەلاوێژ، نەورۆز، ڕۆژی نوێ، کاروان، دەنگی مامۆستا، سلێمانی، ژین، هاوکاری ... هتد.

5 خولی زمانی کوردی بەشداربووم، بە وتاربێژی، لە خانەکین، ئامێدی، سلێمانی.

بەشداریم، لە چلەو ماتەمو مەهرەجاندا، وەکو: کاردۆخی، کامەران موکری، مەولوود مەم، ئەمین زەکی، قازی خاڵ، خالید زامدار، مەنگوری، قادر کەسنەزانی، منداڵە گەشمۆردەکانی فێرگەی ئاسۆ، ئەفسەر حەمە ساڵح ژاژڵی، ئەحمەد خواجە ... هتد.

بەشداریم لە بیرەوەریو یادی 2 سەد ساڵەی سلێمانی، یادی ئەحمەدی خانی لە هەولێر، جگەر خوێن لە دهۆک، چەند کۆڕو کۆبوونەوەی وێژەیی، چیرۆک، ئەڵقەی لێکۆڵینەوە، سیمینار... هتد.

**کەریم زەند:**

کوڕی حەمە ئاغا ساڵح حاجی سەلیم ئەمیناغا گەلی – چنگنی – چگینی زەنگنە، لەتەك سیامەنسوریو تالەبانی، بەرەبابێکن، چیگینی، زەند، هەر هەم لەکن، چیگینی، دەفەرێکی لورستانە، چنگنی، میرنشینی چنگیان، گوندی چنگیا شاربازێڕ، ریشەو ڕێچەڵەکو بنەڕەتی ئەم خێڵە مەزنەیە، لە دروستبونی شار سلێمانیدا، لەتەك بابانەکان هاوکاربوون لە ئاوەدانکردنەوەی ئەم شارە باوباپیرانی نشینیانی گەڕەکی مەڵکەندین، کە بە خێڵی حەماغا مەڵکەند ناسراون.

کەریم زەند، لە گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی، لە ساڵی 1924 هاتۆ جیهانەوە، خوێندنی ئایینی، فێرگەیی، سەرەتایی، ناوەندی، تێدا تەواوکردو چۆتە ئامۆژگەی فێرکاران، لە بەغداد، ئەعزەمییە... دوای تەواوکردنی، بۆ مامۆستا لە خوێندنگەی فەیسەڵییە بۆ ماوەی ساڵێکی خوێندن... دووبا چۆتەوە بۆ خوێندن لە بەغداد و ئازربیجان لە چەرخی کۆماری کوردستان مەهاباد، رووەوە موکریان، رۆیشتووە، بەشداری کۆمارەکەبووە... بە مامۆستایی مەهابادو بۆکان، وێڕای نمایندەی خودی پێشەوای مەزن، قازی موحەمەد بووە، شاری بۆکان.

دوای شکستی کۆمار و نیسکۆی بزاڤی گەلی کورد، لە جەنگی پارتیزانی بەرەو رووسیا کشاوە بە مایەی شانازییەوە، سەربازی ئەو گۆڕە پانەبووە، ئەگەر فریای دوا شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفیدی مەزن کەوتووە.

ئاوارەیی، رەهەندەیی، دەربەدەری، 21 ساڵ.

## ساڵو ئاوابوون:

**ساڵ:**

13 ئاوارەیی، دەربەدەری، رەهەندەیی، بێکارەیی، گەڕیدەیی، بە پێ هەموو سەرتاپانی کوردستان.

2 زیندانی سەخت بە زنجیرەوە لە بەندیخانەی مەڵبەندی بەغداد، گرتوخانەی کەرخ، بەندی تەنهایی، لە ئەبوغرێب.

6 دەستبەسەری، دوورخراوەیی، لە کەناری زۆنگاوەکانی باشوری میزۆپۆتامیا، ئوستانی ناسرییە، ئەلبوساڵح، کەحلا، قەلعەسوکەر.

---

21 بەشێکە لە ژیانم.

دوای ئاوارەیو رەهەندەیی، دەربەدەری، ماوەی 13 ساڵ، 2 ساڵ لە بەندیو زیندانی، گەڕاوەتەوە بۆ نیشتمان بە نەداری، بە گیرفانی تەهی – واڵاو خاڵی، دوای 14 گەلاوێژ 1958، بەرپابوونی کۆماری ئیراق، هاتۆتەوە سەر پیشەی مامۆستایی، زۆری نەخایاند، بە دەستبەرسەری دوور خراوەتەوە بۆ ماوەی 6 ساڵ لە ئوستانی ناسرییە – زیقار، لە ئەلبوساڵح، قەلعەسوکەر، کەحلا.

دوای ئەوە، گەڕاوەتەوەو ئەرکی فێرکاری و سەرپەرشتیاری پەروەردەیی، بۆ نەهێشتنی نەخوێندەوارییو فرکردنی بە کارمەندی و بریکاری کارگێڕی.

ژیانی رۆشنبیریو نووسینو سەوداو مامەڵەی لەتەك تیپو وشەو رستەدا، لە 1940 بەدواوە، لە گۆڤاری گەلاوێژەوە بە ناوی نهێنی و ئاشکرا، کورتە چیرۆکی وەرگێڕدراو، تاڵی ژیان، هێزی سامدار، لەسەر ئیزیدی – ئێزدی، نامیلکەی نووسیوە بە راسپێری مامۆستای وێژەی عەرەبی لە ئامۆژگای مامۆستایان، بەڕێز، ئەبدولکەریم دوجەیلی... 1947 بزاڤی کوردستانو ئازربیجانی بە عەرەبی نووسیوە، لە 1958 چاپکراوە... 490 زنجیرە وتاری لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکاندا نووسیوە، لە ژین، رۆژی نوێ، گۆڤاری نەورۆز...

لە بواری جوگرافیاو زەویناسی کوردستان و کۆمەڵایەتیدا، نامیلکەیەکی بەم ناوەوە چاپکردووە، دەستنووسی هەیە، وەکو پیرۆزگە، گەشت، جوگرافیای کوردستان، کوردستانی پەرتکراو، کرکوك و السلیمانیه صنوان.

پیرۆزگە، ژیانی کۆماری کوردستانە لە مەهاباد، گەشتی زەند، گەڕیدەیی بە پێ سەرتاپا کوردستان، خاوەری میانە، ئەوروپا، باکوورو ناوەندی ئەمەریکا،

## چاپکراوان:

1- بزافی کوردستانو ئازربیجان بە عەرەبی، چاپخانەی کامەرانی 1959.
2- سەرنجێ لە ئابووری رامیاری، وەرگێڕان، چاپخانەی کامەرانی 1959.
3- جوگرافیای کوردستان بە کورتی، چاپخانەی کامەرانی، 1958.
4- مێژووی ئەزادو پەیوەستەگی، وەرگێڕان لە تەك قانعدا، 1969.
5- میللەتی کورد، دانان، چاپخانەی کامەرانی، 1970.
6- ئایین و باوەر لە کوردستاندا، چاپخانەی کامەرانی، 1971.
7- ئینجلەکانو کرداری نوێنەران، وەرگێڕان لە فەرەنسییەوە لەتەك خوالێخۆشبوو، بەڕێز قەشە یوسف پەری، چاخانەی راپەڕین، 1972.
8- زمانی کوردیو هونەری وەرگێڕان، دانان، چایخانەی کامەرانی، 1977.

## وەرگێڕان:

1- پەروەردەی کۆمەڵایەتیو نیشتمانی پۆلی 4 ی سەرەتایی، ئەبدولغەفور مەلا ئەلی، جەمال غەفور، مستەفا سالح کەریم، کەریم زەند، 1969، بە خۆڕایی.
2- خوێندنەوەی کوردی، بۆ هەڵمەتی نیشتمانی گشتی نەخوێندەواری تەوزیمی، قۆناخی بنچینە، چاپخانەی ئیخلاس، بەغداد، کەریم زەند، جەمال فەتاح کەریم، چاپی یەکەم 1978، 151 وانە.
3- خوێندنەوەی کوردی بۆ هەڵمەتی نیشتمانی نەخوێندەواری تەوزیمی، قۆناخی تەواوبوون. مستەفا سەید ئەحمەد، نەریمان، کەریم زەند، جەمال فەتاح کەریم، چاپی یەکەم 1978، چاپخانەی شەرقی ئەوسەت، 44 وانە، 144 لاپەرە.

4- جوگرافیای سروشتی، پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، وێژەیی، شاکیر فەتاح، عومەر مستەفا، کەریم زەند.. چاپی یەکەم 1974، چاپخانەی دارئەلجاحیز، بەغداد، 352 لاپەڕە.

5- جوگرافیای ئێراق، پۆلی 5 سەرەتایی 1959، 2 جار چاپکراوەتەوە.

6- جوگرافیای ئابووری پۆلی 6 ی وێژەیی. کەریم زەند، خەسرەو مستەفا، کەریم شێخانی، عومەر مارف بەرزنجی، حەمە غەریب موحەممەد قادر، چاپی یەکەم، 1983، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ژمارە 2 ، هەولێر – ئەربیل، ژمارەی سپاردن، 1346، 385 لاپەڕە.

7- خوێندنەوەی کوردی بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری پیشەیی، قۆناخی تەواوکردن. قادر بابان، ساجد ئاوارە، کەریم زەند، مەهدی غەفور شەریف، چاپخانەی شەرقی ئەوسەت، بەغداد، 1976، 80 وانە، 176 لاپەڕە.

# ئازووخە

**بیرەوەریو یادەوەری:**

ئاوڕدانەوە لە یاد و بیرەوەری سەردەمو چەرخەکانی دێروک، تێڕوانینە بۆ ڕێنمایی ئایندە، سووڕی مێژوو دەردەخات، خوڵو هەڵسوکەوتو هەورازو نشێویو تاڵیو سوێریو شادیو خۆشنوودیو کامیابیو بەختەوەری ژیان، لەو ئاوێنەیەدا دەبینی، کە ئاوڕی لێدەدیتەوە، ئاراستەی ڕاستییەکی جاویدیو نەمریمان دەکات، کە شارەزایی مەردوومەو کاتی سەرهەڵدانی نیشاندەداتو ئاماژەی سەرەتای ژیانی مرۆڤە ئەو شارەزاییەیە، کە سنوورو کۆتایی نییەو جاویدە، لەسەرهەڵدانی مرۆڤەوە، لە پێشینیانەوە بۆ نەوەو نیژەی نوێ، هاتووە، لە زنجیرەیەکی نەپساوەی پەیدەرپەیدا، بە تەڵقەی هەمە جۆرە، کێشو سەنگو هاوتای خۆی لە تای تەرازووی مێژوودا، کە کەلچەری گەلە، لە ماوەی مێژووی دیموکراتیدا، کە دەربڕینی ژیانە، لە قووڵایی لاپەڕەکانی کۆششی مەردوومەوە بۆ ڕاهاتن لەسەر هەلومەرجی جوگرافیو کاریگەری دەنو وەرگرتنو تیشکدانەوەی بۆ گەلانی دوورو نزیک، ئەو ئەندازە و سەنگو قورساییەی دیاردە دەکات لە ناو کەشمەکەشی ژیانو کێشەی میللیدا، بەرەنگاریو بەرەوڕووبوونەوە، بەدوابەدوای جەنگی جیهانیو پێچانەوەی ساڵ لە نێو دووتوێی خول چەرخو چاخو زەمەنو زەمینددا، ئەم کارەساتانە، شوێنی سەرنجو تێڕوانینە لە سەرهەڵدانی چیرۆکی مرۆڤەوە، لە کەلکامێشەوە، کێشەی جاویدیو مانەوەی هەتاهەتایی، ئامانجو ئاواتی ڕەچاوکراوی مرۆڤ بووە.

کاروانی تەمەن، وەرزو قۆناخەکانی، درێژی زستانو گێژەڵوکە و گێژاو و گەردەلوولو زریانی ژیان، ئومێدی هاتنی بەهار و کراوەیی خونچەو دەربازبوون لەم ململانێو زۆرانبازییەداو مەترسی خنکاندنو مەلەمەزانینو ساڵانی پێچراوەی خولو سووڕی گۆی زەویو شەپۆلەکانی کۆمەڵەی خۆرو گەشتو گوزارەکانی ڕووالەتی خۆر.

ئەمانــە هەرهــەموو، فورســایو ئــەرکی پــیرۆزی مرۆڤایــەتی دەردەخــات، لــە بەدیهێنانی داستانە مەزنەکەیدا.

ئەگــەر رەوابێــت بڵــێین، کــە مێــژوو جەمســەرو کــۆو گــردو کۆکــەرەوەی چــەرخەکانی دێرکــو ســەردەمی پێشــوون بــە کارەســاتیەوە، بــە پیاوانیــەوە، کــاتو سەردەمی هەنووکەش، پاڵپشتەو پشتگیرو پشتیوانی ئەو رووداوانەیە.

## 1924.

لەم ساڵەدا، چاوم بە ژیان هەڵهێناوە، داستانی کاروانی ژیانم دەست پێدەکاتو ســەرهەڵئەدات، مــاوەی ســاوایی، خــەریکی بەسەرچــوونە، بــەرەو خوێنــدن بــۆ لای مامۆستای ئایینی، لە ژوورە فوڕەکانــدا، پێشوازی ســاڵی 1930 دەکەین... هــەرای 6ی ئەیلولەو دەبدەبەی نەتەوایەتیو لافی میللیەتــە، راپەڕینــە، کورد، گەرمەکیــەتی چارەنووس بنەخشــێنێ بــە خــوێنی گەشــوناڵی لاوانــی گــەشموردەو ســەرقاڵەیان، عەولەسیسی بەهەشتی و هاوڕێیانیەتی، لە بەسەرهاتو تێپەڕبوونی تەمەن، 6 ساڵە تەواو، بە پێی ئاراســتەو ئامۆژگــاری بــاوکی بەڕێز، بەرەو خوێندنگە چووین، لە فێرگەو خوێندنگەی دووەم گیرساینەوە، ئــەو ســەردەمە، هــەموو شــاری سلێمانی 2 فێرگەی تێدابوو، خوێندنگەی یەکەم، لە جێگەی بازاڕی نوێی ئیستەکەبوو، پێیان دەوت، مەکتەبی یەکەم، تاکو 2ی ناوەندی تێدابوو، خوێندنگەی دووەم، لــە خانــەی کاك ســەعید مــارف، لای خانــەقای مەحوییــەوە، پێــی دەوتــرا، مەکتــەبی دووەم، بــە زاری کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە دەیانووت، مەکتەبی یەڕۆ، جەیەکو دوورو تاکو پۆلی 5ی سەرتایی تێدابوو.

لەتەك براو هاوڕێیەکانمدا لە گەڕەکی مەڵکەندی وەکو کاك کەریم قــەرەنی، هۆمەری مام رەحیم کۆڵەیی و گەلێکیتر... مامۆستا تۆفیق فیکرەت ئەبدوڕەحمان، باوکی د. حیکمەت، بەدوری، خاتو منیرە، وەریگرتین بە پێشوازییەکی بەگــەرم، لــە پۆلی نیو دایاننانین، وەکو پۆلی ئامــادەیی دوای 2 رۆژ، داوام لــە مامۆســتاکەمان کــرد،

ناوی نوری ئەفەندی حاجی ساڵحاغابوو، دەستم هەڵبڕی وتم ئەفەنی، بە وشەی باوی سەردەم، هاتە پێشەوە لێم، وتم: ئیملامان پێبکە.

ئەویش، وتی: چی؟.. وتم ئیملا، ڕێنووسمان پێبکەن، لە مەبەستەکەم گەیشت، ئەویش بە ساکارییەوە، وتی: بنووسە، ئیمڕۆ چووم بۆ مەکتەب، خوێندنگە.. منیش بە ڕێنووسی سەردەم نووسینی کۆن، کە سەنگو کێشی بۆ بزوێن دانەدەنا، بە داینەمەکیەتی نووسین، خێرا، ڕستەکەم بۆ نووسی... مامۆستا کتوپڕ، دوای سەرنجێك لە نووسینەکەم، وتی: کێ تۆی لێرە داناوە، منیش وەڵامێکم نەبوو، بەخێرایی گواستمیەوە بۆ پۆلی یەکەم، ئەمە هەنگاوی یەکەم بوو.

لەو ماوەیەدا، کۆسپو تەگەرە هاتە ڕێم، منداڵانی گەڕەکی چوارباخ و بەروپشتی، ڕێگەیان پێدەگرتین، داوای باجیاندەکرد، توانجو پلاری ناشیرینو دزێویان تێدەگرتین، بە چاوی سووك سەیریان دەکردین... ئێمەش، ڕۆژانەکەمان نانێەك پتر نەبوو، تێیدا نەدەبوو باجو مافی تێپەڕبوونو ترانسێت، لە زەوی مەڵکەندییەوە بدەین بە چوارباخ، مزەی ترانسێت، پاسپۆرت بدەین، وێڕای گاڵتەجاڕی، سەریاندەکردە سەرمان، ڕێگەیان دەبەستو دەیانوت: پاس، واتە کرێی تێپەڕبوون... ئێمەش بەرگری توندو بەگژاچوونەوە، بەرەنگاریان بووینەوە، مامۆستا، یاخو کەسوکارمان لە مەڵکەندی ئاگادارکرد لەم دیاردە دزێوە، بۆ ئەوەی لەم گۆڵمەزە ڕزگاربین، ملمانکەچنەکرد، چۆکمان دانەدا بۆ ئەو بارە دواکەوتووە، تێمانگەیاندن کە ئەمە زەوی ئێمەیە، بێپەساپۆرت و ڤیزە پێیدا دەڕۆین، بە هاوکاری کەسو کارو هاوشێرەم کاکە کەریم قەرەنی... بەم ڕەنگە کارو فەرمانی خۆمان سەرئەنجام هێنا، بەو پێودانە، پۆلی 1، 2 تەواوکراو چووینە پۆلی 3...

بەڵام لەم قۆناخەدا، فێری خۆدزینەوە بووم، بێئەوەی هیچ هەستێ بکەم بە ئاڵۆزیو تەگەرەو کۆسپ، چ لەلایەن دەستەی مامۆستایانو کارگێڕی خوێندنگەو، چ لە خانەوادەکەم، ماوەی هەفتەیەك، لەباتی چوون بۆ خوێندنگە، ئەچووم بۆ دەشتی ئەحمەدی ساغا، سەیری مووشێنم دەکرد، خۆم ئەخلافاند تاکو کاتی بەربوونی شاگردانی خوێندنگە، ئەوساکە بەرەو خانە دەهاتمەوە، ئامۆژگاری باوکی

بەرپێزم لە گوێمدا دەزرنگایەوە، کارگوزارەکەمان، کاك حەمە کەریم کەوەلە، دوایی حەجیکرد، ئاگاهی لێدام لای کارگێڕی خوێندنگە، عەلی ئاگاشەوقی سەعید، کە بە راستی پەروەردکار بوو، دەروونناسبوو، بێئازار و لێدان، ئامۆژگاری پەروەردەناسییەوە، ئاراستەیکردمەوە بۆ خوێندن، هانیدام بە رستەیەك وتی: کوڕم، تۆ قوتابییەکی زیرەکو پێشکەوتوویت، خوو رەوشتت پەسەندە، چۆن خۆت دەدزیتەوە؟.. بە راستی تاکو هەنووکە زۆر شەرمەزاری ئەو کارگێڕو کارگوزارەم، چونکە هۆی پێگەیاندنی نەك هەر بە تەنها من، بەڵکو نەوەیەکی پێگەیاند.

کارگوزار، کاك حەمە کەریم، لە کاروفرمانەکەی خۆیدا، هەرمابوو، ساڵ لە دووتوێی گۆی زەویدا پێچرایەوە، هەتاکو بووم بە مامۆستا لە خوێندنگەی فەیسەڵییە ئەو هەر کارگوزاربوو لەو خوێندنگەیە.. کە دیم کڕنووشم بۆ برد، هەردوو دەستیم ماچکرد، وتم: تۆ منت پێگەیاندووە، تۆ لە جێگەی باوکمی، باوکم، لە پۆلی 2ی سەرەتاییەوە کۆچیکردبوو.. دوای پۆلی 3، لەك ئەلە خوێندنگەی یەکەم کرایەوە، خوێندنگەکان ناونران..

یەکەم، ناونرا بە فەیسەڵییە، دووەم بە ئەیووبییە، ئەو لقەی لە خوێندنگەی یەکەم جودا کرایەوە، ناونرا بە خالیدییە.

ئێمەش گوێزرایەنەوە بۆ خانەی حاجی موحەممەدی لاوە، لە پشت گومرگەسووتاوەوە، پۆلی 6ی تێدا کرایەوە، مامۆستا عەلی ئەگاشەوقی سەعید، هەر کارگێڕبوو، بەڵام گوێزرایەوە، بوو بە کارگێڕی خوێندنگەی فەیسەڵییە، دوای نشینی مامۆستای مێژووناس، ساڵح قەفتان، ئەدیب ئەفەندی کرا بە کارگێڕی ئەیوبییە... مستەفا بەهجەت مەولود، بوو بە کارگێڕی خالیدییە.

بەم جۆرە، شاری سلێمانی 3 خوێندنگەی تێدابوو... لە باری خوێندنەوە، لە خوێندنو وانەکاندا باشبووین، بەڵام لە بیرکاریدا نە، چێژمان لێوەرنەدەگرت، تاکو پۆلەکانی ناوەندیش، تەنها بەهای دەرچوونمان دەزانی.

مامۆستای کۆمەڵایەتی، مێژوو جوگرافیا، کاریگەریەکی چاکی هەبوو، بە تایبەتی، نەزهەت ئەفەندی فەتاح شەشخانە، مامۆستای جوگرافیاو زانابوو،

زوربەی مامۆستاکان، کۆنە ئەفسەری ئوسمانی بوون، گەڕابوونەوە بۆ نیشتمانی دایک، کرابوون بە مامۆستا، لەوانە: مامۆستا ساڵح قەفتان ئەبدورەحمان، تۆفیق فیکرەت ئەبدوڕەحمان، خالید سەعید و هیتر.

مامۆستای جوگرافیا، ئەزهەت ئەفەندی، زوربەی ئەو جێگایانە گەڕابوو، وانەکەی خۆشبوو، لە 90 دەرەی بەرزمان تێدا وەردەگرت، گوێمان بۆ شل دەکرد، وای لێکردم کە بایەخی تەواوی پێبدەم، لە ژیانما هەر ئەو هۆکارەبوو ببم بە گەڕیدەو جوگرافناس – ڕێفینگ – پیادەگەڕی، ڕووەو چۆڵو بیابانو کەژو کێوو دەشتودەر، ماندووبوونو گەڕان، ئارەق ڕشتن، لەم ئاکارەدا، لەو کاتەوەی کە خۆم ناسیوە سەرنجو تێبینی کۆبکەمەوە، کەرەسە گرد بکەمەوە، گەشتی خۆم بخەمە ڕێزەی گەشتی ئەوانەی لەم بوارەدا کارمەند بوون، لە میللەتانیتر تاکو بیسەلمێنم کە کوردیش گەشتیارو گەڕیدەو ڕێفینگی هەیە، گەشتنمای هەیە، بۆ ئەوەو نیزەی ئاینده.

کۆکردنەوەو گردکردنەوەی، کەرەسەکانی منیش دەیسپێرم بە ئەندازیارانی بیناسازی ئاینده دوارۆژ بۆ بنیادنانی جوگرافیای کوردستان.

## وێڵـــەدەر:

لە پۆلی 6ی سەرەتایی بووم، لە فێرگەی ئەیوبییە، گەشتێك ڕێکخرا بۆ گوندی وێڵەدەر، بە کێوی گۆیژەوە، لەو گەشتەدا، مامۆستاکەمان، ئوسمان حاجی عارف دەباغ، بەشداری نەکردم، چونکە کەم تەمەنو لاواز بووم لە رووی جەستەوە... ئەوە، کاریگەری تەواوی کردە سەر هەستم، وێڕای بێبەشبوونم لە بەزمیو سۆزو داڵدەی باوك، منیش رۆژی هەینی بوو، بەیانی زوو، لە خەو ڕاپەڕیم، چووم پێشی ڕێگەم گرتو لە تەکیاندا کەتمەڕێ، زۆر لە هاوڕێیەکانم چالاکتربووم، سەرنجی مامۆستاکانم ڕاکێشا، ئەمە هاندەربوو کە گەشتوگوزارو گەڕیدەیی بکەم بە پیشە.

## ئەشکەوتی هەزارمێرد:

ئەنجامی ئەزموونی 6ی بەکەلۆریمان وەرگرت، چوینە ناوەندی سلێمانی، تەنها یەك ناوەندی هەبوو، کەریم قەرەنی برام یەکەم بوو، منیش دووەم، هۆمەر مام رەحیم کۆلەبی، بە فرە دەرچوو، ئەوە کاری تێکردو گریا، هەفتەیەك نەهاتەدەرەوە، لە ماڵەوە 3 هاورێ بووین، پێشبڕکێمان ئەکرد لەسەر یەکەمیو دووەمی.

هاتینە ناوەندی، مامۆستا زەکی ئەمین کارگێڕبوو، هاتە ناو پۆلە یەکەکان، 2 پۆل بوو، وتی: کێ ئەچێت بۆ خانەی مامۆستایان لە رۆستەمییە؟.. هۆمەر مام رەحیم، دەستی هەڵبڕی، چونکە خولیای ئەوەبوو، نێردرا بۆ ئەوێ، ئیمەش پۆلی یەکمان بڕی، لە 2 ی ناوەندی بە گەشت چووین بۆ جێشانەو هەزارمێرد، لەتەك مامۆستا ئەحمەد ئیبراهیم قازیو مامۆستا مەلا جەلال مەحمەد سەیفوڵا، گوڕی مامۆستای ئەمر، مەلا کاکە حەمە، بەرەو ئەشکەوتەکان رۆیشتین.

گوندی هەزار مێرد 35 خانەوادە لە پەنا دۆزێکدا، لە دامێنی کێوی بەرانان، لای راستی دێکۆن، داربەڕوو، لای چەپی جێشانەیە.

رێگە لە سلێمانییەوە، بەکرەجۆ، بە پێدەشتدا، باڵجوخ، بنگرد، 2 گوندن، لە هەردوو بەری جۆمی ئاڵیشە، لە جۆگەی کاك ئەحمەد، ئەپەڕێتەوە، دەشتاییەکی کەم، دەگەیتە هەزارمێرد.

رێیتر، هەر لە سلێمانییەوە، ولوبە، کانیگۆمە، جۆمی ئاڵیشە، جێشانەو هەزارمێرد.

لە سلێمانییەوە بۆ زار ئەشکەوتەکە 15 کم... پێشی هاورێیەکانم کەوتم، چووینە ناو ئەشکەوتەکانەوە، کترێمان پڕکرد لە ناوی ناو ئەشکەوتەکە، ماوەیەك رۆیشتین بە ناو ئەشکەوتی تاریکدا، دەنگی ویزەویزی شەمشەمەکوێرە دەهات، تاپڕێکمان نا بە دەنگەکەوە، کزبوو ماوەیەك، دووبارە هەڵیدایەوە... ئەشکەوتە گەورەکە، دەمەکەی گچکەیە، بۆ چوونە ژوورەوە گەرەکە خۆت دابنەوێنی، لەسەر سك، دوای چوونە ژوورەوە، بەری فراوان دەبێ 4 کەس بە ریز، بە پێوە ئەتوانن

پێیدا بڕۆن... 200 م ڕۆیشتین، ڕەنگە دووری ئەوسەری 300 م ببێ، ئۆکسجین کزبوو، لایتو چرا رووناکی نەدەدا، بڕیارماندا، منو کاك کەریم قەرەنی و هاوڕێیەکانمان گەڕاینەوە، لەبەر مەترسی دڕندەو تەنگە هەناسەیی و ویزەویزی دەنگی شەمشەمە کوێرەو بۆگەنی ڕەتنە.

## پشووی هاوینە:

لە پشووی هاوینەکاندا، دەچووم بۆ کەرکوك بۆ سەردانی خزموخوێش، هەروەها بۆ هەڵەبجە، لەوێوە، دەچووم بۆ بیارە و گوندەکانی بەرویشتی هەڵەبجە، وەکو: ئەبابەیلێ، بامۆکو ئەنەب، جەلیلە، دەرەشیش بەپێ، چووم بۆ بیارە بۆ دیدەنی بەڕێز شێخ ئەلائەدین.

هەڵەبجە – بیارە 18 کم، بۆ خورمال 15 کم... ڕێی زیخەڵانی، بە پێدەشتدا لە بناری ئەبابەیلێوە، ئەنەب، جەلیلە، بە ناو باخدا، چاخانەی بیاوێڵە، چاخانەی دەرەشیشی خواروو، چەند جۆگەو ئاوێك، دەرەشیشی ژووروو، خەرپانی جۆمی بەنەو چاخانەکەی ، دووڕیانی تەوێڵە، پردو ئاوو چۆم، خاکێلان، بناری چەپی گوندی نارنجەڵەو گوڵپو باخەکۆن، ئاوو پردی زەردەهاڵو، چاخانەکەی لای ڕاستی گۆڕ، گوندی دەرەقەیسەر، لای چەپی بنجۆی دڕە، لە شیوێکدا، بەرەو هەوراز، بەردەلانی، پێچ، خانووەکانی پێشی بیارە و چاخانەکەی ئاوایی بیارە، لە دۆڵێکدا، خانووی بەرەوخۆراوا، گەڕەکەکانی، پشتچۆ، ئاودێ، شێخان... مۆناتی 5 هەزار کەسە، خوێندنگەی سەرەتاییو ناوەندیو تیمارگەو چاخانەو بازاڕی گچکەی تێدایە... خانەقاو تەکیەی شێخانی ڕێبازگەی نەخشبەندی تێدایە، ئارامگە – خەوابگەی پێشەوایانی ئایینی وەکو شێخ ئومەر شێخ نەجمەدین، بەڕێز شێخ ئەلائەدین، هەڵبەستراون، چۆمەکەی لە کێوی شرامەوە دێت، کە زنجیرە کێوی هەورامانە، هەردوولای چۆمەکە هەڵبەستراوە، خانووەکانی وشکەکەڵەکو دوونهۆمن، تەمەنی بیارە لە 450 ساڵ پترە، لە وشەی بوێرە، بیدارەوە هاتووە، دۆڵێکی لێژو درێژ، دارستانو باخ، دایپۆشیوە، بە تایبەت دەراوی دەرەقووڵو بنجۆی دڕە.

لە پردەکەوە، ئوتومبیل دەڕوات بۆ تەوێڵە، 17 کم، قەدپاڵو ناوباخ، هەوراز، لای راستی دۆڵ، چاخانەی دەرگا شێخان، گوندەکە لە سەرەوە، گۆڕی ساوا – پێچو، هەوراز و لابەلا، هاڵە، کانیرەزنەی بەڵخە، ناوباخ، تافگە لەسەرەوە، سەری سەیسەلام، باخەکانی، خوارووی بیارە دیارە، پێچ بەرەو ئەودیوی بەڵخە، سەری شنرویَ دیارە، چاخانەو گوندی بەڵخە، خوێندنگەکەی، لە سەر رێگە، کانیبەڵخە، چاخانەو کانیمێشڵە، کانیاو و سێبەر، سوورەچناری گەورە، لەسەر کانییەکە گۆماو لە خوارەوە، پێچو لابەلا، خوارەوەی باخی شەمی رەزەکانی سۆسەکان، باخەکانی گوندی هاوار لە قووڵاییدا، بەرامبەر ملەشۆپی، دیارە.

بەودیودا سنوور، باخەکانی تەوێڵە، هەوراز، تەوێڵە، چاخانەی گەڕیات، خانەقا، ناو گوند، دۆڵ، هەردووبەری خانووی وشکەکەڵەکو دوونهۆم، مۆنانی 8 هەزار کەسە، بازاڕو فرۆشگەو چاخانەو خوێندنگە، نیمارگە، پۆستی تێدایە، گەڕەکەکانی: چلانە، مالیدەر، بەرانبەر.

## ئاوێسەر:

سەیرانگە 2٫5 کم، بە پێ بە هەورازدا، بە ناو باخو زنەر سێبەردا، لە دامێنی هەورامانی تەخت، سەری تەخت، پۆپەکەی، گوندی هەورامانی تەختو بەشی ژاوەروو بە ئوتومبیل لە شەقامی سنوورەوە، دەڕوات، ئەودیوی هەورامانی تەختە 500 خانەیە، باخو ئەستێڵ بناری ئەو دیوی، گوندی خۆشو ئاوەدان، کەماڵانە... گوندەکانی هەورامانی تەخت، سەرپیرو ، سێلتی، بلبە، نۆین، کەلچی، ژیوارە.

بناری ئەودیو، تەختایی، باخ، ئەستێڵە تاکو لای هەجیج، سەرچاوەی رۆباری سیروان، لە بەردەمی گوندی سیلنیەوە، لە دۆلی 3 کوچکەدا، دەرەی تاکو دزاوەرو کۆتایی باخەکانی، دەرەکەیتری تاکو ئاوێسەر دەچێت.

تەوێڵە 3 گەڕەکە، خانەقا گەورەکەی 1255 ك 1868 ز دروستکراوە، خەوابگەی شێخ ئوسمان سیراجەینی تێدایە، بەرانبەری خانووی شێخ، سوورەچناری گەورە لەبەر دەمیدا، بڵندگۆی پێوەیە.

## کۆمەڵەی برایەتی، 1937:

رۆژنامەی ژین ژمارە 85، 9/14 و
ژمارە 86، 1972/9/21

دوای کۆمەڵەی خۆیبوون، 1927، دوای بەسەرچوونی رۆژانی رەشی شەشی ئەیلول 1930، کپبوونەوەی دەنگو دەبدەبەی کوردایەتی، جنگوجووڵی دوژمن بۆ بەربەستی بزاڤی نەتەوەیو خنکاندنی، پەیمانی سەعدئاباد بەسترا 1937.

لە گەرمەی ئەم رووداوەدا، رۆژگاری رەشی ناهەموار، گەلی کورد، کەوتەخۆی لە ناو ئەو گێژاوەدا، ناچارکرا، کە خۆی رزگار بکاتە لەو گەردەوە، رۆشنبیرانی کورد، لەو کاتەدا هاتوچۆی خانەقای مەحوییان دەکرد، بە مەبەستی خۆخرکردنەوە لە بارەی کێشەی نەتەوەیو زیانی میللییەوە، پەلەقاژە بکرێت بۆ دۆزینەوەی رێگەچارە، لەم بارەیەوە، لە ئاکامدا، کۆبوونەوەیەك سازکرا لە خانەی شێخ لەتیف حەفید لە پایزی 1937، لەو شەوەدا ئەم بەرێزانە ئامادەبوون: ئەسعەد مەحوی، د. نوری فەتوحی ئەلەکە، خودی شێخ لەتیف حەفید، شێخ جەلال حەفید، شێخ لەتیف سنەوی دانساز، ئیسماعیل شاوەیس، سەدیق شاوەیس، ئەحمەد فەخری، عەلی قەفتان، موحەمەد خدر تاپۆ، مەحمود ئەحمەد، حەمە سەعید سلیم جاف، شێخ قادر سەید ئەحمەد، ئیبراهیم گوردی، فوئاد رەشید... لەم کۆمایەدا، بڕیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی برایەتی درا، دەستەڵاتی رەها درا بە ئەسعەد مەحوی، کە بنێرێت بە دوای یەکتا بەگ، حەماغای خوبیلە کاکەیی، جێگەی باوەڕی شێخ مەحمود ئەمر، بە هاوکاری شێخ لەتیف دانساز، مەحەمەد قودسی مەحمود، ئاگادارکرا... ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی گەیشتە 20 کەس.

خانەقای مەحوی بنکەو بارەگابوو، وەرگرتنو سوێندو سەوگەن، بە قورئانی پیرۆز، هەر لە خانەقابوو... لە خانەقا سەری هەڵداو هەر لەوێش کۆتایی هات... سوێند ئەخورا کە ناپاکی نەکات بە گەلی کورد و هیچ کوردێ، لە کۆبوونەوەکاندا، سەرۆکو جێگر دادەنرا، تاکو کۆبوونەوەیەکیتر، فەرمانڕەوا نەبوو، بە ئامادەبوونی

12 ئەندام کۆبوونەوەی یاسایی پێکدەهات، بە سەرۆکو جێگرەوە... سەرۆك مافی 2 دەنگی هەبوو.

جارجار، لە خانەی خوبیلە و شاوەیس کۆبوونەوە سازدەکرا، لە پرۆژەی بەسوود دەدوان، بەڵام زوربەی کۆبوونەوە هەر لە خانەقا پێکدەهات، چونکە بەرستکەبوو، شوێنی گومان نەبوو، خۆشم لەوێ سوێندم خواردووە، نیمچە رازگربووم، پۆستەبەر و نامە هەڵگربووین لە تەك مستەفا کەریم غەفوردا، لقو پەل لە ناو خوێندکاران و سەربازو پۆلیسو فرۆشیارو ئەرککێشو، کارگەراندا، بڵاو بۆوە..

لە خوێندکاران: نوری شاوەیس، مەحەرەم موحەمەد ئەمین، مەحەمەد قودسی، مەهدی خوێ، قادر ئەبدورەزاق، حەمە سەعید حاجی ئیبراهیماغا خەفاف، ساڵح ئەحمەد بەگ بابان، مستەفا کەریم غەفور، ئەحمەد خدر، کەریم زەند...

بەرپرسی پۆلیس، حسێن ئەسعەد زەنگنە، کەریم کۆیی... بەرپرسی سەرباز، فەتاح شاڵی لە بەغداد... لە بازرگانان، حەمە فەرەج شاڵی، وێرای هاوکاری تەواوی خێزانو فامیلیای شاڵی، کۆمەکیان بەم کۆمەڵەیە... دەمانچەی کاك حەمە فەرەج شاڵی بوو لای من بە متمانەی حەمە سەعید حاجی ئیبراهیم خەفاف... هەروەها مارف چیاوك، سەرۆکی یانەی سەرکەوتن، هاوکاربوو.

لقی کەرکوك، جەمیل رۆژبەیانی، لکی کۆیە، کاکە زیاداغابوو، پەل بۆ ناو مەنگورایەتی درێژکرد، مەلا خەلیل مەنگوڕ هاوکاریدەکرد، بەهۆی مەلا ئەبدوڵا ناوێکەوە، بەم جۆرە پەرەی سەند، لە سایەو سێبەری شێخی ئەمر مەحمود حەفیدا.

ئەبدوڵا بەگ، سەهرانبەن، هاوکاربوو، پەل هاویشتبوو بۆ لای یانە... بەندیخانەی سلێمانیان شکاند بە پێی پرۆگرامو نەخشەی کۆمەڵەی برایەتی بە کۆمەکی کاك فوئاد عارف کە فەرماندەی سوپابوو لە سلێمانی 1936، پیلان دانرا،

2 دەمانچە نێردرایە ژووری زینـدانی بـۆ بـەرێز حەمـە رەشـید خـانی بەنـدکراو لەتەك سەید عەتاو مەجید گەڵباخی.

ئەمە لە جـەژنی تاجگوزاریـدا، بـە هاوکاری شـێخ لـەتیف حەفیـدو ئەسـعەد مـەحوی ئەخشـەی شـکاندنی بەندیخانـەو گوشارخسـتنە سـەر ئوسـتاندار مەجیـد یاقوبی، رایانئەراند، بۆمبایان فڕێدایە ناو خانـەی عـەلی حیجازی کارگێڕی پۆلیس بە دەستی ئەحمەدی قالە شاسوار، هەروەها دادیار عەزیز خەڵوسی لە ئەنجامی ئەم کارە شۆڕشگێڕییەدا، بەندیخانـە شکا، حەمـە رەشید خـانوو سـەید عـەتاو مـەجید گـەڵباخی رزگـاربوون، بـەڵام مەجیـد گـەلباخی 4 تفـەنگی هـەلگرتبو، پشـتی دانەوانئبوو، بۆ هاورێکانی، پشتێنەکەی لە لاقی ئـاڵابوو، گیرایـەوەو درا بـە دادگاو دوایی بەربوو، بە کۆمەکی کۆمەڵە.

شـێخ مسـتەفا قـەراخی کرایـە ئوسـتاندار، بزاڤـی رەشـید عـالی گـەیلانی بەسەرداهات، شێخی مەزن کە لە بەغداد، سلێخ دەستبەسەربوو، دەرفەتی هێنـا بـە ناو زەنگنەو تاڵەباندا و بە یارمەتی شۆڕسوارانی گەرمیان، خۆی گەیانـدە گونـدی سیتەك، لە شاربازێر... شۆفێرە مەردەکەی ، ئەحە خورشە، میرزا ئـەزیز ئاخـەیی تـەرخانی، حـاجی دەروێـش حسێن خانـەکینی، پێشوازی چەکدارانی سـەعیدئاغای جافـەرانو کوێخـا ئـەحمی سێوسـێنان، شـێخانو ئاغاگـانی قـەراخ، سوارچـاکانی میراودەلی، پشدەری، شاربازێری، ئەندامانی کۆمەڵەی برایـەتی، کـەریم زەنـد، ساڵح ئەحمەد بـەگ بابـان، مستەفا کەریم غـەفور، بەشـداری ئـەو بزووتنەوەیـە بـوون، ئەسـعەد مـەحوی، ئـوری ئەحمـەد تـەها، چوونە سـیتەك بـۆ ئـەوەی لـە رازونیـازی شێخی ئـەمر بگـەن... دوای هاوکاری کـرا لـە تـەك مامۆستای بـاڵا رەفیـق حیلمـی ئەمر، بەڵام ئەو هاوکارییە پێکنەهات بەهۆی رۆژگارو سەردەمەوە.

مسـتەفا خۆشـناو، ئومـەر مسـتەفا – ئومـەر دەبابـە، لایـەنگری کۆمەڵـەی هیوابوون، هەستی رازەی گشتییان دەربڕیوە، بۆ ئـەم کۆمەڵەیە.

نماینـدەی شـاری کۆیـەی خـەباتگێڕ، مامۆسـتا حەمـە حـوێز – حەمـە رەش، کاك سەمەد موحەممەد مەنجەڵ، هاتن، بە هاوڕێیەتی خۆم چووینە دیـداری شـێخی

مەزن، بۆ گەیاندنی مەبەست. هەروەها پەیوەندیکرا لەتەك موحسین ئەبوتبیخ، کۆمەڵەکە گەیشتە پۆپە، خواست، پێشکەشی میری بەغدادکرا، بەهۆی نماینـدە، شێخ جەلال حەفیدەوە، بریتیبوو لە:

1. بانکی کشتیاری، پیشەسازی لە شارە کوردەکان دابنرێت.
2. لە وەزارەتەکانـدا، بـە تایبـەتی شایارێتی جـەنگو سوپا، کـورد، بـە گـوێرەی مۆنات، بەشدار بێت.

میری لەمە راچڵەکی، کەوتە گرتنو پەلاماردان و بەندکردنی ئەندامانی کۆمەڵەکە... لـەم کاتـەدا، بـەرێز سـەرۆك بـارزانی ئـەمر، کـە لایـەنگری ئـەم کۆمەڵەبوو، هەلی بۆ رەخسا بە کۆمـەکی کۆمەڵەی برایـەتی، شێخ لەتیف حەفیـد، ئەسعەد مەحوی، چەکو وڵاخ ئامادەکرا، منیش ئاگاداری ئەو ئەخشەیەبووم... بـە ئوتومبیلی شێخی ئەمر و شۆفێری مەردی، ئەحە خورشید، نوری حەمە سوور، حەمـە پیـزە، مچـە قرگـەیی، محـەی سالەسـوور... مچـە قرگـەیی، مکایـەلی، براگەورەبوو، شێخ حسێن بەردەزەردی بـەرزنجی، حەمـە پیـزە بێسـەری، ئەحە ببورەیی، بلباس، ئـەم هاوکارانـە، نموونـەی بەرجەسـتەی تـەبایی خێڵە کوردەکان بوون لەو چەرخەدا.

ئـەم چەکدارانە، پارێزگاری شێری بـارزان، شێری کـەپرەرە – پیرەکـەپرە، جەنراڵ بارزانی ئەمر بوون، تاکو خۆی گەیانـدەوە بێشەو لانـەی خـۆی لـە بـارزان، کـە شۆڕش بـەرپا بکـات، لـە ئـەنجامی ئـەم رووداوە، بـەرێز خـودانی بـارزان شـێخ ئەحمـەد و ئـاوارەکراوانی بـارزانی، دەستبەسـەران، رەوانـەی ئوسـتانی حیلـەکران، لەوێ، دیدەنیم کردوون.

لێرەدا، مەحمود خانی دزڵی دەستبەسەر لە سلێمانی، شێخ لەتیف دانساز بە ئەسپی خۆی، رەوانەیکردەوە، لەو کـارە ئاگاداربووم... ئـەم هـەموو ئامادەییـە، بـۆ بەرپابوونی شۆڕشێکی نەتەوەییبوو... بەڵام، تەنها سەرۆك بارزانی ئـەمر بـەڵێنی خـۆی بـەجێهێنا، لـە لایـەکیترەوە، هەرەشـەی دوژمنـو هاتنـەوەی نـوری سـەعید و

دامەزراندنی دامودەزگای شاهێنی و هەڵاتنی رەشید عالی گەیلانی بۆ وڵاتی سعودییە.. ئەم هۆکارانە، شێخی مەزنی ناچارکرد بە دانیشتن لە گوندی داریکەلی.

| | |
|---|---|
| وەک مەدینە بن نەبی‌بن | یا نەجەف بن بن عەلی |
| شاری غەزنە بن مەحمودە | ئیستە وەک داریکەلی |

حەمدی ساحبقران

شۆڕش، هەرەسی هێنا، بڵاوەیپێکرا، هەرکەسە بۆ شوێنی خۆی، دوای دەرکردنی بەخشینی گشتیو دەستبەسەرکردنی شێخ لەتیف حەفید لە بەغداد، شێخ لەتیف حەفید بە چەند چەکدارێکەوە رووەو کوردستانی خاوەر رۆیشت بۆ چەمپاراو و بلەکیو ئارمەردە، چووە بارەگای حەمە رەشید خان لە بانە، کە ئەو سەردەمە شاری بانە و سەقز لە ژێر رکێفی حەمە رەشید خاندابوو، سوپای ئێرانی دەرپەڕاندبوو.

دوای ئەوە شێخ لەتیف حەفید چوو بۆ گوندی زەرواو، بۆ لای سەلیم خان، پێشوازی بە گەرمی لێکرا، حەوانەوەی خۆیو لەشکرەکەی گرتە ئەستۆ، شازادە تەلاخانمی کچی بە کەژاوەوە پێشکەشکرد، بۆی ناردە گوندی کەناروێ، ئەو کیژە میرە، ئەو خانمە رشتە شۆخوشەنگەی لێمارەکرا، ئەگەرچی حاجی قادر خانی ئارمەردەو ئەبدوڵابەگی سەیرانبەن، لەم بارەیەوە، درێغییان نەکردووە.

ئەسعەد مەحوی، هاتەوە بۆ داریکەلیو دووبارە گەڕایەوە بۆ مەریوان، باشماخ، دیدەنی مەحمود خانی کانیسانانیکرد

شێخ لەتیف حەفید خۆیو چەکدارانو یاوەرانی هاتنە سەردەشت، سەلیمخان مەحمودخان زەرواو ئەحمەدی 500 سوارەی بۆ خڕکردەوە، کاروباری ئازوخەو ژیانی لەشکرەکەی گرتە ئەستۆی خۆی... دادگا دامەزرا، ئەسعەد مەحوی باوەڕپێکراو دادیارو جێگرو بریکاربوو، ستونو کارگێڕ بوو، ئاگاهی دەرنەکرد، پەیوەندی لەتەك قازی موحەممەدی پێشەواو سۆڤیەت – رووسیاداکرا، نامە بۆ ژەنراڵی سۆڤیەتی نێردرا... دوای ماوەیەك، سەرۆکی ستادی سوپای رووسی ژەنراڵ لوپۆڤ ژەنراڵ ئەتاکشیۆڤ، هاتنە سەردەشت، زمانزانیان لەتەکدابوو، بە ئازەری

ئەدوا... رووی تێکردین دوای پێشوازیکردنی لە پردی کەلۆێوە، تاکو خانەی حاجی غەفوراغای شافیعی لە سەردەشت، دوای حەسانەوە، وتووێژ کرا، وتی: کێشەی کورد، لە پرۆگرامدا نییە، لە خشتەو نەخشەی کاردا نییە، مەگەر جەنگی سێیەم، هەرچەندە جەنگی سێیەم نابێت، 2 جار دووپاتیکردەوە وتی نییەت، واتە نابێ، جەنگی سارد نەبێ، جەنگی پێشبڕکێی چەك دەبێت، خۆتان هەڵگرن بۆ دەرفەتێکیتر، لە رووی هەستی مرۆڤایەتییەوە.

پەیوەندیکرا بە سۆڤیەتەوە، لە ئاکامدا، ژەنراڵ ئەتاکشیێف، بابلۆف سوپاپود و سالاری سوپای سوور لە رەبەتو پردی کەلۆێوە هاتن بۆ سەردەشت، لە خانەی حاجی غەفوراغا کۆبوونەوەکرا، زمانزانی لەتەکدابوو، بە ئازەری دەدوا، دوای تەواوبوونی وتووێژ، رووی تێکردین، منیش لەوێ ئامادەبووم، وتی: جەنگی سێیەم ئەگەر، مەگەر، نابێت بە رووسی نییەت، کێشەی کورد، لە پرۆگرامدا نییە، لە نەخشەدا نییە، لە بەرنامەدا نییە، خۆتان هەڵگرن بۆ دەرفەتێکیتر.

لە کاتێکدا گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانیبوو لە شاری ستالینگراد لەسەر رۆباری ڤۆلگا، بە چەکی سپی، ئەم ئامۆژگارییەی کردین، وتی جەنگی سێیەم نابێت... لەملاشەوە، لە کوردستانی باشور فورساییو گوشار خرایە سەر شێخی نەمر، لە رێگەی شیخ قادر حەفید و بابە عەلییەوە ناردیان شێخ لەتیفیان هێنایەوە.

ئەسعەد مەحوی، دوای ئەم گفتوگۆیە، بە دڵنیایی گەڕایەوە، کۆمەڵەی برایەتی لاوازبوو، کۆتایی هات، هەر لە خانەقا، هەروەکو چۆن لەوێش سەریهەڵدا، کۆمەڵەی هیوا پارسەنگی قورس بوو، پەرەی سەندو هاتە سەر شانۆی رامیاری، تا رادەیەك دەستی هەبوو لە بزاڤی بارزانی 1943 دا.

بە هاتنەوەی ئەسعەد مەحوی بە راشکاوی، شێخ لەتیف حەفید پشتی چۆڵبوو.

بۆ ئەم رووداوە، چاوگ بەڕێز خودی حاجی مەلا ئەسعەد مەحوی بووە.

## کۆمەڵەی هیوا – 1938:

سەرهەڵدانی ئەم کۆمەڵەیە، بە ناوی دارکەرەوەبووە، لە وشەی کاربۆناری ئیتالییەوە وەرگیراوە، رەژوو، خەڵوزکەران.

لە کەرکوك 1938-1939 لە کۆبوونەوەیەکدا، لە ئوتێلێك دامەزراوە، دەستەی دامەزرێنەری 6 ئەندام بوون، یونس رەئوف – دڵدار، نوری شاوەیس، نوری مەلا سمایل، جەلال ئەمین بەگ، جەلال حامد جاف – پاشا... مامۆستا حەمە حەویز ئەڵێ: کاتێ خوێندکاری ئامادەیی بووە، لە هەولێر، لە شاگردان، یونس رەئوف، پاوەرانی ئەم تەقەلایە دراوە، بۆ دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە لە خانەکین، مەلا رحیم بەشداریکردووە.

لە هاوینی 1940، مامۆستای باڵا، رەفیق حیلمی ئەمر، بانگهێشتکراوە بۆ شەقڵاوا، کراوە بە سەرۆکو ئەویش ناوەکەی گۆڕیوە بە هیوا – هێڤی، ئەو گۆڤارەی کە لە سوریە دەردەچوو لەو سەردەمەدا.

کۆمەڵەی هیوا، پەرەی سەند، لقوپۆپی بڵاوبۆوە، ئەفسەرو رۆشنبیرو کاسبکارو ناودارى کوردی تێدا گردبۆوە، لەتەك کۆمەڵەی برایەتیدا وتووێژ کرا بۆ پەیدابوونی نێوانێك.

هیوا، بەرنامەو پێڕەوو پرۆگرامی نەبوو، وەکو یاسای ناوخۆی چاپکراو، 4 گۆڤاری دەستنووسی دەرکرد، هەر ژمارەی 6 دانەی لێدەنووسرایەوە، بە دەست، بە نۆرە دەخوێنرایەوە، دروشمی، بژی سەرۆکی باڵا، گۆڤارەکەش وێژەیو پەروەردەیی بوو پتر، هەر بەرپرسێ دەیتوانی سوێندی ئەندامی بەشداربوو بدات، ماوەیەك لە ژێر چاودێریدا دەبوو، 3 ئەندام نامزەدی دەکرد، ئەپاڵێورا بۆ ئەندامی.

ئەندامی کارای، جەلال ئەمین بەگ، ئەمین رەواندوزی، شێخ حەسیب تاڵەبانی، رەشید باجەلان، موکەرەم تاڵەبانی، فایەق هوشیار، عەونی یوسف لە هەولێر، زەید ئەحمەد نوسمان پۆستەبەر، رەفیق تۆفیق چالاك، رەئوف مارف، بوون... شانەکانی زۆر نهێنی نەبوو، هەر 6-5 ئەندام بەرپرسێکی هەبوو، ئابوونەو کۆمەك کۆ دەکرایەوە، بەڵام بودجەی تایبەتی نەبوو... سوێندو سەوگەن، بە خوداو و خاکو ئاڵای کوردستان بوو، کۆمەڵێکی نەتەوەیی بوو،

خەباتی بۆ گەلی کوردبوو، ئەگەر ئەندامێ ناپاکی بکات، ئەو خەنجەرەی کە سوێندی پێخواردووە، مەرگی بێت.

دوای کپبوونەوەی بزاڤی کۆمەڵەی برایەتی، هاتنەوەی حەفید مەحمودی ئەمر بۆ گوندی داریکەلی، لە سەر پاشەرۆکو لاشەی برایەتی، کۆمەڵەی هیوا، پەرەی سەند، پەلی هاویشت بۆ دەڤەری بارزان، دەستێکی باڵای هەبوو لە بزاڤی بارزانی 1943دا.

لێرەدا، هەڵوێست گۆڕدرا، لاوەکان داوای پشتگیرییان دەکرد بە خۆپیشاندان، ئەم کێشەیە، هۆکاری سڵەمینەوەو کۆسپو تەگەرەبوو، لە نێوانی بنەماو پایەگاو سەرکردایەتی کۆمەڵەکە، دووبەرەکیو ناکۆکی خستە ناوەوە، کزیو کەنەفتی رویدا، کۆمەڵە کەوتە گیانەڵا، خۆخۆیی پەیدا بوو، زۆرینەی ئەفسەرە کوردەکان بوون بە لایەنگری ماجد مستەفا تاکو 1944 ئەمە خایاندیو بە تەواوی ناوی هیوا کشایەوە لە مەیدانی رامیاری، لەسەر لاشەی هیوا کۆمەڵە پێشکەوتووخوازەکان، هاتنە کایەوە، چالاکی رامیاری نوێخوازی دەستپێکرد، بە مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە.

لاوەکان هەریەکەیان نوێنەری هێڵێکی رامیاری بوون، کۆمایەك پێکهات لە خانەی سەدیق شاوەیس، بە مەبەستی یەکگرتن، کاك سەدیق شاوەیس، سمایل شاوەیس، نوری موحەمەد ئەمین، مەحەرەم مەحەمەد ئەمین، کەریم زەند، مامۆستای پارێزەر ئیبراهیم ئەحمەد – بلە، ئەنوەر مەلا حەماغا، ئامادەبوون.

نوری مەحەمەد ئەمین، بە ناوی دارکەرەوە، بە ئومێدی زیندوو کردنەوەی، کەریم زەند، بە ناوی کۆمەڵەی ئازادییەوە، پایەگاو بنەمای دیموکراتی مەڵبەندی، دووخی، راڤەکرد، لە ئەنجامدا، نوێخوازان زاڵبوون بەسەر بڕیارەکاندا، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد – بلە، وتی:

خۆشبەختم کە ئێوە پێشکەوتوخوازترین.

لێرەوە، کۆمەڵە پێشکەوتووخوازەکان، بە بارودۆخێکیتر، بە هەلومەرجێکیتر، کەوتنە کار، لەوانە کۆمەڵەی ئازادی، ژ.ك. بوو.

گەشتی زەند، دەستنووس، کەریم زەند،

1936، تاکو هەنوکە.

## مایس – 1941 – ئایار:

بزاڤی رەشید عالی گەیلانی، هاتنەوەی شێخی نەمر، مەحمود حەفید، بەشداریم لەم بزاڤەدا.

ئەزمونی پۆلی 3 ی ناوەندی دواخرا بۆ خولی دووەم لە پایزدا، لە کەرکوك، لە هۆڵی شارەوانی، بە ئەنجامێکی سەرکەوتوو رووەکردە خانەی مامۆستایان لە بەغداد، ئەعزەمییە، ئەگەرچی تەقەلامدا بۆ ئامادەیی سەربازی... دوای پەشیمانکردنەوە، هاوڕێیەکانم چوون بۆ ئامادەیی سەربازی، بوون بە ئەفسەر، منیش لەتەك، موحەمەد شێخ مستەفا، هادی موحەممەد خوێ، باقی ئەحمەد سابیر، چووینە خانەی مامۆستایان، لەوێ لەتەك مستەفا سەید ئەحمەد - نەریمان، موحەمەد تۆفیق وردی، یەكانگیربووین، هەریەکەمان لە ئوستانێك، سلێمانی، کەرکوك، هەولێر.

100 خوێندکار وەرگیرا بەپێی ئوستانەکان، بە گوێرەی نمرە، پۆلی یەکمان بڕی، کرا بە ئامۆژگا، گەشتی ئوستانی بابل، شاری خانەکینمانکرد، مامۆستای جوگرافیا ئەبدولونعیم مەرسی میسری لە تەکماندابوو، لە پۆلی کۆتایی ئامۆژگە، مامۆستا ئەبدولکەریم ئوجێلی وانەی عەرەبی، وێژەی پێدەوتین، هاندەرمبوو، لەسەر ئێزدی نووسیم.

لێرەوە دەستمکرد بە نووسین لە گۆڤاری گەلاوێژدا، کەوتمە سەوداو مامەڵە لەتەك تیپو وشەو رستەدا، بە ناوی بایز و کەریم موحەممەدو هیتر، نووسیومە.

**پێنجوێن، 105 کم لە سلێمانییەوە:**

**گەشتی هاوینی:**

کانیبا، دلربەروولە، خەراجیان، عەربەت – ئاربەت، خڕی جەناقچیان، کانیبانکە، موان، گرێزە، فورپچیا، سەرای سوبحاناغا، گوندی فلرخ، سەیسادق، دووڕیانی هەڵەبجە، شانەدەری، دۆڵەسوور، هەوراز، کانیسپیکە، پردی ئاڵهاریز و

سێبواران، پێنچی بێمەحکەمە، کانیمانگا، پێنچەکانی ملەکەوە 13 پێنچە، راوگان، ناوشاخان، بووبان، پێنجوین.

دوو هەفتەی تێنامامەوە، لە ئوتێلی حەمە نێرگەلە، قاوەسازی شێخی ئەمربوو، ئەوەی جێگەی سەرنج بوو، پۆلیسێکی سوارە، هەموو بەیانییەك، سلاوێکی سەربازی بۆ ئەسپەکەی ئەکرد، لە تەویلەی ژێرخانی ئوتێلەکەدا، پرسیانکرد، بۆ ئەم سلاوە سەربازییەی بۆ دەکەی؟ وتی: قۆمیسەرەکەم 6 دینار مووچەکەیمتی، سلاوی بۆ دەکەم، ئەسپەکەم بەهای 6 دینار پتر ئالیکی بۆ وەردەگرم، ئەسپەکەم لە قۆمیسەرەکەم پتر وەردەگری، چۆن سلاوی بۆ ناکەم!.

## کۆمەڵەی زانستی – 1926:

### خوێندنگەی کۆمەڵەی زانستی.

رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە 607، پێنجشەممە 1981/10/8

خوێندنگەیەك بە پیتاکو باربوو کۆمەکی هاوولاتیانی شاری سلێمانی، پێکهاتبی، خوێندنگەی میللی بۆ تونێژو چینەکانی کۆمەڵگە، بەپێی فەرمانی وەزارەتی، شاباری ناوخۆ ژمارە 2571، رۆژی 1926/2/24 دامەزراوە، لەسەر خواستی دەستەی دامەزرێنەری کە ئەم بەرێزانەبوون:

| | | |
|---|---|---|
| -1 | ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ | سەرۆك |
| -2 | جەمال بابان | جێگر |
| -3 | مستەفا قەراخی | ئەندام |
| -4 | عیزەت بەگ وەسمان پاشا | = |
| -5 | حەماغا ئەورەحماناغا ئەبدولاغا | = |
| -6 | رەمزی فەتاح | = |
| -7 | فایەق مارف بەگ | ژمێریار |
| -8 | رەفیق ئەفەندی | رازگر |

بۆ یەکەمجار، حاجی تۆفیق – پیرەمێرد کارگێڕبووە، بە بەرگی کوردییەوە،
بە یەکدەنگ، هاوارپاندەکردو دەیانوت:

واوەرن لاوەکان یەکگرن، یەکگرن، زانستی راگرن

یاریدەی لاو نەبێ، کۆششی لاو نەبێ

هەولو کۆششمان رۆژ لەتەک شەو نەبێ

بۆ بلند کردنەوەی زانستی کوردان

ناگرین جێگەیان، وتثەکەین نیشتمان

ئیمرۆ لاوی هەموو میللەتی رووی زەمین

هەولئەدەن بۆ بلاوکردنەوەی زانین

زانستی جێگەی عیلمو عیرفانە

شوێنی رووناکی ژینی کوردانە

بۆیە وا بەرزنو گەورەو دووربین

ئێمە پاشکەوتوی دەستی نەزانین

شاکر فەتاح

دوای 3 سال، کەریم سەعید بەگ زانستی، کرا بە کارگێڕ، لە پۆلی یەکەوە
تاکو 6ی سەرتایی تێدابوو.

1933، مامۆستا شاکیر فەتاح، کرا بە کارگێڕ، ژمارەی خوێندکار و فێرخواز
240 دەبوو، مامۆستایانی: فایەق بێکەس، ئەبوبەکر هەوری، ئوسمان ساحیبقران،
ئەورەحمان مفتی.

لە خولی شاکیر فەتاحدا، شێوەی پرۆژەی نەهێشتنی نەخوێندەورای وەرگرت
تاکو 1937... دوای ئەمە داخرا، کۆمەلێکی تر لە لاوان تێکۆشان بۆ
زیندووکردنەوەی، لە 1942، دووبارە خۆری زانستی هەلهاتەوە... دەستەیەکیتر
بوون بە هەلسوڕێنەری کە ئەم بەرێزانەبوون:

| | | |
|---|---|---|
| -1 | کەریم زەند | کارگێڕ |
| -2 | فایەق هوشیار | ئەندام |
| -3 | ئەبوبەکر هەوری | ئەندام |
| -4 | نوری مەحەممەد ئەمین | ئەندام |
| -5 | موحەرەم موحەممەد ئەمین | ئەندام |
| -6 | قادر ئەبدورەزاق | ئەندام |
| -7 | مەحەممەد تۆفیق عەزیز | ئەندام |
| -8 | هادی موحەممەد خوێ | ئەندام |
| -9 | نوری شاوەیس | ئەندام |
| -10 | مەحەممەد شێخ مستەفا | ئەندام |

بەرهەمی ئەم خوێندنگەیە، ڕۆژمێر، یەکەم فڕۆکە بەهۆی زەنبەلەکەوە، 15 م دەڕۆیشت.

لە هەرای 6ی ئەیلول 1930، بەشداریانکردووە... ناردنی خوێندکار بۆ دەرەوەی کوردستان، یەکێ لەوانە بەڕێز ئەنوەر سایب بوو، لەسەر بودجەی زانستی نێردرا بۆ ئەوروپا.

بەمجۆرە تاکو 1944-1945، کەوتە ژێر ڕکێفی میریەوە، ناسرا بە ناوی زانستی ئێواران.

بڕوانە: پیرەمێرد، نووسینی موحەممەد ڕەسوڵ هاوار، نامیلکەی پرشنگ، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد، ل 72، بڵاوکراوەی شاکیر فەتاح، سرودەکەی لەسەر ئاوازی ئاڵای لوبنانی، **کلّنا للوطن**، خوێندکارەکان بە سروود دەیانوت.

**مامۆستایەتی – 1943-1944:**

**مێژووی خوێندنگەی فەیسەلییە:**

یەکەم خوێندنگە لە سلێمانی، مەکتەبی یەکەم، نموونەی سەعادەت، تەشویقییە، ڕاهێنگەی مامۆستایان، پێشکەوتن.

گۆڤاری دەنگی مامۆستا ژمارە 4 ساڵی 1،
ت1، 1971، نووسینی کەریم زەند.

بەپێی زانیاری مامۆستا فوئاد ڕەشید و ئەندازیار نوری کاکە حەمە – نوری غەربی، ئەم خوێندنگەیە، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، چەرخی ئوسمانی، بۆ یەکەمجار، بە ناوی ڕوشدییەی سوپاییەوە، لە ساختمانی تیمارگەی ناوبازاڕدا، ئەوەی کە کراوە بە بازاڕی نوێ.

1911، بە باربووی هاووڵاتیانو هاوکاری سەرۆکی شارەوانی سەردەم، دروستکراوە، ناوی ئامادەیی موڵکی بووە، مامۆستا فایەق وەیسەڵ کارکێڕ بووە.

1914، کراوە بە بارەگای فەرماندەیی سوپا و نشینگەی ڕامیاری.

1916، بە ناوی تەشویقییەوە، کراوەتەوە، وەکو خوێندنگە، مامۆستایانی: زێوەر ئەفەندی، مەلا سەعید کابان، شێخ ئەبدوڕەحمان نەسیب، عەلی ئەفەندی کوردی باکور، ئەبدوجەبار ئەفەندی، شێخ مەحمود، حەمدی ئەفەندی، سەید ئەحمەد بەرزنجی، بوون.

1917، کراوە بە بارەگای شێخ مەحمودی نەمر.

1918، نموونەی سەعادەت، لە خانەی تۆفیقاغا، وەکو خوێندنگە، لە چەرخی ئینگلیزدا، لە فێرکارانی: مامۆستا ڕەشید کابان، شێخ ئەبدوڕەحمان نەسیب، مەلا سەعید کابان، مەحەمەد باشقە – باشەکە، مەحەمەد زەکی کابان، زێوەر ئەفەندی، بوون.

1919، گوێزرایەوە بۆ کانێسکان، لە خانەی نەجیب ئەفەندی، لە فێرکارانی، مامۆستایانی: مامۆستا سەبری.

1920، کراوە بە نشینگەی مێجەر سۆن، چاپمان، هۆڵد، لاین.

خوێندنگـە، گوێزرایــەوە بـۆ قشـڵەی جـاران، مامۆسـتا عەبـدوڵا نـوری، کـارگێڕبووە، لـە 1920، مامۆستا سـەعید زەکی لـە 1922، دوای ئـەوە، ناوەکەی بووە بە مەکتەبی یەکەم، لە کانێسکان، لە خانەی بابە عەلی، بەرانبەر بە مزگەوتی گەورە، چەرخی عێراق تا 1924، هەر بەم نـاوەوە ماوەتـەوە، 7 پـۆلی بـووە... لـە فێرکارانی، مامۆستا ئەبدوڵا عەزیز هەولێری، ئەلفبای کوردیو دیدەوانی وتوەتەوە، مەلا سەعید کابان، قورئانی پیرۆزو ئاین، عەزیز فەرەج سـەلیم زوڵاڵئاغـا، قـامیش عـەزیز، زمێـرەو گۆرانیـو سـروود، مسـتەفا مـەولود بەهجـەت گـارووت، وەرزشـی وەرگرتبوو..

1928-1929، کراوە بە 2 خوێندنگە، یەکەمیان چۆتە شوێنی پێشووی لـە ساختمانی رامیاری نهۆمی سەرەوە، پۆلی 5 و 6، 1 و 2 ی ناوەنـدی تێـدابووە... ژمـارەی پـۆلی 2ی ناوەنـدی 4 خوێنـدکاربوون، یـەکێکیان ئەحمـەد رەفیـق، بـای ئەحمەد، لە ئامادەیی مەڵبەندی بەغداوە هاتبوو... نهۆمی خوارەوە 4 پۆل بـووە، تۆفیق فیکرەت ئەبدوڕەحمان کارگێربووە.

خوێندنگەی دووەم، لە حەوشی گەورە، بەرانبـەر خـانووی غـەفور شـاڵی لـە دەرگـەزێن، دوایـی گوێزرایـەوە بـۆ خـانووی سـەعەی مـارف، لـە خـوار مەیـدانی ماستەکە نزیکی خانەقای مـەحوی، لـە کـارگێڕانی؛ تۆفیـق فیکـرەت ئەبـدوڕەحمان، عەلی ئاگا شەوقی سەعید، بوون.

1930، یەکـەم خوێندنگـە، گوێزرایــەوە بـۆ سـابونکەران، بـۆ خـانووی یەکتابـەگ، 4 پـۆلی بـووە، تۆفیـق فیکـرەت ئەبـدوڕەحمان کـارگێڕو مامۆسـتایانی؛ رەفعەت ئەفەندی، مەلا سەعید کابان، خالید سەعید ئەبدوڵا، شاکیر سەید حەکیم، شاکیرە رەش، بوون، تاکو 1931، لە سابونکەران ماوەتەوە.

1931-1932، لـە پایزدا، گوێزرایـەوە بـۆ خـانووی جـەمیل سایب، نزیکی مزگەوتی گەورە، 4 پۆل بووە، تەنیشتی خانەی شێخ قادر حەفید.. تۆفیق فیکرەت ئەبدوڕەحمان، کارگێڕو فێرکارانی؛ نەزهـەت ئەفەنـدی، واحیـد ئەفەنـدی، خالیـد ئەفەندی، شێخ کەریم، عەزیز فەرەج سەلیم قامیش، شاکیر سەید حەکیم – رەش.

1933، لافاوی گەورە، لکێکی تـری لێجوداکرایـەوە، بـە نـاوی شوعبە، چۆتە خانووی حاجی ساڵح قاسم، لە دوایدا ناونرا، خالیدییە... مامۆستا ساڵح قـەفتان،

یەکەم کارگێڕی خوێندنگەی یەکەم بووە... لە فێرکارانی: مامۆستا ئەحمەد فەهمی، ساڵح سەعید، فوئاد رەشید بەکر، حەمە پاشا ئەبدوڕەحماناغا، ئەوڕەحمان شەرەف، رەشید کەریم، ساڵح عەلی، بەهادین عارف، مەلا جەلال مەحەمەد سەیفوڵا، خالید سەعید عەبدوڵا، فەوزی رەشید، رەمزی قەزاز محی‌الدین، بوون.

1934، ناوی خوێندنگاکان گۆڕدرا... یەکەم بوو بە فەیسەڵییە، دووەم بە ئەیوبییە، گوێزرایەوە بۆ لای گومرگە سووتاو، خانووی حاجی مەحەمەد لاوە، خۆم خوێندکاری بووم لەوێ... سێیەم خوێندنگە ناونرا بە خالیدییە، کە لە پێشدا ناوی شوعبەبوو.

مامۆستا ساڵح قەفتان تاکو 1936، لە خوێندنگەی فەیسەڵییە ماوەتەوە، دوای ئەو مامۆستا عەلی ئاگا شەوقی سەعید، لە 1936دا کارگێڕبوو، دوای ئەو فوئاد رەشید، لە 1936/12/1 تاکو 2947/2/6 بە دوایدا، مامۆستا مەلا جەلال کاکە حەمە سەیفوڵا تاکو 1966/9/10، دوای ئەو ناوی فەیسەڵییە گۆڕدرا بە ئەلعیززە، پاش ماوەیەك بە سەرکەوتن، ماوەیەکیتر بە سلێمانی، دوای کۆچی مامۆستا مەلا جەلال، مامۆستا بەهجەت سەعید کابان، کارگێڕبوو تاکو 1969-1970، مامۆستا ئەبدوڵا ئەژدەر رەزا قادر بریکاربوو.

1970/1/17، کەریم زەند حەماغا بوو بە کارگێڕ، ئەبدوڵا ئەژدەر، رەشید ئەحمەد بەرزنجی بریکاری بوون، بەپێی ئاگاهی بەرووەردە، 1970/9/29، ناونرا بە پێشکەوتن، بە راهێنگە ماوەتەوە، بە ناوی راهێنگەی مامۆستایانەوە، دەستەی مامۆستایانی: کەریم زەند، کارگێڕ، ئەبدوڵا ئەژدەر، رەشید بەرزنجی بریکار، مامۆستایانی: ئەبدوڵا شێخ خالید، فایەق ئەحمەد، ئوسمان خاڵ مستەفا، عومەر موحەممەد قادر، کەمال عەزیز، رەشید هەورامی، جەبار شێخ غەفور، حەمە عەزیز ئەمین، عیزەت عەزیز، عەلی رازی، چەند مامۆستایەکیتر.

دوای کەریم زەند، مامۆستا حەمە عەلی حسێن، فایەق ئەحمەد، 1974/12/12، مامۆستا حەمە رەحیم رەمەزان، کاروباری ئەم خوێندنگەیەیان گرتۆتە ئەستۆ.

## کۆمەڵەی ئازادی، ژ.ك[*]– 1943:

دوای کشـانەوەی کۆمەڵـەی هیـوا، لـە گۆڕەپـانی رامیـاری، کۆمەڵـەی پێشکەوتووخواز هاتەکایەوە، لە کاتێکدا، پارتی کۆمۆنیستی عێراقی 3 بەش بـوون، قاعیدە، شەرارە، وەحدەت نیزال. لە 1934دا القاعدة، الشرارة، وحدة النضال، پارتی العمل، داود سایغ، کاروباری دەبرد بەڕێوە، یەکێتی تێکۆشین، 3 بڵاوکراوەی دەرکرد، دەگەیشتە دەستمان، تێیدا ئەندام بووین، مامۆستا ساڵح حەیدەریمان دەناسی، دوای کۆمەڵەی ئازادی بـرەوی پەیداکرد و کارمان تێدادەکرد، بەبێ چەندووچوون چووینە ناو کۆمەڵەی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی، قاعیدەوە، تاکو هاوینی 1945.

ئابی 1945، ساڵح حەیدەری هاتە سلێمانی لە خانەی کەریم زەند کۆبوونەوەکرا، مەحەمەد تۆفیق عەزیز، ئامادەبوو، ئەو رایە هاتە گۆڕێ، کە پەیوەندی بکرێت بە کۆمەڵەی ژ.ك.، بۆ ئەم مەبەستە، خۆم تەرخانکردو ئەو ئەرکەم گرتە ئەستۆ، بڵاوکراوەم دانابوو، لە خانوویەکی خزمێکم لە گەڕەکی سەرشەقام، چووم هێنام، کاك غەفور میرزا کەریم ئاگادارە، شەو لای گرتووخانەکەی سلێمانییەوە نووستم لەتەك کاروانی گوندی گۆڕەدێمەدا، قادری ئەبدوڵاغا شیوەکەڵی ئاشنام بوو، باری سیگاری هێنابوو بۆ فرۆشتن، بارگیرێکی بەکرێ گرتبوو، خاوەنەکەی دانیشتووی گوندی چەمپاراوی لای بانەبوو.

بۆ بەیانی کەوتینەڕێ، لە ئەزمڕ و قەڵاچوالانەوە بەلای چوارتادا بەرەو گوندی گۆڕەدێم، شەو لەوێ ماینەوە، کاروانەکە لایدا، منیش لەتەك قادر ئەبدوڵاغا شیوەکەڵی خۆیو کابرای کاروانی، بە وڵاخەکەوە، بارەکەی پەرە سیگاربوو، بە جۆمی ئاشیبارامو قەڵاتی سلێماندا، کەوتینە پشتی گوندی شیوەکەڵ، سیرین، بەرەو کێوی سوورکێو، پۆلیس پشتی لێگرتین، خۆمان رزگارکرد، یەکێکیان

---

* ژ.ك. 1942/9/16 لە باخی حاجی داود لە مەهاباد دامەزراوە.

ئەیناسیم وتی ئەمە ئاشنای سۆفی سەعیداغایە، ملی هەورازمانگرتوو سەرکەوتین بە دیوی بلەکیدا، خاوەنی ئێسترەکە ناوی رەحیم بوو.

لەولاوە، کابرایەك بە باری گوێدرێژەوە، هەر جارەی کە بارە قورسەکە نەکەوت، گوێدرێژەکە ترێکی لێئەدا، بارەکەی بۆ راست دەکردەوەو دەستی دەکردە ملی، ئەیوت بە حەمریم، تاکو سەرکەوت لە هەورازەکە، ئەمجارە، بارەکەی کەوت، راستی کردەوە، وتی ئەی بە گونێم، کارەکەی مەیسەربوو، لە هەورازی سەخت قورتاربوو، لەمەوە سیاسەت فێربووم.

بە دیوی گوندی بلەکێدا، شۆڕبووینەوە، گەیشتینە چۆمی بلەکی، کابرای کاروانی هاوارێکرد، هۆو کاکە، کاکە هۆو... هاتن بە دەنگمانەوە، گوێ چۆمەکە ساردبوو، شەومان گوزەراند، بۆ بەیانی چووینە گوندی ماسیبەرو بایزاوا، نزیکی بانە، بارەکەیان فرۆشت، بە تەنها مامەوە، رێ نەشارەزام، هەچەندە خەریکبوم، کاروانیو خاوەن شمەك، تەفرەیدەم، بێن لەتەکما بۆ بۆکان، بەڵام سوودی نەبوو.

خۆم راگرت، تاکو ئێوارە، کاروانێکی گەورەی پێنجوێن هاتن، خێرا کەوتمە خۆمو رامکرد بە دوایاندا، لەوانیش وایە کە چەتەم یاخود پیاوی عیزەتخانی بانەم، زەنگی ملی وڵاخەکان لۆکەیان تێئاخنیبوو، بۆ ئەوەی دەنگی نەیەت، خێرا لێئەخوڕن، منیش بە دوایاندا تاکو شوێ، لەوێ خستیان، بۆ حەسانەوە، تێیان خوڕیم، لوولەی چەخماخیان لێراکێشام، منیش دەمانچەم پێبوو، وتیان کوڕە کێیت، وتم خۆمانین، لە خۆتانم، کاروانیم، هاوڕێم لە پێشەوەیە، هەر تێم دەڕوانن، نەیان دەناسیم.

شەومان بەسەربرد، بەیانی کەوتینەڕێ، تا گەیشتینە چاخانەی زەمبیل، خەرجییەکەم هەمووی، بە ناو گەورکدا بە شێخ چۆپانو مێرگە نەخشینەدا، رووەو حەسارو بۆ گەبەسی، بۆکان... ئەوان لایاندا، منیش چوومە گوندی شێخلەری رەحماناغای ئێڵخانی، دیبوکری، بەرگەو بەلگەم پێبوو، ئەویش هاوکاریکردم، لە قەرەکەندو کانیتۆمارو ئوتەمیشو بورهانەوە، چوومە مەهاباد، سابلاخ، لە کاروانسەرای گەرمێن لاماندا، مانگی رەمەزان بوو، چوومە خزمەت قازی موحەمەد،

هێشتا نامزەد نەکرابوو بۆ پێشەوایی کۆماری کوردستان، خێرا دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەی ژ.ك. خڕبوونەوە، وتووێژکرا، شەوێ هاتمە فەرمانگەی پەیوەستی فەرهەنگی، شوورەوی، لەوێ مستەفا خۆشناوم دی.

بەرێز قازی ناردی بە دوامدا، شەو لە خانەی قازی مەحەممەد نووستم، بەیانی مستەفا مۆئمینی هات، کاروبار بە ئەندازەیەك پێکهات. گەڕامەوە بۆ بۆکانو شێخلەر، لەوێ مامۆستا کاردۆخی، شێخ موعتەسەمم دی، خۆم لێئاشکرا نەکردن، شەو لە خانەی قاسماغا، لەسەر چاڵاوەکە دانیشتین، تەگبیری گەڕانەوەم دەکرد... ئیسماعیل ئەردەلان، خاوەنی رۆژنامەی کۆهستان، لەوێبوو، یەکتریمان ناسی، زنجیرە وتاری لە رۆژنامەکەیدا دەنووسی بە ناونیشانی وەقایعی ئارارات، چەند دانەیکی پێبوو.

بەیانی زوو رێکەوتم بەرەو بلەگی – بانە، لای کەلیخان پاسدار رێگەکەیان گرتبوو، ئیستیان لێکردین، کاروانەکە وتیان، پیاوی حەمە رەشید بەگی بلەگێن، لەم مقۆمقۆیەدا، لە ژێر سکی ولاخەکانەوە، خۆم دەربازکرد، دەمانچەم پێبوو، بە ناو جەنگەڵدا بەو شەوە تاریکە، بەرەوە کێوی ئاربەبای پشتی بانە هاتم، 2 جار گەڕامەوە بە تروسکەی ئاگرەکانەوە وامدەزانی، هاوڕێ کاروانییەکانن پێش جیابوونەوەمان، کاروانەکە رێگەیان هەڵەکرد، شەوبوو، چوینە لای قادرخانی ئارمردە، دیارییان بۆ برد، ئەویش رێنماییکردن، تووشی ئەو پاسدارانە بوون، ماشینێك لەسەر رێی کەلیخان شکابوو، پاسەوانی ئەوەبوون.

ناگەهانو رێکەوت وابوو، جودا ببینەوە، بە تەنها هەر ئەوشەوە، لە ژێرباڵی تاریکیدا خۆم گەیاندە قاپیکەندو لە چۆمەکەی بانە پەڕیمەوە، بە کلاشەوە، گەیشتمە بایزاوا، لەوێ سۆفی رشید هاوکاریکردم، بە پیادەیی بۆ دەمەوئێوارە، لە سوورکێو سەرکەوتم، هلتمە کانییەکەی پشتی گوندی نۆرك، خۆم کۆکردەوە، هاتمە نورکی حەمەرەشیداغا، خانمی خێزانی بەرێی کردم بۆ سوورەبان، ئەوڕەحماناغای حەمە رەشیداغا لەوێبوو، هەفتەیەك مامەوە، کاژمێرێکی ئۆڵمای چاکم هەبوو، بە دیاری دامێ.

حەسیب شێخ ئەحمەدو حسێن مەحمەد دەباغ – لیمۆ، هاوڕێیەکانی چوارتا هاتن بۆلام، هاتینە چوارتا، هەرچەندە ئەو هاوینە تەقەلامدا کە لە چوارتاوە بچم بەهۆی ئەو ناسیاوانەوە، بەڵام سەرینەگرت.

هاتمەوە سلێمانی، بەلای رەزەکانی قادری کوێخا مستەفای چوارتا، کەمێکی لامدا، دوای ئەوە بەرەو سلێمانی هاتمەوە، خۆمکرد بە ناوشاردا وەکوتولێر، وازم لە مامۆستایەتی هێنا، چوومەوە بۆ خوێندن لە بەغداد بۆ خانەی بەرزی مامۆستایان، پۆلی ئامادەیی بە ئینگلیزی.

لە بەغداد، بەهۆی کاک حەمە جەمیلەوە، لەتەک ئەنوەر مەلا حەماغا، چوین بۆ لای زەکی بەسیم – حازم، لە رێگەی ئەوەوە، دیداری فەهد – یوسف سەلمان، مەلا شەریف – فوئاد، مەلا عروس لەوێبوو، گفتوگۆکرا، پەیوەندی مەهاباد باسکراو بوو بە دروشمی کارمان.

### قەرەچەتان:

لە بارودۆخێکی ناهەموارد، گەڕامەوە، رۆژگار ئاڵۆزو گرژبوو، نێردرام بۆ قەرەچەتان بە مامۆستایی لە چلەی زستاندا، بە باوڵێکی تەنەکەو کلیمولێفەیەکی تەنکەوە چوومە گەراجی حاجی فەرەج، پێشی لۆرییەکم گرت بە 750 فلس، وتیان لە گردەبۆر، دابەزە، لە دووڕیانەکەی قەرەچەتانەوە بەپێ 5 کم، لەبەر ئەوە لە گردەبۆر دابەزیم، ئێوارەبوو، نمنم باران دەباری، مێردمنداڵێ خەریکی جووتبەردانبوو، هاوارم لێکرد، وتم کاکە پۆلیسەکان ئاگادارکە کە وڵاخێکم بۆ بنێرن، مامۆستام، گوێزراومەتەوە بۆ قەرەچەتان، ئەوەندەی نەبرد، وڵاخ هاتوو کەلوپەلەکەم لێناو چوومە باسگەی پۆلیسی گردەبۆر، لەسەر کۆنکرێتی ژوورەکە، راخەرم داناو لێیکەوتم، 2 هێلکەیان بۆ کوڵاندم، شێومکردو وتەی خۆشم بۆ کردنو شەوم بەسەربرد.

بەیانی بەرەو قەرەچەتان رۆیشتم، مامۆستا ئەحمەد سەعید حەسەن ئامان، هاوڕێی خوێندنگەمبوو، ئەو شەوە میوانداریکردم. 2 هێلکەی بۆ کوڵاندم، هێلکە دوانی بە 3 فلس بوو. دوای نانخواردن وتی: با جیابین، هەیە کەمدەخوات، هەیە

زۆرتر. ئەوە کاریتێکردم، بۆ بەیانی کارگوزارەکە ناوی کاك مەجیدبوو، بانگم کردو دینارێکم دایە، وتم: پێخوێیە قورپگرەوە، من وەستاو تۆ کرێکار ژوورەکەیترم سواغداو و کونپرمکرد. راخەرم تێدا راخست بە تەرپی، بێناگرودوو، شەو تێیدا نووستم... بەرەبەیان لەسەرمادا بەناگابووم، لایەکم تەزیبوو، پێمەوەنووسابوو، هەرچەندمدەگرد، نەدەبزوا، بە چەنگەکرێ، بەرەو ژووری خوێندن هاتم، هاوارمکردە کاك مەجید، دەهات بۆ نوێژی بەیانی، وتم: سۆپاکەم بۆ هەڵکە، رانکوچۆخەی بووزوم لەبەردابوو، خۆمدەنا بە لوولەی سۆپاکەوە، بۆگرپوز هەڵدەسا، تینم پێنەدەگەیی، وتم شیرم بۆ بێنە، نیو قاپ شیرم گەرمکرد لە ناو کترییەکدا، ئاوی ناو کترییەکە دەکولا، شیرەکەم نا بەسەرمەوە، هەستامو دەکەوتم، لەوێوە بە راکردن بۆ دوورپانەکە و هاتمەوە، چاکتربووم، بۆ شەویدوایی، هەر لەو ژوورە نووستم، گلەییو نارەزاییم نیشانی خۆم دەدا، کە چۆن؟ لە ناو قوڕدا پەکم بکەوێ، لە کاتێکدا رزگاری خاکی کوردستان دەخوازم.

کاك مەجید، گلەییوگازندەی خۆی ئاراستەکردم، وتی: بۆ ئەم ئاواییە پیاوی تێدا نییە؟

قەرەچەتان، لە دامێنی کێوی پیرەمەگروونە، کاتی 5 کم لەرێی قەلادزێ، شارێکەوە، دوورە، بەفر دایپۆشیوە، زستانێکی سەختبوو.

هەفتەیەکی بەسەردا تێپەرێ، لە مزگەوت نوێژمدەکرد، دوای نوێژی شێوان روومتێکردن، وتم: برایان، من خزمی ئێوەم، وتیان: ئەفەندی تۆ کابرایەکی شاریت، لەکوێ خزمی ئێمەیت !... وتم: ئێوە بربڕەی پشتی منن، ئامۆزای منن، ئەم خاکە قەوالەکەی هی ئێمەیە، وەرن بۆ خوێندنگەی شەو، فێری خوێندنو نووسینتان دەکەم، بە مەرج، تاکو بەهارێ... وتیان: ئەفەندی فێرنابین...

دووبارە سووربووم لەسەر فێکردنیان، یەکەم مامۆستا بووم لە بواری نەهێشتنی نەخوێندەواریدا، دوای بەرێز مەلا کاکە حەمە، مامۆستای ئەمر.

هاتن، چەکیان دادەنا لە ژوورێکیتر، نەریتی خوێندنو فێرخوازیم فێردەکرد، چیرۆکی دلاوەریو قارەمانیو ئازایەتیم بۆ دەگێرانەوە.

گوندەکە 2 بەرەکیبوو، بەری کوێخا وەسمان، بەری کوێخا گووروون، وتم؛ من خزمی هەردوولاتانم، دوژمنایەتێکی قووڵو دوورودرێژ هەبوو لە نێوانیاندا، لە چەرخی نوسمانییەوە، کلکی نێستر و خەرمانی یەکتریان دەسووتاند، گایان لە تەویلەدا دەکوشت، زیانیان یەیەك دەگەیاند... هەموو کوری یەکییەکی، قۆز، ئازا، دلاوەرو قارەمان... ئەو ئازایەتییەیان لە بواری بەدیو خراپەدا بەکار دەهێنا، تێم گەیاندن، کە ئەوە ئازایەتی نییە، بەلکو ترسنۆکییە... ئازایەتیو جوامێری، خزمەتی یەکترییە، رزگارکردنی ولاتە... ماوەیەك بەمجۆرە، پاش نیوەڕوان دەهاتمە چاخانەکەی سووسی، لەتەك بەرێز کاك حەمە عەلی رۆستەم عوزێری میراشی، ئاشنایەتیم پەیداکرد، تفەنگێکی برنەوم پێشکەشکرد، بەهای 4 دیناربوو، ئەویش بە زۆر 5 دیناری دامێ، بە پشتی لۆری لە تەکیدا هاتم بۆ سلێمانی، خواستم بۆ نووسی بە مەبەستی کردنەوەی خوێندنگە لە گوندی چەرمەگا - چەرمگە – سپیگە – الموقع الأبيض.

پشووی نیوەی ساڵ، هاتمەوە بۆ سلێمانی، بەدوامدا دەگەڕان، کارگێڕی گشتی پەروەردە، مامۆستا مستەفا مەزهەر، بە فەرمانێ گوێزامیەوە بۆ گوندی ئەبابەیلێ لە هەڵەبجە.

بەرێز مارف چیاوك ئوستانداربوو، شارەزایی تەکنیکی فەرمانڕەوایەتی نەبوو، پەلاماری بەرێزان تۆفیق قەزازو شێخ قادر حەفیدیدا، بەلام نێوانی خۆی لەتەك شێخی ئەمردا تێکنەدا، منیش قوربانی ئەو گێژاوەبووم، هەر لە یانەی سەرکەوتنەوە لە بەغداد، چونکە ئێمەی لاوان لایەنگری پارێزەر مەحەمەد بابان بووین لە هەڵبژاردندا.. بە راستی مارف چیاوك، کوردێکی پاکوخاوێنبوو، مرد، گفتو جاوی نەبوو، نەداربوو، خاوەنی خێزانێکی جەنجاڵبوو.

**ئەبابەیلێ – 1945:**

دوای نیوەی ساڵ هاتمە ئەبابەیلێ بە کارگێڕی خوێندنگە، 15 کم لە هەڵەبجەوە، بەسەر هەموو دەشتی شارەزووردا دەڕوانێ، شێخ کەریم ، شێخ رەشید شێخ مەحمود، مەزنی ئەم گوندەن، داودبەگی جافیش خانووەکەی بەسەر خوێندنگەکەدا دەیڕوانی.

لە هەڵەبجە، ئاشنایەتیم لەتەك مامەڕەزای سەرۆکی هەقەدا هەبوو، لەوێ دەستبەسەربوو، لە ژووری ئوتێلێکدا، دەنووستین، گزنگی کۆمەڵەی مەهاباد ژ.ك. دابووی لەمنیو.

زۆربەی شەوانی هێنی بەیەکەوە دەبووین، ئەویش جارێك هات بۆ ئەبابەیلێ، بەیەکەوە چووینەلای شێخ کەریمو شێخ رەشید.

خوێندنگەی شەوم کردەوە، بەخۆڕایی، نەهێشتنی نەخوێندەواریم کردبوو بە دروشمو سەرمەشقی کارەکانم لەو سەردەمەدا، پاسگەی پۆلیسی بیارەو تەوێڵەو خورماڵو سازانو گریانەیان لە شەوێکی هێنیدا دایەبەر گوللە... مامۆستاکانیان تاوانبارکرد، لەوانە: کاردۆخی، شێخ سەفادین، عارف شێخ ئەحمەد، حەمە ئەمین کاکە شێخ، گێژاوەکە منیشی گرتەوە، هەرچەندە ئاگادار نەبووم.

گەشتێکمانکرد بە جەکەوە، لە ئەشکەوەڵەوە بۆ گوندی هاوار و سۆسەکانو تەوێڵە.

بابەشێخ، بارچاوەشی تەوێڵەبوو، فەرمانی کارگێڕی پۆلیسی هەبوو لەودیو سنوور زەلامی دەهێنایەوە.

لە چاخانەی گەرپات لاماندا، میواندارێکردین، شەوێ چووینە دیوەخانی قادر بەگ، باوکی سەعدی بەگ، کوڕەزای جافر سوڵتانی هەورامان.

ئەو شەوە بەگزادەی لهونو هەورامان هەر هەموو هاتبوون وەکو کونگرەبێت، دوای شێوکردن، کەوتینە مقۆمقۆ، ئەو ئەیوت پاوەهی منە، ئەویتر دەیوت نەخێر هی منە.

حەمەئەمین سوڵتان راستبۆوەو وتی: پاوەهی لوولەی تفەنگە، منیش بۆم پەسەند کرد، وتم: ئەمە فەلسەفەیە، هێز لەسەروو هەموو دەستێکەوەیە، باوکی هەمووان هێزە.

بە چەکەوە چووینە ناو پاسگەی پۆلیسەوە، دوایی بەرەوبیارە و خورماڵ، گوڵپ، رۆیشتین، گەڕاینەوە، لە کۆتایی گەشتەکەماندا بۆ گوندی ئەبایەیلێ.

هاوینی بەسەردەهات، هاتمەوە سلێمانی، چووم بۆ بەغداد، 3 مانگ لەژێر زەمینــدا، ئاندەرگراونــد، لەتــەك فەهــد – یوسف سلمان، زەکی بەسیم – حازم، مامـــەوە... بڵاوکــراوەی ئازادیمـــان بـــە تـــەواوی چـــاپکرد، نامەکـــەی فەهـــد، سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی عیراقی بۆ پێشەوا قازی لەتەک بڵاوەکراوەکانـدا هێنامە سلێمانی، لە خانووی حاجی رەشید مامی پارێزەر مەحەمەد مستەفا و غەفور میرزا کەریم کۆ دەبووینەوە، بە بڕیاری دەماینـدەیی رووەکردە موکریان، وازم لە مامۆستایەتی هێنا و خۆم تەرخانکرد بۆ کاری رامیاری – سیاسی.

## موکریان – ئاتروپاتین – 1946:

کۆڵوبـار و بارگـەم پێچـایەوە، پێشـەکی مامۆسـتا جەعفـەر شـێخ حسـێن بەرزنجیم، ئاگادارکردبوو، ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ رۆیشتن، وتم: ئەمە رێگەی هاتوونەهاتە، وتی: لەتەکتام... رانکوچۆخەو سوخمەیەکی تەنکی لەبەرابوو، وتم سەرماوکوێستانە، بەرەو زستان دەچین، گەرەکە تونـدوتۆڵ خۆمـان بپێچینەوە، بەرگەو بەڵگەونامەی بڕواو بڵاوکراوەو نووسراو، نامەکەی فەهدو باروبارگەمان دا بە کۆڵدا پێشی کاروانی حاجی عەبدولا بۆسکانی کەوتین، لە چاخانەکەی گۆیژە، چاوەڕوانیمانکرد، دیار نەبوون، هاتینـەوە دامێنـی چیای گۆیـژە و سـەرکەوتینەوە، سەرەتایان دەرکەوت.

حاجی عەبدولا بۆسکانی، باوکی عەلی بۆسکانیو ئەبـدوڕەحمان فرۆشـیارێکی قورسبوو، سەوداو مامەڵەو بنکەی لە سلێمانییەوە تاکو تەبرێز درێژەی هەبوو.

کەوتینە ئەودیوی گۆیژە، لە جۆمی زاخیو بەلای گونـدی گۆڕەدێمـدا، بـەرەو ئەڵەسـوو، بۆسـکان، شـیوەکەڵ، بـە سـوورکێودا، گەیشـتینە چـەمپاراو، لـەوێ

حەسانەوە... ئێمە هەر پیادەبووین، شەوێ ساردبوو، شێخ جەعفەر بەرزنجی وتی: سەرمامە، منیش وتم، هیچ نییە، سوخمەت لەبەردایە، وتەکەی خۆیم خستەوەبیر.

بەناو گەورکایەتیدا، مێرگە نەخشینە، شێخ چۆپان، زەمبیل، قاراوا، بۆ گەبەسی، حەسار تاکو بۆکان، لەوێ کووتاڵو شمەك بەرەو شاری تەورێز و ئێمەش جیابووینەوە، شارەزاییم هەبوو، جاری دووەمە کە هاتوومەتە موکریان، چوینە گومرگە رێزی، لەوێ بە رێکەوت، ئەورەحمان زەبیحی هاتبوو، جیبێکی پێبوو، یەکتریمان دەناسی، لە تەکیدا هاتین بۆ مەهاباد، هەفتەیەك میوانداریکردین، دیدەنی پێشەوای مەزنمانکرد، ژوورمانگرت، جێگەمان بۆ دیاریکرا.

جا بێینەوە سەر لەشکری بارزانو شۆڕشی پایزی 1945، شکستی و کشانەوە بۆ دەڤەری شنۆو لاجانو نەغەدەو سندوس، ماوەیەکی 3 مانگ پتر وەرنەگیران، لە نێوانی سەردەشتو شاری ئورومیەدا، نزیکەی 120 کەس پتر لەسەرماو لە برسا مردن...

رۆژێك تاکو ئێوارە بەناو بەفردا رچەی بەفرمان دەشکاند، 4 کم رێگەمان نەدەبڕی، بە نۆرە، کوڕی بە توانا پێشدەکەوت رچەکەی دەشکاند.

بە ناچاری پەیوەندیکرا بە رووسەکانەوە، لە رێی بیمارستانی ئوورمیەوە، لەسەر فەرمانی سەرۆك بارزانی نەمر، بە ئامۆژگاری خودی سەرۆك بارزانی، پەیوەندیکرا، د. مەلکۆی دانساز ئەرمەنی، زمانزان بوو، ئازەری باشی دەزانی، کاك عیزت ئەبدولعەزیز لەتەکماندابوو، نمایندەبووین، تێمانگەیاند، ئەگەرچی ئێمەی پیاو مەردووم، بەدکاربین، بەڵام ئەو منداڵو پیرو ئافرەتانەمان، ژمارەیەکی زۆرن، لەتەکماندا، ئەمانە بێتاوانن، ئێوە ئەگەر پشتیوانی میللەتو قەڵای ئازادیخوازن، ئەگەر وابێ، کوا؟ برایەتی، کوا یارمەتی؟... سەربازە رووسییەکە پایەی مایوربوو، لە وتەکەی ئێمە قەڵسبوو، وتی: ئێمە براین، بە رووسی، وتمان کوا؟ ئێوە ئێمە بە سیای ئەمریکیو بێنتاگۆنو ئینلیجنسیڤر، دەزانن... ئەگەر ئێمە وادابنێن، ئەی ئەو بێتاوانانە گوناهیان چییە؟... ئەویش وتی: ماوەم بدەنێ، پەیوەندیکرد بە

فەرماندەی كەزبین، ژەنراڵی كەزبین پەیوەندیكرد بە كاپكاسەوە – كەوكاس، بە پشتەوەی كاپكاس، بۆ كرمڵن... وەڵام هاتەوە، بە تووڕەیی كە چۆن تاكو ئێستەكە وەرنەگیراوین؟

فەرماندرا كە دەرزی دژی تیفوسمان لێبدەن، كراسەكانمان رزیبوو، بەرگەكانمانیان گشتی سووتانیان، بەرگی نوێمان وەرگرت، چەكی باشمان وەرگرت، كۆنەكانمان فرۆشت، لە 2 رێبەندان، 1946/1/22 رێكەوتی 1324/11/2 هەتاوی، ئاڵای پیرۆزی كوردستان بە ئاهەنگێكی قەشەنگ، هەڵكرا، پێشەوا هەڵبژێردرا، وتاری مێژوویی پێشكەشی جەماوەركرا، تەرمی حاجی قادری كۆیی بڵندكرایەوە لە ناو دارتەرمەكەدا تاكو ئاڵاكە ببینێ... ئاڵاكەی ماچكردو راكشایەوە، لە ناو دارتەرمەكە.. منیش كرام بە مامۆستای مێژوو لە خوێندنگەی ناوەندی، دوو هەفتەی نەبرد، وانەی مێژووم دەوتەوە، راڤەی مێژووم دەكرد كە تۆماری رووداوو كارەساتی مرۆڤە، ململانێیە... راپۆرتیان لێدام كە كۆمۆنیستم، لەو خوێنگەیە لابرام، كرام بە مامۆستای سەرەتایی لای مەلای داودی، كە ئاستێكی خوێندەواری وای نەبوو، تەنها خەباتی ئەو لە چەرخی عەجەمماندا وتوویەتی ئەمن كوردم، ئیملاناتی دڕاندووە، 2 هەفتە پتر لەو خوێندنگەیە مامەوە، لەوێش راپۆرتم لێدرا، كە زاری موكریانی بەكارناهێنم.

ئیبراهیم نادری، كارگێڕی گشتی فەرهەنگبوو، لە كرمانشاوە هاتبوو، رۆشنبیر بوو... ئەم راپۆرتانە لای پێشەوای مەزن كۆبۆوە، چونكە خودی خۆی دەیناسیم.. بە رێكەوت رۆژێك لە ناكاو هاتە ئەو خوێندنگەیی كە من لەوێ مامۆستام، هاتە پۆلەكەی من، وانەی جوگرافیام دەوتەوە، هۆی رۆشنكردنەوەو فێركردنم بەكاردەهێنا، بەڵگەی خڕێتی گۆی زەویو سووڕاندنەوەی بە دەوری خۆیو و خری خۆردا... لە سەرەتاوە تاكو كۆتایی مایەوە، بە وردی سەرنجی دەدا، كاتی تەواوبوونی وانە، سڵاوێكی سەربازیم بۆ كرد هەروەكو لە هاتنەژوورەوەی پۆلیشدا هەمان سڵاوی سەربازیم بۆ كرد، وتی فەرموو، رێزی لێگرتم، هاتە بیرو دەفتەر، ژووری كارگێڕ، بە سەرپێوە فەرمووی، دانەنیشت، بە تووڕەیی وتی: لە

تارانـدا مامۆسـتای ئـەوهام نـەدیتووە... دوایـی فـەرمووی: بتبیـنم.. وتم فـەرمانت هەیە... ئەو رۆژە نەچوومە خزمەتی، دوایی سەعید خان هومـایۆنی خوشکەزای، یاوەری بوو، نـاردی بـە دوامـدا، منـیش چوومە خزمـەتی، سڵاوێکی سـەربازیم بـۆ کرد، ئەویش هەستا لەبەرم، لـە روانگـەی رەوشـت بـەرزی خۆیـەوە، مرۆڤـی مـەزن، پێشەنگ، فەرمووی، چۆنە باری فەرهەنگ؟ وتم: بەرێزتان، ئاگادارترن، فەرمووی: کارێکی وەها بکەین، کە لە ئاستی کۆمارە ساواکەماندا بێت... وتم: ئەگـەر فـەرمان بـدەیت، خولێـك بکەینـەوە بـۆ فێرکردنـی مامۆسـتاکان، رەوانناسـی رێـی وتنـەوەی وانەیان فێربکەین... فـەرمووی کـارێکی پەسـەندە، دەسـتبەکاربە، فەرمانـدرا بـەو کارە، بووم بە بەرپرس، ماوەیك بەم جۆرە کۆتایی خولەکە، فەرمانی دەرکرد بـووم بـە نماینـدەی خـودی پێشـەوا لـە شـاری بۆکـان، وانکـاری خوێنـدنگـەی ناوەنـدی بۆکانیش بووم، بەرپرسی جەوانانیش بووم بە هاوکاری حـاجی رەحمانـاغـای شـێخ لەر ئێلخانی – دیبوکری، لە قەڵاکەی بۆکان دەنوستم.. لەپڕ پێشمەرگەیەك هـاتوو وتی: شێخ جەلال هاتووە.. خێرا هاتم وامزانی شێخ جـەلالی حەفیـدە، کەچـی شـێخ جەلالی کاکە لاو بوو، برای شێخ جافری لای شـێخی مـەزن، نامـەی شـێخ مـەحمودی نەمری پێبوو، نامەکەم ماچکردو نامـە سـەر سـەرم... لـە تەکیـدا هاتمـە مـەهاباد، نامـە پێشکەشـی پێشـەوای مـەزنکرا... 13 کـەس بـوون، هـەموو سـەربازی هەڵاتـەبوون، 13 تفـەنگی برنـەوی بـۆ وەرگـرتن، نـویَ لـە رۆنـدا قایشـیان تێهەڵنەکێشرابوو..

ئەمـە بـە فـەرمانی پێشـەوای، دوای ماچـکردنی نامەکـەی شـێخی نـەمر، رەوانـەکران بـۆ رۆخـی جـەنگ لای پەسـوی نەغـەدە، منـیش رۆژانـی هـەینی سەرلەبەیانی وتارم دەدا لەسەر چاڵاوەکەی بۆکان.

لەلایـەکی تـرەوە، کـاك عیـزەت ئەبدولـەزیز، رای سـەرۆك بـارزانی نـەمری وەرگرتبوو، نامەی ئاراستەی بارەگای پێشەوای مـەزنکردبوو، کرام بـە یارمەتـدەرو بریکاری فەرماندەی هێـز لـە سـەرا و سەرچاوە، نزیکی سـەقز... دوای کشانەوەی

لەشکری ژەنراڵ حەمە رەشید خان لەبەر هۆی تایبەتی و ناتەبایی راو بۆچوون لەتەك پێشەوای مەزندا..

چوومە سەراو سەرچاوە، سەرۆك بارزانی نەمر فەرمووی ئەمە رای منەو تۆش شایستەی ئەوەی.. وتم: ئەزبەنی، ئەز سەربازم، بەو مەبەستەش هاتوومەتە ناو شۆڕشەوە، ئەوەی زۆر خۆشنودیکرد و لە هزر و مێشکی خۆیدا، کێشیکی بۆ دانام، لە ئایندەدا، بارزانی نەمر سووربوو لەسەر فەرمانەکەی... وتم: ئەزبەنی حەز دەکەم لەتەك شێخ محەمەد ئەمینی مەلحەدا بم، کەسی دووەم بوو دوای مامەڕەزا لە رێبازی‌حەقەدا.

## شەوی کۆتایی – 1946:

سەراو سەرچاوەیە، کاك میر حاجو کاك عیزەت، هەرهەمووکمان لە خزمەت سەرۆکی نەمر بارزانیدابین، نەخشە دانراوە، پلانی گرتنی شاری سەقزە، کاك میرحاج وتی ئەگەر 25٪ زیانیش هەبێت، هەر سەرکەوتوین... لە ناکاو، نوری ئەحمەد تەها لە تەورێزەوە هات، بە ئەنتەرناشێکی ئازربیجانیو چەند چەکێکی برنەوی تێدابوو، هەر دابەزیو، سەرۆك بارزانی فەرمووی، ها نوری چییە؟ وتی: تەورێز گیرا... سەرۆك بارزانی فەرمووی چۆن؟ وتی ئەزبەنی تەورێز گیرا، ئەم رووداوە پەستی کردین، تانکەکانی ئازربیجان دەکشانەوە، گوێمان لە تەقەتەقیانبو.

کات 12 ی شەوە، زستانە، سەرۆك بارزانی نەمر روویکردە میرحاج، فەرمووی 200 مێر لەتەك خۆت بەرە، بەری سایندەلا بگرن، تاکو بەبیزیان بکشێینەوە، نەخشەو پلانی کشانەوەی دانا... شێخ موحەمەد ئەمین مەلحە 18 چەکداری لەتەکدابوو، خۆشم چوومە پاڵیان، بە ئەنتەرناشێ لە بۆکانەوە، شاری چۆڵوهۆڵ، بێناگا، هاتینە تەغیاباد، بارزانیەکان لەوێ نیشتەجێکرابوون، شوێنی ئەرمەنی بوو کۆچیانکردبوو بۆ ئەرمەنستان، هەر بەو شەوە، ئافرەتو منداڵی بارزانی لە تەغیاباد، هاتبوونە سەر شەقامەکە و هاواریاندەکرد، زۆر نیگەران بوون... وتمان، هەرن ئەز سەربازی دیموکراتین.

هاتینە میاندواو، بڕیاروابوو کە ژەنراڵ ئەزیمی ببینین، سەربازگەی میاندواو چۆڵکرابوو، ژەنراڵ عەزیمی دیار نەبوو کە پلانمان بۆ دابنێ... تاقی سەرکەوتنو پێشوازی سەربازی ئێرانی دروستکرابوو، لە شەقامەکاندا، منیش فەرشێکی گچکەم راکێشاو خستمە ژێر خۆم، بەفر دەباری، بەرەوە مەهاباد هاتین، ئاڵای پیرۆز داگیرابوو، ئەژنۆمان شکا، بەرەبەیانبوو، چووینە خزمەت پێشەوا لە ماڵەوە، نوێژمانکرد لە پشتیەوە، بە خیاباندا هاتین بۆ بارەگا، بەرێزەوە لە پشتیەوە بە پاسای سەربازی دەرۆیشتین، ئاوڕی دایەوە، ئەگریا و فرمێسک بەچاویدا دەهاتەو خوارەوە، تا گەیشتینە بارەگای سەرکۆمار پێشەوا، میرحاج وتی: بەڕێز پێشەوا، فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی کاکە میر، کاک کەریم، ئێوە منتان داناوبوو بە پێشەوا، ئێوە فەرمانتان بەچییە؟

میرحاج، سیخورمەیەکی تێژەنم وتی: ئەی خاک، ئاخ بەسەرم، پێشەوا وابڵێ!...

هەستاین، هاتینە دەرەوە، میرحاج شەقێکی لە شەبقە رووسییەکەی هەڵدا، پودپولکۆنیک بوو، سەرهەنگ، منیش پلەی کاپتانیم هەبوو... بەرگمان گۆڕی، لەتەک شێخ موحەمەد ئەمین مەڵحە، تاکو گوندی گوێچکەدەرە هاتین، ئەومان بەرێکرد، میرحاج دووربینێکی خۆیدایە، منیش تفەنگێکی برنەو بە سەد فیشەکەوە... گەڕاینەوە بۆ مەهاباد و شێخ مەحەمەد ئەمین مەڵحە بەرەو ئەمدیو، لای قەلادزێ.

کاک مەحمود مەجید بەگ حاجی رەسوڵ بەگمان لەتەکدابوو، خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیاریبوو لە بەغداد، هاتبوو کە بچێت بۆ سۆڤیەت بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا، لەو رووداوەدا پەکی کەوت، نەیتوانی بڕوات، گوێدرێژێکم بۆ پەیداکردو تفەنگم نایە سەر نەرمەی شانم و لەتەک کاکە میرحاجو کاک مەحموددا، گەڕاینەوە بۆ مەهاباد.

شێخ مەحەمەد ئەمین مەڵحە، لە رێگە، مەلا خەلیلی مەنگوڕ رووتی کردنەوە، 18 کەس بوون، تفەنگو فیشەکو جبەخانە هەرچییەکیان پێبوو،

لێیانسەندبوون، شەو لە خەودا سواری سەریان ببوون، دوای ئەوەی کە میوانداریتی کرابوون.

جەعفەر شێخ حسێن بەرزنجی لەتەک شێخ جەلال کاکەلاو، کە جودابوونەوە، ئەوانیش بە هەمانشێوە لە گوندی میرەدێ و ساحیب، رووتکرانەوە.

بێینەوە مەهاباد، پێشەواو ئەنجوومەنی جەنگ، کە بۆ ماوەی 3 رۆژ گیرا بە مەبەستی راوێژکردن لە بارەی شەڕێ دەکەن یا نەء.

لە ئاکامدا، بەرێز پێشەوا بڕیاریدا کە جەنگ بەرپانەکرێ، پێشوازی سوپای ئێرانی بکات و بەرەو میاندواو بڕوات، بە خۆیو ئوتومبیلەکەیەوە، مێرگەری، جیوە، کە لە باکۆ خەلاتیکرابوو، منیش لە خزمەت سەرۆك بارزانی نەمردا چووینە خزمەت پێشەوا قازی موحەمەد، 2 جار، سەرۆك بارزانی فەرمووی: بەرێزتان هەر پێشەوامانن، لە تەکماندایە، مەزنی ئێمەیت.

پێشەوا فەرمووی، من لە خۆشیدا لەتەك میللەتەکەم بووم، گەرەکە لە ناخۆشیشدا لەتەکیاندبم، سوێندم خوارد کە لەتەك میللەتەکەمدا بژیم و بمرم، ئەمە بڕیاری کۆتاییمە.

ماڵئاواییمان لێکرد، کلیلی قاسەیداینێ، چەند هەزار تمەنی تێدابوو، چەکو جبەخانەی سەربازخانەی پێبەخشین، فەرمووی ئەمانە بۆ ئێوە باشە... منیش لەسەر فەرمانی سەرۆك بارزانی نەمر، کرام بە بەرپرسی گواستنەوەی خێزانەکانی بارزانی، لە کارێز، هەرچی ئوتومبیلو ئەنتەرناش هەبوو، بە سوخرەمانگرت، خێزانەکانم گواستەوە بۆ نەغەدە و لاجانو شنۆ، رێ شارەزابووم، خەریکبو شۆفێرەکان رێم لێچەواشەبکەن، لەو دەفەرانە مابنەوە.

سەرۆك بارزانی نەمر، بە خۆیو چەنکدارو نیگابانەکانیەوە لە کارێزەوە بەپێ هاتەوە بۆ لای نەغەدە.

بەرێز خودانی بارزان، شێخ ئەحمەد، چوو بۆ شنۆ، خێزانەکانم هەرهەموو دامەزراند، ئەو ئەرکەی پێم سپێردرابوو، گەیاندم ئەوەش بە بڕواپێکردنو بتمانە بە منی لاوبوو، کەسێ نەیدەتوانی تەماشی ئافرەتێکی بارزانی بکات، بە جۆرێ دەبوایە روو وەربگێڕێت.

## پێشەوا قازی موحەممەد – 1901-1947:

پابەبڵند، ڕەوشتوخوو بەرز، بێهەوا، لە بنەماڵەیەکی خەباتگێڕن نەوەی قازی عەلی، کوڕی قازی فەتاح، لە بزاڤی شێخ موحەممەدی خیابانیدا هاوکاربوون، لە شۆڕشی جەنگەڵی، ستارخانو باغرخانو کوچکخان لە باکوور بەشداربوون، ڕەچەڵەکی پێشەوا دەگەڕێتەوە بۆ کاپکاس، لەوێوە کۆچیانکردووە.

پێشەوا بەو ئوتومبیلە میرکەرییەوە کە هەیبو، بە دیاری لە باکۆ وەریگرتبوو، بە ناوەندی مەهابادا خولێکیدا بە خیابانەکانیدا و ماڵئاوایی لە شاری مەهابادکرد... وا گوماندەکرا لە پردی سوورەوە بەرەو ئورمییەو سنووری رووسیا بچێت، کەچی ڕوویکردە میاندواو و پێشوازی لە سەرلەشکر همایونی کرد، ئەویش بە ڕێزلێگرتنێکی رووالەتی وتی: بفەرموو جناب پێشەوا، لە تەکیدا هاتنەوە بۆ مەهاباد... هەتاکو پێشەوا نەچوو بە پیر لەشکری ئێرانەوە، یەك سەربازی ئێران نەیتوانی بە پۆستاڵەوە بێتە پێشەوەو بێتە ناو خاکی ئازادکراوی کوردستانەوە.

دوای 3 ڕۆژ، گرتیانو درا بە دادگا بە تاوانی کوشتنی بازرگانی مەهابادی، مەحمودیان، نەك وەکو رابەرێکی نەتەوەیی، سەرکۆمار و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان... لە ئەنجامی دادگا کردنیدا، فەرمانی خنکاندنی درا لە تەك سەیفی قازی، مەحمەد حسێن خانی ئامۆزای، سەدری قازی برای، ئەبولقاسم، لە چوارچرا، لەو مەیدانو گۆڕەپانەی کە وتاری تێدا دەدا، لە 1326/1/10 هەتاوی ڕێکەوتی 30 ئازار، 1947.

دادگلو ڕووداوەکان، لە پیرۆزگە.

نووسینی: کەریم زەند

## نەغەدەو شنۆ:

سەرهەنگ غەفاری هاتە نەغەدە لە خانەی پاشاخان قولی خان، سەرۆکی خێلی قەرەپاپاخ، داوای شێخ ئەحمەدی بارزانی کرد، ئەویش بە سواری داشقە، بەفربوو، لە شنۆوە هات، هەموو میوانی پاشاخانو قولیخانبووین، ئەفسەرە کوردەکان، کاك عیزەتو کاك میرحاج، کاك نوری ئەحمەد تەها، جەلال ئەمین بەگ، کاك بەکراغا ئەبدولکەریم لەوێبوون.

سەرهەنگ غەفاری، روویکردە خودانی بارزان، شێخ ئەحمەدو وتی: شاه ئەوازشی هەیە، داوا دەکات کە بە دیداری شادببن... شێخ ئەحمەد فەرمانیدا بە سەرۆك بارزانی کە بچێت بۆ تەهران لەوێ 40 شەو مایەوە.

سەرهەنگ غەفاری هاتەوە بۆ نەغەدە، دووبارە، داوای چەکو جۆلێکرد. شێخ ئەحمەدی بارزان، فەرمووی: مەلا مستەفا دەزانێ. ئەو نەگەرێتەوە، هیچ کارێك بەبێ مستەفا بارزانی پێکنایەت... ناچاربوون، سەرۆك بارزانی هاتەوە، ئەو شەوە چوینە پۆستی سلێمان بەگی دەرگەلە... بڕیاردرا بە گوێرەی رای شێخ سلێمان بارزانی، کە بکشێینەوە بۆ سنوری رووسیا، رای کاك عیزەتو منیش ئەو رایەمان پەسەند کرد.

سەرلەبەیانی، لەشکری ئێران هەنگێك دەهاتە نەغەدە، بەرەنگاری یەکتر دەبووین.

## جەنگی پارتیزانی:

نەغەدەمان بەجێهێشت، جەنگی پارتیزانی دەستپێکرد، سەرەتای بەهارە رووداوان زۆرن، لە بزاڤی کوردستانو ئازربیجاندا، نووسراوە، بە عەرەبی، نووسینی کەریم زەند...

ئەو زستانەم لە شارۆچکەی شنۆ بەسەربرد، شەو لەسەر حەسیری چاخانەکان دەنووستم، 4 ئەفسەری ئازربیجانی هاتبوونە هاوکاریمان، دوای شکستی ئازربیجان، کە ئەمانەبوون: جیهانگیری مەحمود، تەفریشیان، ئارتەشیان، لەتەك 2

ئەفسەریاندا هاتینە مەرگەوەر بە مەبەستی ڕێخۆشکردن بۆ چوون بۆ سۆڤیەت... بەڵام ئەم تەقەلایە، سەرینەگرت، سەید عەبدوڵا فەندی شێخ عەبدولقادر نەهری لەوێنەبوو... من مامەوە، تاکو دیدەنی بەڕێزی بکەم... سەید عەبدولقادری کوڕی، خوێندکاربوو لای من لە مەهاباد، برای سەید عەزیز شەمزینی ئەفسەری هاوڕێمان... ماوەی 25 شەو لە دیوەخانەکەیان مامەوە... دەمانچەیەکی کۆلت بە 100 فیشەکەوە پێشکەشمکرد، ئەویش ڕەشکێو ساقەی خودی سەید عەبدوڵا کە هاتەوە، کلێتەی پێبەخشیم تاکو ئیستەکەش پاراستوومەو لەسەریدەکەم، کە بە خزمەتی گەیشتم ڕێزی لێگرتم، هەروەها خانەوادەکەی سەید مریەمو سەید فەهیمەی خێزانی، دایکی سەید عەزیز دەیانزانی کە هاوڕێی ئەوین.

دوای ئەوە، چوومە گەڵ کوتور، بووم بە فەرماندەی هێز، 20 چەکدارم لەتەکدابوو، شەوانی هێنی بۆ بیستنی دەنگوباس رادیۆی پاتری هی سەید عەبدوڵا، هەیبوو... لەو کاتەی کە شەوانە لە دزەی گەوەر بووم، پەڕەیەك، پسووڵەیەك، بەگێ هێنای، دایە دەستم، نووسرابوو گیانەکەم، کاکە کەریم، دەمەوێ بتبینم، لە ژێرەوە مۆرەکەی مستەفا، منیش وامزانی مستەفا بۆتییە، کوردی باکووربوو، لەتەکماندا بە پەلە ڕۆیشتم بۆ خانەی کامیل بەگ، خزمی نوری بەگی ئەنبی، خێڵی بەگزادە، کە دیم، مستەفا خۆشناوو ئەنوەر عەبدوڵا – دڵسۆز، دیمەنێکی کاریگەر، سەرپەتی، کاڵە لە پێدا دڕاو، بەرگی شڕ، ئەو دیمەنە کاریتێکردم، خانە خوێکە ڕێزی لە من پتر دەگرت، چونکە لەو دەڤەرەدا ناسراوبووم، پێم وتن، ڕێز لەمانبگرن، ئەمانە لەمن مەزنترن، لە خوار ئەوانەوە دانیشتم، کەمەربەندەکەم کردەوە، 100 تمەنم هەبوو، نیوەم دانێ، ساقەو گۆرەویو کلێتەم دانێ.

کیژی خانی ئەو خانەوادەیە، بەو شۆخییەی تاکو نزیکی بەرەبەیان بە دیارمانەوە، دەمایەوە، دادەنیشت، دەیوت، سەد خۆزگە ئەمز مێربوومایە، تفەنگو ڕەختی خۆ لە مل دابنایە، لەتەك ئەنگۆ بەڕێکەوتمایە، چاوە جوانەکانی سوور هەڵگەڕابوو، خەوی نەدەهات.

مستەفا خۆشناو وتی: ئێمە بۆ لای تۆ هاتووین و زانیمان کە لێرەیت، دەخوازین کە بێیت لەتەکماندا بۆ لای شێخ مەحمودی نەمر، یاخود لەتەکماندابیت. زۆریتر، دواجار وتم: کاگە من لە میللەتی بارزان جودانابمەوە، فەل پاشەرۆکمان ناگەیەنێتە داریکەل شێخی نەمر، دەیانزانی کە من ئاشنایەتیم لە خزمەت شێخی نەمرو شێخ لەتیفدا هەیە.

وتم: برا بەرێزەکانم، ئێوە لێرە بمێننەوە، وتیان ناتوانین، چونکە کاتی خۆی لەتەك شێخ ئەحمەدی بارزان تێکچووبوون، مستەفا خۆشناو راپۆرتی لێدابوو، وتبووی کە سەر بە ئینگلیزەو پیاوی ئەوانە... منیش وتم فەرمانی بەخشینتان بۆ وەردەگرم... وتی: دەتوانی؟، وتم بەڵێ، بە هاوکاری کاك عیزەتو ئەفسەرەکان خێرا بە پەلە هاتمە دەشتەبێل گوندی تەهاغای تاهیراغای هەرکی، دەفەری ئەوبوو.

لە گوندی کانیسپیکە، نیوەرۆژەکردو هاتمە شنۆ بۆ بارەگای خودانی بارزان، کاك عیزەتو کاك بەکر ئەبدولکەریمو ئەفسەرەکانم دی، وتم: کاکە، مستەفا خۆشناو، نامەی بۆ ناردووم، ئەموت لە کوێیە، ئەو نهێنیەم پاراست... چووینە خزمەت خودانی بارزان، لای ئێوارە، حەسیری رووت لە دیوەخانەکەیدا راخرابوو، سڵاومانکرد... فەرمووی رۆنێن، بە کەسی نەدەوت دانیشن، رێزی لێدەگرتین، چونکە بە میللەتی خۆی دانابووین... سەرۆك بارزانی لە خزمەتیدا، بەپێوە دەستەوئەژنۆ، دەست بە بەرۆکەوە وەکو نوێژیکات، هەمیشە لە خزمەت خودانی بارزاندا بەم جۆرە دەوەستا... بە کاك عیزەتم وت: تە پسمامی منی، سبەینێ من کوژرام، تە، تفەنگی من هەڵدەگریت، تە خودانەخواستە بکوژرێیت من دووربینی تە هەڵدەگرم، مستەفا خۆشناو برایی مەیە، پسمامی مەیە، گەرەکە تەقەلابدەین، کە خودانی بارزان ببیەخشێ... وتی: لە کێرییە، ئەڤە برا مە...

باسەکەی کردەوە لای خودانی بارزان، ئەویش زۆر تووڕەبوو، وتی مستەفا وەها کرد، لای عروسان، شکاتاکرد، گوتی مرۆڤی ئینگلیز و ئینگلیزخوازم... وەها هەڵچوو تاکو خاوبۆوە، وتم: بەرێز خودان، رێم پێدەبەخشی بە رەزامەندی ئێوەی

مەزن؟ وتی بلە، وتم: ئارایشی رەحمەت ز گناهکەردنی ماست... واتە: رەونەقی بەخشین لە گوناهو تاوانی ئێمەوەیە... بەرێز خودان خاوبۆوە، لە باری هەڵچوونو گرژییەوە، بۆ باری خاوبوونەوە، بە نەرمی فەرمووی، لە کێرییە، ئەڵا مستەفا، ئەڤە مستەفا، واتە مستەفای برای، فەرمووی: سۆفی رەشکۆ، هەرە کاغەزا بینە، بنووسە، تە برای منی، تە میللەتی مەی.

ئەم مرۆڤە هێمایە، رەوشتو خوو بڵندە، پایە بەرزە، بەخشینی، توانایی، دلۆڤانی، سۆزو بەزەیی، دلاوەری، ڤارەمانی، هەرچی پەسنتندییەك هەیە، تێدابوو، لەم پێشەوا ئایینیە، خێڵایەتی، ئەمەیە، خودانی بارزان بە راستی، شێخ ئەحمەدی مەزن، ئەمە لێکۆڵینەوەو باسێکی تەواوی گەرەکە.

خێرا، نامەی بەخشینەکەیم خستە باخەڵم، شەو لە شنۆدا، ئەمامەوە، هاتمەوە، نامەکەمدانێ، بەڵام مەراقی هەر هەبوو... دەیوت، لێرە بکوژرێم، دەڵێن ناپاکێ کوژرا، لە عێراق لە سێدارە بدرێم، دەڵێن نیشتمان پەروەرێ کوژرا.

ماوەیەکی تر لە گەڵ کوتور مامەوە، کە هاتمەوە لای دزەی تەرگەوەر، ئەوان نەمابوون رۆیشتبوون، لە رێی شێخ رەشیدی لولانەوە، میری سەعیدی لە عیراق، بە رووالەت بەخشینی گشتی بۆ دەرکردبوون، هاتنەوە بۆ ئەمدیو، لەسێدارە دران لەتەك 4 ئەفسەرکە لە 1947/6/19.

## جەنگی کۆجار و قاسملۆ – 30 ئادار – 1947:

چوومەوە بۆ گەڵ کوتور، نێوانی سنوور، لە پێشدا چووینە گوندی پەشماوای قادراغا، سەرۆك بارزانی پەیمانی لەتەکیدا بەست، کە هێزی بارزانی لە رۆخی جەکدارانی کوردەوە، هێرش نابات، شەڕی کورد ناکات، جەنگ لەتەك سوپای ئێرانیدا دەکات... هاتینە گەڵ قاسملۆ، خەیروڵا ئەبدولکەریم فەرماندەبوو، لەتەك خەلیل هەرگۆشی تێکچووین، حەمەدی مەولودی مەهابادی، کاپتان بوو، هاتبووە ناو شۆڕشی پارتیزانییەوە، هەواڵی درۆی بردبو بۆی کە گوایا ئێمە دەرۆینەوە بۆ ئەودیوی ئیراق، کاتێ ئێمە لە سەنگەردابووین لە کێوی ماداغی

بەسەر شاری ئورومییەدا دەیڕوانی ، زۆر بڵندبوو، قەڵای دمدمیش هەر بەو کێوەوەیە..

بە ڕای من گەرمەکبوو، کە بەرەو سنووری رووسیا بکشێینەوە، چونکە نەخشەکە وابوو، حەمەدی مەولود راپۆرتەکەی بە هەڵە و پێچەوانە دابوو بە خەلیل هەرگوشی، بەپێی ئەو هەواڵە درۆیە، هاتن چەکمیکەن، خەیروڵا فریامکەوت، کارەساتێ خەریبکبوو رووبدات، کاك خەیروڵا، تێی گەیاند، کە ئەو کارە بەرانبەر بەمن شایستە نییە، حەمەدی مەولود، پەشیمانبۆوە، وتی من وام نەگوتووە.

حەمەد مەولود، نەخوێندەوارو نەزانبوو، بەڵام هەتا بڵێیت دلاوەرو بەجەرگبوو، لەشکرێکی ئێرانی شکاند لە مەکلاوی رێی سەردەشت... حەمەدی مەولود هاتەوە بۆ عیراق، لێرە بارمەتی درا، دوایی گەڕایەوە بۆ رووسیا، لەوێ کۆچیکرد، منیش لەتەك سەعید باخەوان مەهابادی کە کاتی خۆی مەحمودیانی بارزگانی مەهابادی کوشتبوو، تاوانەکەی درایە پاڵ قازی موحەمەد لە دادگاکەیدا.

چووینە پۆستی ئاسووری، لەوێوە بۆ قاسملو، بەیانی زووبوو، دەنگی تۆپ دەهات، ئێمەش بەرەو قەڵای دمدم دەچووین، گوللە گەڵەی دەهات بەلاماندا، قەڵاکە گیرابوو، بە شەبەیخون، خۆمان گەیاندە ناو گوندی قاسملو، لە ناو گەلییەکەدا، تانکی ئێرانی هاتە ناو گوندی قاسملو، ئێمەش بە پەلەپروزێ تلاوتل رزگاربووین.

دووبارە، چووینەوە بۆ گەڵ کۆتۆر، سەرۆك بارزانی ئەمر فەرمووی: ئێوە هێرش مەبەن، تەنانەت بە عەرەبی فەرمانیدامێ.

کۆتۆر، لەسەر سنوری دەستکردی تورکیەو ئێرانە، گەلییەکی قایمە، سەرۆك بارزانی ئەمر، ناردی بەدوامدا، 4 چەکدارم لەتەك خۆمدا برد، چەکدارەکانیترم راسپێریکرد لە هەردووبەری گەلییەکە، کە توند بیپارێزن، من دەچمە خزمەت سەرۆك بارزانی... کە هاتمە خزمەتی، سەرۆك بارزانی 20 چەکداری لەتەکدابوو، بە ئێمەوە بووین بە 25... بەرەو تەرگەڤەر رۆیشتین، بەمەبەستی دیدەنی عەمەرخانی شکاك، لە گەڵ بارەندێز پەڕینەوە، بارانێدێز، ئاشەوانەکەی

لەپەساوەری دەرخواردەلین، زۆر بەتام بوو، بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندی گۆجاری سەید نورەدین ئەفەندی، بنەماڵەی سەیدەکانی نەهری، پۆستی کوردی چەکداری سەر بە ئێرانی لێبوو، کە ئێمەیاندی کشانەوە.

کەدخودا وتی: دەمێکە چاڤەڕوانی ئێوە دەکەم، مەرێکی سەربڕی لە بەرپێی سەرۆك بارزانیدا... شەو لەوێ ماینەوە بە ئاگادارییەوە، قەدەغەی هاتوچۆمانکرد، لە کاتی 10ی شەو، مرۆڤێك هات، ناو گوند شڵەقابوو، دەرۆیشتن، دەیانزانی بەیانی هەراوشەڕو گوللەباران رووبانتێدەکات، هەر ئەو شەوە، گوندەکە چۆڵیانکرد... منیش ئاگاداربووم، نیگابانبووم، لە کابرام خوڕی، ئەوەی کە هاتبوو، وتم: کیشکە، کێدەری دەچیت؟ وتی: ئەمز مرۆڤی رەشید بەگی مەوانەم، ئانکی عەجەما هاتە ئەمنی، گوندی نوری بەگ، رەشید بەگ دبێژی، مرۆڤی چاکبی مستەفا بارزانی، وەگەرێ باخوێن نەڕێژرێت... منیش چوومە خزمەت بارزانی ئەمر، کاك بەکراغا دەڵی میرحاجمان لەتەکدا نەبوو... وتم: ئەم مرۆڤە وا دبێژی. فەرمانتان بە چییە؟ فەرمووی لای خۆت دابینێ.

بەیانی کازیوە، گەمارۆ و ئابڵۆقەیانداین، ئاگاداربووم، وتم: قادر، حەبیبە رابن، ئابڵۆقەدراوین، کێوەکانیان هەموو گرتبوو، گوندی گۆجار لە چاڵاییدابوو، کێو لە هەرچوارلایەوە، ئابڵۆقەیداوە... خێرا خۆم گەیاندە سەنگەرێکی بەرز، لە کاتی وادا زۆر وریایی گەرەکە، سەرۆك بارزانی، ئاماژەیکرد، فەرمووی: وەهابڕۆن، رۆژ بۆوە، کێوەکان رەش دەچێتەوە، خۆیان قایم دەکەن، جاشو قەرەپەخەو چریك لە دواوەی لەشکری ئێرانییەوە، 600 پتر بوون، داینگرتین بە شەستیری قورسو سەبوك، موسەلسەلی سەنگینو سەبوك، دەنگ لە دوورەوە دەڵێ: قبۆ قبۆ، نەرابە، مەلا مستەفا نەرابە، مەحەلی تە نبیژی ئەز مێرم.

وەڵامدرایەوە لای بارزانی ئەمرەوە، هاواریدەکرد: کرو، ئەمز شەڕی کوردناکەم، بەرێ خۆبدا بۆ عەجەما، وتیان، کورو تە چ دبێژی... دەستڕێژیانکرد، دوو چەکدارمان کوژرا، بەم جۆرە 2 کەسی تریش کوژرا هەر لە ئێمە.

ئێمەش دەستمان لێکردنەوە، شەڕی دەستەویەخە، بەفروبەشۆ، سەرما، زیخی تۆپی هاوەنو شەستیر داپۆشیبووین، پاڵتۆی ئازربیجانیمان لەبەردابوو... زیخو قوڕ بەسەر پشتو سەرمانەوە، خۆمان قایمکردبوو، سەنگەرەکەمان، زۆر باشبوو..

وتم: کەس تەقە نەکات.. تەمومژبوو، کەس کەسی نەدەدی ، بێدەنگو کشومات خۆمان متکردبوو لە ناو سەنگەرەکەدا، لای ئێوارە سوارە و پیادە، هێرشیانهێنا، وایانزانی کوژراوین، خێرا کەوتینەخۆ، دەستمان لەسەر زامنەی تفەنگ بوو، پەنجەمان گۆی نەدەکرد، لیکولێك دەستمان لێکردنەوە، چاك شکستیان هێنا، تەرمیان بەجێ هێشت.. بەرێز کاك ئەسعەد خۆشەوی، کەسی دووەمی ناو شۆڕش، دوای بارزانی ئەمر، گەڕایەوە سەرمان، هەر ئەویش بوو، لە پشتی لەشکرو چەکداراندەوە، نیگابانبوو، گەڕایەوە سەر من وتی: کەریم ماون؟ وتم: بەڵێ ئەزبەنی.. زۆر خۆشنوودبوو، هەر ئەو شەوە هاتینە گوندی خۆشەگۆیی، بناری چیای خەلیل، سنوور دەستکردی تورکیاو ئێران، 3 رۆژ بەپێ لە شارۆچکەی شنۆوە دوورە... ئەو شەوە خۆمان تێرکرد، وەکو ژەمی گورگی، کاڵەکانمان نوێکردەوە، هەموو دانیشتوانی گوندەکە چۆڵیانکردبوو..

بەمجۆرە، شەڕی هەورسەو زۆریتر لە 13 ئازارەوە تاکو 30 ئازار، 1947، هەرهەمووی رێگەخۆشکردنبوو بۆ کشانەوە بەرەوە سنووری رووسیا بە خاوخێزانەوە.. بەڵام لەو نەخشەیەدا، سەرنەکەوتین، خێڵەکان بەریان پێگرتین، دووبارە، گەڕاینەوە بۆ کێوی گادەری 3 سنوور، لە چیای گادەر، پشتی گوندی گەلاسو شنۆ 15 رۆژ ماینەوە، گەماروو ئابلۆقەیەکی وا دراین، ئەو ماوەیە، برێشکە، گەنمان دەبرژاند لەسەر بەرد، بە گوینووی کوێستان، هەگبەکانمان لێپڕدەکرد، تفەنگێکی برنەو بە تەنەکەیەك ئارد، فیشەك سەربەسەر بە ئارد، بەهای تفەنگێ بە 4 دینار، خێڵی هەرکی هاتبوون بۆ کوێستان ئەوان لێیاندەکڕین، ئەو خێڵانە بۆ لەوەڕی بەهار، هاتبوون.

## چیرۆکی ئەفسەرە کوردەکان:

**عیزەت عەبدولعەزیز:**

پلەی تاج بوو، ستاف، دەرچووی لەندەن، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945، ئەفسەری تۆپ، سەرزەنشتکرا کە تۆپەکانی زیبار – بلێ – نەیپێکاوە، لە مەهاباد، لە بەرابیەوە، ئەو ڕێزەی لێنەگیرا، لەلایەن رووسەکانەوە تاکو ئەندازەیەك بەرپرس بوو، سەرزەنشت دەکرا، من ئاگاهی باشم بۆدا، دەرئەنجام، یادداشتی دامەوە ڕێزی لێدەگرتم، هەرچی نهێنی خۆی هەبوو، لە چیاکان لە ماوەی جەنگی پارتیزانیدا بۆی دەگێرامەوە... چیرۆکی خۆیو سانحەخانمی ئەمین زەکی بەگ، چوونی بۆ میسر لە تەکیدا.

دوایی کرا بە فەرماندەی سەقز لە سەراو سەرچاوە، بە پایەی یۆدپۆلکۆنیك – سەرهەنگ، لە کۆماری کوردستاندا... ئەویش کردمی بە بریکاری خۆی... لە شکستی کۆمارەکەدا، خۆی دا بە دەستەوە، ماڵئاوایی لە سەرۆك بارزانی ئەمر کردو وتی ئەزبەنی، گەردنم ئازادکە، ئەبادا نەتبینمەوە، کە نەیبینیەوە، هاتەوە ئەمەدیو، بە بەندکراوی، کاك میرحاج، دەستی ئەبووە لەو کارەدا، لەتەك 4 ئەفسەرە قارەمانەکان لە سێدارەدرا 1947/6/19.

داوای سانحە خانمی کرد لەسەرەمەرگیدا، لە کاتی لەسێدارەدانیدا، تاکو تێر بە کامی دڵداریو ئەڤینی دێرینەوە، ماڵئاوایی لێبکات، ئەویش نەچوو بە پیر داواکەیەوە، بە ناکامی سەری نایەوە بەلای سیاسەتەکەوە، دوور لە کەی مێژووناسی گەورەی کورد، دوور لە کەسوکارو قەوموخوێش، دوور لە یارانی، دوور لە دەزگیرانی ئازداری، دواکرنوش بردن بۆ نیگای چاوە گەشەکانی بۆ دواجار، لە چاوەکانیدا نقوومی بکات، چاو لێکبنێ، لە دەفری چەرخدا بتوێتەوە، ببنە دڵۆپێك لە تەك بووکی رازاوەی خەیاڵیدا، کە سانحە خانمی رشتو سەلارە، ئەو ئاواتو ناکامەی نایە ناو کلکۆو قاڵبە گڵەکەیەوە، لە باخی سینەیدا، لە بەهەشتی یادگاریدا، بیرەوەری رابووردووی ئەکردەوە.

**مستەفا خۆشناو – مستەفا ئەبدولکەریم – 1910:**

ئەفسەری 3 ئەستێرە، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945 کرد، هاتە کۆماری کوردستان لە مەهاباد، بەر لە بزاڤ چاوم پێکەوتووە لە مەهاباد... باوکی بەکراغا حەوێزی لەتەک کوڕەکەیدا پەروەردەیکردووە، ئەفسەرێکی ئازاو دلاوەرو جوامێرو ئەبەز بووە، فارەمانی جەنگی مامەشەیە بە 40 چەکداری بارزانییەوە، یەك لەشکری ئێرانی شکاند، پایەی پۆلپۆلکۆنیك بوو، بەڵام کەللەشەق و تووڕەبوو، نێوانی خۆی لەتەك خودانی بارزاندا ، شێخ ئەحمەد، تێکدا، راپۆرتی دا بە رووسەکان، گوایە بەرێز شێخ ئەحمەد سەر بە ئینگلیزە، کێشە پەیدابوو، خەریکبوون ئەم کێشەیە بدەن بە دادگا.

ئێمەش دەزگای ئاسایشمان ئاگادارکردەوە K.G.B، کە ئەم مرۆڤە مەزنە، هێماو پیرۆزە خودانی بارزانە، پێشەوای رەوانی میللەتە، پایە بڵندە، شیرازە تێکدەچێ، بە ئیگەرانی ئەو مرۆڤە بەرێزە... ئەمە کاری خۆیکرد، وازیان هێنا لە کێشەکە، دەرئەنجام، مستەفا خۆشناو، لە بارزانیەکان جودابۆوە، هاتە لای پێشەوا قازی موحەمەد، کرا بە فەرماندەی مەهاباد، لە شوێنی ئیبراهیم سەلاح، مامۆستای خەباتگێڕ، قەدری جەمیل پاشا، کوردی سورییە، هاتەلامان.

شەوێ بە رێکەوت چوومە ماڵی مستەفا خۆشناو، بوغدەسەر کاپتانی سۆڤیەتی، لە دەزگای پاراستنی رووسی کاریدەکرد، دەمناسی بە پێی فرمانەکەم، بەرگی شۆفێری شڕی لەبەردەکرد، جیپێکی هەبوو ئەدەناسرا، من بەپێی فرمانی کارەکەم دەمناسی... کە چووم، رێگەیان پێدام، قەدری بەگ جەمیل پاشا، لەوێ ئامادەبوو، لە نێوانی گفتوگۆدا، وتی: ئێوە بیرورِاتان چییە؟

منیش وتم: هەر بزاڤی رزگاریخوازێ لە هەر شوێنێ بێت لەم جیهانەدا، ئێمە پشتگیری دەکەین، ئەگەرچی لە ئەندەنووسیاش بێت... قەدری بەگ ناسینی منی لا پەسەندبوو، وتی: دەتوانم 10 لاوی وەکو تۆ دوکتۆرای پێتەواوبکەم ، لەسەر خەرجو گیرفانی خۆم.

ئێواران لەتەکماندا دەگەڕاو وێنەی لەتەکدا گرتین، کاتی هەرەسی کۆمار، مستەفا خۆشناو و ئەنوەر عەبدوڵا دڵسۆز، لەتەک بوغدەسەری کاپتاندا، بە خاووخێزانەوە، دەچن بۆ شاری نورومیە، لەوێ بەجێیانەێلێ، خۆیەکات بە باڵیوزخانەی سۆڤێتیدا، ئەمانیش مانەوە بەبێ پشو و پەنا، روو دەکەنە ناو شکاك، 2 رۆژ رێگەیان مابوو بۆ سنووری رووسیا، دەرباز نەبوون، لەسەرماو برسانو لە ترسدا گەڕابوونەوە، هاتنەوە مەرگەڤەر، بۆ لام.. منیش نامەی بەخشینم بۆ وەرگرتن، ئەگەرچی نەشمانەوە، خۆیاندابەدەستەوە، لە تەك ئەفسەرەکاندا لەسێدارەدرا لە 19 حوزەیرانی 1947.

## بەکر ئەبدولکەریم – بەکراغا:

3 ئەستێرەبوو، 1914 هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945ی کرد، هاتە مەهاباد پایەی پۆدبۆلکۆنێکی پێبەخشرا، فەرماندەی رۆخی سەردەشت لەرەبەتبوو، لەوپەڕی جۆمی کەڵوێ لە شکستی کۆماردا، خۆی ئەدا بە دەستەوە، هاتەوە بۆ گوندەکەی خۆی شیواشان، لای کۆیە، ژن برای کاکە زیاداغا، ئازاو دلێرو جوامێر، ئەفسەری تۆپ، ماوەیەك فەرماندەری چەمچەماڵبوو، لە خەبات هەرگیز دابڕانی نەبووە.

## خەیروڵا ئەبدولکەریم:

باوکی کوردو دایکی مووسڵی، ئەفسەری 2 ئەستێرە، کوردێکی دڵسۆز، چەند جارێك یارمەتیداوم، پایەی مایۆری پێبەخشرابوو... بەهۆی نەخۆشییەوە، خۆیدابەدەستەوە، لە سەرماوە تووشی نەخۆشی سنگبوو، لەسێدارەدرا لەتەك ئەفسەرانی هاوڕێیدا.

## جەلال ئەمین بەگ مەحمود بەگ – 1911 – 2004/5/28:

ئەفسەری 2 ئەستێرە، تۆپهاوێژ، لە بزاڤی بارزانی 1945، هاوبەشبوو، پایەی مایۆری پێبەخشرابوو، مێجەر، لە شکستی کۆمارەکەدا، خۆیدا بەدەست

ئێرانەوە لە کاتێکدا ویستی بگەڕێتەوەو نەیتوانی، گیرا، بردیان بۆ تەهران، چەند سالێ مایەوە، دوایی درایەوە بە رژێمی عێراق لەتەک ئەفسەرە نازرییەکاندا، تەفریشیانو نارتەشیانو مەحمودی جیهانگیری و ئەوانیتردا، گۆڕییانەوە. لە بەندیخانە مایەوە، شێخی ئەمر، مەحمود حەفید، فریای کەوت، لەسێدارە نەدرا.

## موحەممەد قودسی مەحمود:

ئەفسەری یەك ئەستێرە، هی ئازوخە، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945 بوو، هاتە مەهاباد و پایەی کاپتانی پێبەخشرا، ژنی هێنا لەوێ، زۆر تەبابوو لەتەکما، دوای نیسکۆ و شکست هاتەوە، لە رێگە گیرا، عەلی حیجازی بەندیکردو ناردی بۆ بەغداد، لەسێدارەدرا لە 1947/6/19.

## نوری ئەحمەد تەها:

ئەفسەری 2 ئەستێرە، جەنگی، هاوکاری بزاڤی بارزانی 1945 بوو، هاتە مەهاباد، پایەی مایۆری پێبەخشرا، هاتنەوەی هۆکاری خێزانیبوو، ئەجیبە کچی خاڵە ئەبدە خێزانیبوو، لە زینداني مایەوە، دەربەدەریو ئەشکەنجەی زۆری دی، کورد پەروەرو خاوێن، بە سەربەرزی کۆچیکرد و سەرینایەوە، دوای کۆچو رەوەی میللەت لە 1991/4/3.

## حەمە سالح ئەفەندی موحەممەد زازلی:

ئەفسەری ئەندازیار، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945بوو، پایەی مایۆری پێبەخشرا لە کۆماری کوردستاندا، گوللەی وێڵ، یاخود ڤینۆرکی کەسێتی کە جێگەی گومانە، بریندارکرا، تاکو ئیستەکەش دەرنەکەوت.

### میرحاج ئەحمەد ئاکرێی:

ئەفسەری 3 ئەستێرە، تۆپهاوێژ، هاوبەشی بزاڤی بارزانیکردو هاتۆتە مەهاباد، پایەی پۆدپۆلکۆنێکی پێبەخشرا، سەهەنگ، نماینەدەی خودی بارزانی ئەمربوو، ئەفسەری ستافی زیرەك، نهێنی قایم، کەس سوودی لێوەرنەدەگرت، بە هەژاریو بێباوکی لە ئاکرێ پێگەیشتووە، لە پێشدا مامۆستابووە.

لە کۆڕەوەی بارزانیدا بەرەو رووسیا لە جەنگی پارتیزانیدا، چووە، لە 1958 گەڕایەوە لە قاهیرەوە وێنەی لەتەك سەرۆك بارزانی ئەمر و سەرۆك جەمال ئەبدوناسر، سەرکۆماری میسر، کە هاتەوە، کەنارەگیربوو، ژیانی زۆر نهێنی تێدایە... ئەو کچە بەتەمەنەی لە ئاکرێ کە بەتەمابوو، هێنای، رۆژانی دوایی بە تەنهایی، کەنارەگیری لە بەغداد بەسەربرد، تاکو کۆچی، تێکەڵ بە کەس نەدەبوو، لە رووی دەروونییەوە، سەرنجی لەسەربوو.

### سەید عەزیز شەمزینی:

کوڕی شێخ ئەبدوڵا ئەمەری، کوڕی سەید عەبدولقادر ئەمەری شۆڕشگێڕ، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945بوو، ئەفسەری 3 ئەستێرە، یاوەری فەرماندەی کەرکوك، یەکسەر نێردرا بۆ باکۆ بۆ خوێندنی دوکتۆرا لە مێژووی رامیاریدا، بڕوانامە وەرگرتو نووسراوەی مێژوویی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی هەیە، مرۆڤی بەهاو بە نرخ، بنەماڵەو خانەدان.

### عەبدوڕەحمان ئەبیب مفتی، ئامێدی:

ئەفسەری خۆبەختکەر، هاوبەشی بزاڤی بارزانی 1945بوو، هاتە مەهاباد، لە کۆڕەوی مەزنی بارزانیدا بەرەو سۆڤیەت بەشداربووە. لە 1958 گەڕایەوە کوردستان.

## خودانی بارزان – شێخ ئەحمەدی نەمر:

مرۆڤی مەزنو ناوداری نەتەوەی کورد، پارسا، پێشەوای ڕەوانی، پایە بڵند، هێماو پیرۆزیو دەروونپاکی ، دڵۆڤانو ڕووالەتو سیمای کەسێتی، ڕەوشتو خوو بەرز، ناوداری مێژووی میللی، جێگەو شوێنەواری دیاردەیە لە دووخی بزاڤی بارزانیدا لە 1933، لە چلەکاندا، کاتی دەستبەرسەری لە سلێمانیو گواستنەوەی بۆ نوستانی بابل – حیللە، دوای دەربازبوونی سەرۆك بارزانی نەمر، گەڕانەوەی بۆ بارزان. خۆشم لە حیللە دیدەنیم کردوون، لە شۆڕشەکاندا، لە مەهابادیش، پەیکەری دادپەروەریو مرۆڤایەتی بووە.

دوای ئابلۆقەی گادەر، بە خۆیو خێزانەکانەوە، هاتەوە ئەمدیو، فەرمانی خنکاندنی درا بەسەردا و نێردرا بۆ بەسرە، دوای 1958، هاتەوە بارزان، لەوێ کۆچیکرد، کۆچەکەی کاریتێکردم، چوومو دیدەنی ئارامگەو خەوابگەکەیمکرد، لە گۆڕستانی بارزان، هیواخوازم کە گیانی بە بەهەشت شادکردووە.

## ژەنراڵ حەمە ڕەشید خان قادر خان بانە – 1889-1974:

ئەو بۆشاییەی کە گەرمکە پڕبکرێتەوە لە مێژووی خەباتی خوێناوی میللەتەکەماندا، ئەو مرۆڤە مەزنەی کە شایستەی پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەبێتە یەکێك لەو کەڵەمێرانە بەڕێز حەمەرەشید خانە، کە تاکو هەنووکە، ئەو بایەخو بەهایەی نەدراوەتێ، چونکە شۆڕشو یاخیگەرییەکەی موتوربە نەکرابوو بە ڕاگەیاندنو ڕۆشنبیرو ڕووناکبیران، کە سیمای هەموو شۆڕشێکە... مامۆستای کۆنینەناس ئەبدوڕەقیب یوسف، ئەمە پەسەند دەکات.

حەمە ڕەشید خان بێگومان مەزنە، لە 1937 لە زیندانی سلێمانی، دەربازبوو، بە هاوکاری کۆمەڵەی برایەتی و نەخشەیەکو پلانێکی کۆك کە لە لایەن شێخ لەتیف حەفیدو ئەسعەد مەحوی جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی برایەتیو کاکە فوئاد عارف کە فەرماندەی سوپابووە، لە 1936 و دەرفەتهێنان لە جەژنی تاجگوزاری پاشایەتی ڕژێمی عیراقدا، 2 دەمانچەیان ناردە ژووری بەندیخانە بۆ

حەمە رەشید خانو هاورێکانی لە زینداندا، مەجید گەڵباخی، سەید عەتای یاخی، دەمانچەکان لە ناو پاکەتی شیرینیدا بوون... بەندیخانەیان شکاند، دەربازبوون، بەڵام مەجید گەڵباخی، دەربازنەبوو، مشکیو پشتێنەکەی لە لاقی ئاڵابوو، 4 تفەنگی هەڵگرتبوو، درا بە دادگا، هەر بەڕێز شێخ لەتیف و بریکاری کۆمەڵەی برایەتی بەڕێز مامۆستا ئەسعەدی مەحوی، پارمەتییاندا و سەرفرازکرا، گەڕایەوە بۆ هەرێمی خاوەرو لە شۆڕشی جوانڕۆدا، هاوبەشبو، گیرا، لەسێدارەدرا.

ئەو شەوە بۆ بەیانی کە لەسێدارەی دەدەن، ریشی دەتاشێ، خۆی خاوێنو رێکدەخا، بەو مەبەستەی کە خانمانی سنە دێنە سەر تەرمەکەی، رەنگزەردیو چەپەڵی پێوە دیار نەبێت، گەردی لێنەنیشێت.

حەمە رەشیدخان هاتەوە لانەی خۆی لە وێنەو دارۆخان، دەفەری شلێر، لە هەرای ئێراندا شاری بانەو سەقزی گرت، لە جەنگی ئێران ئازادیکرد، فەرمانڕەوابوو، دووبارە هاتەوە بۆ ئەمەنیو، بە دەستبەسەری لە ئوستانی رومادی – ئەنبار، کەرکوک، بەسەربیرد، هاوکاری کۆماری مەهابادیکرد لە کوردستان... پایەی ژەنراڵی پێبەخشرا، هاتە سەراو سەرچاوە، ناکۆکی کەوتە نێوانی ئەوو پێشەوای مەزنەوە، لەسەر شێوازی فەرمانڕەوایەتیو بارودۆخی سەردەم کە هێڵی رامیاری کوردی لەو بازنەیەدا دەسووڕایەوە، نیگەرانی پەیدابوو، گەڕایەوە، خۆیو مەجید خانو ئەنوەر بەگی کوڕی و لەتەك سەرکردەی سوپاکەی حەمە ئەمین خانی برای، دەستی راستیو ئازاو دلێر، تەگبیرکەر و پیلاندانەر، لە گرتنی بانەو سەقزدا... رژێمی عێراق بە دەستبەرسەری ناردی بۆ رومادی دوایی بۆ کەرکوك.

لە شۆڕشی نەتەوەیی کورد، ئەیلول 1961، دووبارە ، هاتەوە مەیدان هاوبەشیکرد، پێنجوینی گرت، تاکو کۆچی، لە هاریکاریدا، درێغی نەکردووە... لە دارۆخان نێژراوە 1974/12/3.

دۆکومێنتو بەڵگەو نامەکانی لە سوید چاپکراوە لە لایەن مامۆستای مێژووناس، مەحمود مەلا عیزەتەوە.

**كۆڕەوى مەزن – 1947/6/17:**

دواى 15 رۆژ ئابلۆقەو گەمارۆ لە كێوى گادەر، لە گۆشەى 3 سنوورى دەستكرد، ئێراق، توركيە، ئێران، بەڕێز شێخ ئەحمەدى بارزان بە خۆيو خێزانەكانەوە خڕ هەموو هاتن بەمەديودا، هەندێك لە ئەفسەرەكان جودابوونەوە... عەلى حيجازى فەرماندەرى هێزى گەڕۆكى عيراق، ئەو ناوچەيەى گرتبوو، خێزانەكان خرانە پەرزينو سيمەوە، بەڕێز شێخ ئەحمەد و مرۆڤەكانى نێردران بۆ بەسرە.

سەرۆك بارزانى ئەمر بە 800 جەنگاوەرەوە، لە ناكاودا بە هەڵمەتى شێرانە هاتنەوە چياى شيرين، ئازوخەو نانى يەك مانگ كۆكرايەوە، بە هەڵمەتى شێرانە لە گوندەكانى باكوورەوە، سنووريان شكاند بەرەو رووسيا، دواى چەند بەرەنگاريیەك وەكو پڵنگى هێرشبەر، خۆمان گەيانده سەر ئاوى ئاراس، لەوبەرەوە گەمێى رووسى چاوەڕوانبوون، بە چەكەوە، بە كۆڵو بارەوە لەژێر دەستڕێژو گوللە باراندا بە پردى جولفاو تەنكايیەكانى رۆبارى ئاراسدا، بە پردى ئارەبلو، خۆمان گەيانده خاكى كاپكاس، ماوەيەك لە كەرەنتينە، دوايى بڵاوەمان پێكرا، لەو وڵاتە پانوپۆڕەدا، تەممووزى 1947، ماوەيەك لە كاپكاسو ئوزبەكستانو قيرغيزستان، مامەوە، هاتمەوە لەتەك چەند كەسێكى دۆست، گيرامو دادگاكرامو 2 ساڵ بە زنجيرەوە بەندكرام، نهێنيم نەدركان، ئەركى راميارىم بەديهێنا، راسپێريم هێنا بۆ پارتى كۆمۆنستى عێراق كە بە ناوى ناسيۆناليستەوە كاربكەن، پارتى كۆمۆنيستى كوردستان بێتە ئاراوە، كۆڕەوى مەزن، باسێكى تايبەتييە لە بوارى تردا باسمكردووە.

ئيتر لێرەوە، ژيانى دەربەدەرى، رەهەندەيى، 13 ساڵ، 2 ساڵ بەندى قورس بە زنجيرەوە، 6 ساڵ دەستبەسەرى لە كەنارى خوارووى باشوورى عێراق، لە زۆنگاوەكان... ئەم 21 ساڵە هاوسەنگى ژيانى كەريم زەندە.

## ماوەتو قەشان:

لە بەندیخانە بەربوومو گەڕامەوە سەر پیشەی مامۆستایی و کرام بە کارگێڕی خوێندنگەی ماوەت.. ئەمین یامولکی بەخشداربوو، دوایی بوو بە فەرمانداری چوارتا.. ماوەیەك ماوەت بەخشداری نەبوو، حەمە جەمیل رەزا بوو بەخشدار، هاوڕێبووین، شارەزایی کەمبو لە تەکنیکی فەرمانڕەوایدا، نێوانی خۆی تێکدا لە تەك قۆمیسەرو نووسیاری بەخشدا، دەهاتەو خوێندنگە لام، دەیویست هەواڵو باسی پێبڵێم، منیش بە زەقی پێموت: مـن زیزو و زیـر دەزانم، مامۆستام، هەواڵوباس نازانم... ئیتر نەهاتەوە بۆ لام، خۆمم لێزویر کرد.. دووبارە هاتەوە، وتی: باشە پێمبڵێ ئەم قۆمیسەرو نووسیارە چۆنن؟ لە وەڵامدا وتم: قۆمیسەر پۆلیسە.. وتی چۆن؟ وتم: خۆت پاساییت، پاسی نێودەوڵەتی شارەزایت، ئەمە پۆلیسە، پەیوەندە بە پۆلیسی چوارتاو سلێمانیو بەغدادەوە.. زنجیرەیەکن، نووسیارەکەش پەیوەندی تایبەتی هەیە، دەرەقەتیان نایەیت..

دوایی لەیەکتر ئاشکرابوون، حەمە جەمیل وتی: ئەیانگرم، مـن بریکاری شاهم.. ئەوانیش لە بۆسەدابوون بۆی.. لیستەی گواستنەوەیان لێگرتو دەیانوت: مودیر بەگ جوجکومۆچوك ئاخوڵ بارگیر قوتدەدات..

شەوێکی تاریك، پاسەوانەکەیان لێسەندەوە، بە تەنها مابۆوە، دەترسا، ناردی بە دوامدا، مەجید بەگی قۆڵچی، باڵباز، لە سەربانەوە هاوارێکرد، کەریمە فەندی، مودیر بەگ بانگتدەکات، بە پەلە چووم.. کە دیم خۆی شاردۆتەوە، وتم وەرە دەرێ، تۆ بریکاری شاهی، وتی دەمکوژن، منیش ناردم بە دوای کوڕەکوڕەی ماوەتدا، 15 تفەنگی بڕنەو هاتن، چامان بۆ ئامادەکردن، خۆی گیرو چنۆکبوو، چایەکی بە کەس نەدەدا.

هاتەوە هۆشخۆی وتی: بەخوا تۆ ورەت بەرزە، وتم: بە چاکی خۆم پشت ئەستوورم، نا ترسم.. دوایی پێموت، لیستەی گواستنەوەکەت گیراوە، 50 وڵاخی نووسیبوو، هەموو ماوەت 4 بارگیرەلاتی تێدابوو.. ئەو شەوە بەسەرچوو، بەیانی کازیوە، مودیربەگ هەڵات، چوو بۆ بەغداد، چارسەری خۆی بکات.

بە تەنها مامەوە، لە مەیداندا، ئەوانیش وایان دەزانی کە گوایا مـن هانی دەدەم، مامۆستای ئەوم، ئەویان بە نەزان دەزانی، کە لە راستیدا، ئاراستەکەری

چاكە بووم.. كەوتمە بەر هێرشی ئەوان، لای فەرماندار، سەعید ئەبـدولقادر، كۆنـە چەكمەڕەق، سەر بە عومەر ئەزمیو نوری سەعید.. بەڕێز حاجی حەماغای گەڵاڵە، لەو گێژاوە زرگاریكردم.. نامەی نارد بۆ فەرمانداری چوارتا، وتـی: كەریمـە فەنـدی خزمی دەخۆنە، واتە خۆمانە، گەرەكە ئەوازشت هەبێت.. ئەمە بەسەرچوو.

خوێندنگەی شەوم كردبۆوە، بە پەرەو پێنووسـو لوكسو چـراو نـەوتی خـۆم، تەنها تەختەی رەشو تەباشیر هی میری بوو.. خوێندنگەی رۆژ 6 پۆلو 3 مامۆسـتا، پۆلـەكانمان تێكەڵدەكرد.. دوای نیـوەڕوان دەچـووم بـۆ قەشـان، مامۆسـتای نـەبوو.. ئەمهێشت دابخرێت، ئەو سەردەمە مامۆستا كەمبوو.. ئەبدولاغا قەشان برای فـەقێ رەشید و حاجی حەمە عەلیاغا، خاوەنی گوندی قەشان بوون.

هاتەلام، وتی: كەریمە فەندی بەزاری خێڵەكی، بنووسـە، مامۆسـتامان نییـە.. ئـەو سـەردەمە وشـەی موعـەلیم بـەكار دەهـات.. منـیش ڕێنمـایەكرد، ناردمـەلای بەخشدار، بۆ ئەوەی تـاوانێكم بـۆ ساز نەكەن، بەخشـدار كوردی نـەدەزانی، بـانگی كـردم، وتـی: ئوسـتاد، ئـەو ئەركەت پێدەسپێرم، وتم: فـەرمانت هەیـە.. ئـەو سـاڵە پەیدەرپەی، بەیانیان لە ماوەتو دوای نیـوەڕوان لـە قەشـان، شـەوانەش دەگەڕامـەوە ماوەت.. 2 پۆل خوێندنگەی شـەوم هـەبوو بـۆ بنـبڕی نەخوێنـدەواری.. بـەم جـۆرە گوزەراندم.

## پاداش:

ساڵ 1959، دەبدەبەی نیشتمانپەروەریو لافی كوردایەتی، پارتی دیموكراتی كوردستان سیلەو مۆڵەتی وەرگـرت، هـاتن بـە دوامـدا، زۆریـانلێكردم، رووگیر بووم، جیـب ئامـادكرا، وتم كـاتی خـۆی بـەپێ هاتووچۆمان دەكـرد.. چـوومە مـاوەت لـە تەكیاندا، هەڵبژاردن بوو، كە منیاندی وتیان كەریمە فەندی چییە، ئێمەش لەتـەك ئەوەلین، هەڵبژاردن نییە، ئەو پارتە، ئێمەش پارتین، ئەو كوردە، ئێمەش كوردین، هیچ نییـە، وەكو ئـەوین، هـەر هـەموویان هاتنـە لای من.. منـیش وتم: من كوردم، كوردستانیم

لەبری ئەو ڕێزو بایەخە، تـۆزێ خـۆڵم هـەڵگرتو نامـە نـاو دەمـەوە، لەسـەر سەرمدانا، وتم: من ئەگەر خەڵكی مەڵكەندی ئەبم، خەڵكی ماوەتو قەشانم.

## خوێندنگەی گۆیژە:

گوێزرامەوە بۆ خوێندنگەی گۆیژەی سەرەتایی، 2 مانگ بەسەرچوو، مامۆستا غەفور مەلا عەلی کارگێڕبوو، رۆژێک لە ناو ژووری پۆلدا، وانەی جوگرافیام دەوتەوە، ئەفسەری ئاسایش، مارف ئوسمان، یەکە نۆکەری بێشەرم، لە هەموو ولاتدا، هات، پەلبەستی کردم بۆ بەندیخانە، بەرەو ئەبوغرێب، نانی بەیانیم نەخواردبوو.

## گرتووخانە:

سەرماوەزبوو، 2 رۆژ بەر لە گرتنم پاڵتۆیەکی لەنگەم کڕی بە 2 دینار، فریامکەوت بۆ زستانەکەی بەندیخانە.. بە پەلبەستراوی هێنامیان بۆ گرتووخانەی سلێمانی، شەوێکی لێمامەوە، بۆ بەیانی بەڕێیانکردین، بە پاسە تەختەکان بۆ کەرکوک، خوێندکارەکان بە گریانەوە هاتن، ماڵئاواییان لێکردم، ئێوارە بۆ سەر شەمەندەفەر، لەتەک بەرێز مەحمود فەقێ موحەمەد، سەرۆکی خێڵی هەمەوەند، لە کەلەپچەیەکدا بووین، پۆلیسەکە، ئێوارە لەسەر شەمەندەفەرەکە دەستی کردمەوە، دەستوو دەموچاوم بشۆمو نوێژ بکەم.. دەمتوانی رابکەم، بەڵام نەریتی کوردایەتیو رەوش رێی پێنەدام پۆلیسە هەژارەکە سزا بدرێت بەهۆی منەوە، ملی رێمانگرتو گەیشتینە بەغداد، بردیانین بۆ کارگێڕێتی ئاسایشی گشتی.. بیجامە لەبەرو خاولی لە مل، بەزیو، درگێنەران، تەپیو، رووخاو، لە ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی عیراق، یەکێک لەوانە مالیک سەیف، رەفیق چالاک، عومەر عەلی ئەمین.. مالیک سەیف وتی: نایناسم، ناویم بیستووە، پەڕەی کردیان بۆ پڕکردینەوە، بەرەو ئەبوغرێبیانبردین.. فەرمانی سوپایی لە ئارادابوو، لەو سەربازگەیە، رووتکراینەوە، بۆ پشکنین، نەیانهێشت دراومان پێبێت، هیچ شتێک بە نەرمەڕاکردن بەرەو تەویلەکان.. ناو ژوورەکان کۆنکرێت کرابوو هێشتا ئاوی تێدا وەستابوو.. ژووری گچکە 2 کەسی دەگرت، تەنهایی، تاریکو نوتەک، بێچرا، پەنجەرەی تێدانەبوو.. 5 مانگ پتر ماینەوە، رۆژمان لێتێکچووبوو، تەنەکەیەکو شەربەیەکیان بۆ دانابووین، تەنها بەیانیان بۆ ئاودەست یەکجار دەبراین.

بە ئێمکی ناو چێشتەکان، نیشانەو ئاماژەی دیوارەکانمان دەگرد، لە بۆشایی بلۆکەکانەوە، لەتەک گرتووەکاندا دەدواین، مامۆستا هەمزە ئەبدوڵا، گیرابوو، کابرێکی خانەکینی رۆستەم هەیدەر، بە عەرەبی شکست لێی دەپرسیم، منیش دڵخۆشی ئەو و هیتریشم دەدایەوە.

شەوانە، زرەی زنجیرو لێدانو گریانو هاوار دەهات، بە مەبەستی ترساندن و رووخان، زۆر کەس بەو جەنگی دەمارە، دەروخاو ئهێنی دەدرکان..

شەوێك، نماینەدەی تەندروستی جیهانی هاتنە لامان، بە ئینگلیزی دەدوا، لێیانپرسیم، تۆ چیت؟ وتم: مامۆستام، وتیان: مامۆستای چی؟ وتم: مامۆستای مێژوو جوگرافیا، وتیان بۆ گیراوی، وتم: ناحەز بەگرتی داوم.. ئێمەش رەنگ زەردو هەتاومان نەدەدی، ریش هاتوو، کراسوبەرگی چڵکن، پاڵتۆکەم ناوەژوو لەبەرگردبوو، راخەرو سەرینیش بوو، ناو ژوورەکە تەروتووشی هەبوو.

ئەو زستانەمان بەسەربرد، گرتووخانەی ئەبوغرێب هەڵگیرا، لە ئەنجامی راپۆرتی ئەو نماینداندا، گوتبوویان کە ئەم شوێنە، شوێنی ئاژەڵە.

هاتینە گرتووخانەی کەرخ، دەرگای ئاسنی گەورە، کونکون، خەڵکمان لە شەقامەکانەوە دەدی، دەهاتینە دەرێ بۆ دەموچاوشتن، وامانەزانی بەربووین..

گرتووەکان، کراین بە 2 بەشەوە، بەشێکمان دران بە دادگای رەسافە، ئەوانە هەرهەموو بەربوون، بەشەکەیتر بۆ دادگای کەرخ، ئێمە دراین بە دادگای مەزن، پارێزەری بەرێز نیشتمانپەروەرو پارێزەری بوێر کاك موحەممەد بابان، ئەونی یوسف، مەردانە، دادگۆکیان لێکردین، تاکو سەر گۆڕ شەرمەزاریانم.

گەواهی درکێنەران، ئێمەش لە رکەی دادگادا، یەکێك لەو بەزیوانە، خوێنی منی کردە کاسەوە، وتی: ئەمە لەتەك فەهدابووە، چۆتە ئێرانو رووسیا، بەشداری شۆڕشی بارزانو کۆماری کوردستانی کردووە، لە جەنگی پارتیزانیدا بەرەو رووسیا چووە، بە ئەرك هاتۆتەوە.. وتم: ئەمانە گەواە نین، ئاگاهیدەرنین، نۆکەری ئاسایشن، خواردنو نووستنیان لەوێیە، ئاگاهیدەرو گەواە گەرەکە راستو بێلایەن بن.. وتم: بەرێز دادوەر، لەو گەواهە بپرسە، خۆی لەتەکمدابووە، یاخود بە دووربینی گەورە، منی دیوە لە ئێرانو رووسیا؟ دادپرس، روویتێکردو پرسی:

چوویتە ئێرانو رووسیا؟ ئاگاهیدەر، وتی: نەخێر.. وتی: چۆن دەزانی؟ وتی بیستوومە.. بیستن ئەو بەها یاساییەی نییە.

وێرای ئەم هەموو ئازار و ئەشکەنجەو کێبلو گازو پلاپسە، هیچم نەدرکاند و 2 ساڵ بەندی قورس بە زنجیرەوەو 2 ساڵ چاودێری پۆلیس، دوای تەواوکردنی ماوەی بەندیو زیندانی، براین بۆ زیندانی مەڵبەندی.. زووری ئەشکەنجەو ئازار، 15 رۆژی لێماینەوە.. دوایی هاورێیەکان وتیان خواست بدەین، تاکو بمانگوێزنەوە بۆ دوزەکان.. خواستەکەم نووسی، وتم راستیم لێمەدەن.

بەندکراوێك ناوی فجل بوو، شێت بوو، لەتەك فەهدا ژیابوو، پێنووسوپەرەی بۆ هێناین، هەواڵی دەبردو دەیهێنا.

دەرئەنجامی ئەوە، بڕیار درا کاروانمانبکەن.. کاروانی تێهەڵدانە بە هەموو وەردیانەکانی زیندانی، وەکو فتبۆڵ لەسەرەوە بۆ ئەوسەر.. لەو کاتەدا، پارێزەر کاك موحەمەد بابان دێتە لای کارگێری گشتی بەندیخانە، پێی دەڵێ: ئەمانەی کە کاروانیان دەکەن هاورێی منن.

پۆلیسەکان، کە سەربانو بنبانیانگرتبوو، هەرهەموو کشانەوە، ئێمەش، ئاهێکمان پێداهات.

دوایی گوێزراینەوە بۆ قەڵاکان، دوزەکان، هەر لەو بەندیخانەیە، ساڵ گوزەشت، مەحەمەد بابان وازی نەهێنا، داواکەی دا بە دادگای بەرزتر، ماوەی بەندییەکەی کەمترکردەوە، چاودێری پۆلیس، کەمکرایەوە... هاتینەوە، پێشوازیکراین.

ئەوانەی کە بەندکرابوون لەتەکمدا: حەسیب شێخ ئەحمەد، عەبدوڵا خالید، رەئوف حەمە سەعید فەتاح، وەستا حەمەلاو دارتاش، بابا عەلی، 13 کەس بووین.. موحەمەد مستەفاو میرە برای رۆفائیل جوو، لەتەکماندابوون.

## بێکارەیی، رەقەندەیو ئاوارەیی:

دوای بەندی، هاتمەوە بۆ سلێمانی، 1٫250 دینارم پێبوو، هاوڕێ، خزموخوێش هاتنە لام، 250 فلسم بۆ دان بە چا، لە چاخانەی حەمەڕەق، دینارێکم پێمابوو، بەرەوە خانووەکەمان هلتمەوە، لای ئێوارە، پێیان وتم: خانووەکەتان فرۆشراوە، رووەکردە خانەی حسێن بەگ جاف، حەسەن بەگی کوری، خوێندکارمبوو، لەتەك عەلی بەگو ئەورەحمان بەگدا، ئاشنابووین لەسەربانەکەیان دەنووستم، بێنانخواردن، تەنها نووستنبوو، کەچی چەند چامرلفێکی کوردە کۆمۆنیستەکان فەرمانیاندابوو، کە فڕێمبدەنە خوارەوە، لەسەربانەوە.. گوایا من گۆڕاوم، پارتی کۆمۆنیستی کوردستان دادەمەزرێنم، بەو سۆنگەیەوە، ئەو بێنەمەکانە، ئەحمەد غەفور و عومەر عارف بوون، ئەوانیش، نەریتی خێلایەتیو میواندار، دژیانوەستان، ناچارکرام کە بێمەوە سەربانی کەلاوە فرۆشراوەکەی خۆمان، بەرەیەکی شڕم لەسەربانەکە راخست، راکشام بە ئاگادارییەوە.

لەبەر پۆلیس بە سونییەوە هاتە سەربانو وتی: لە پۆلیسخانە داواتدەکەن، منیش نەچووم، وتم نایەم، برۆ، پۆلیسەکە چوو نامەیەکی لە ئەفسەری پۆلیسەوە عەلی ئەبباس بوو، دەیناسیم، مامۆستای کوڕەکەیبووم، منیش چووم بەهۆی نامەکەیەوە کە نووسیبووی: بەرێز کەریمە فەندی، تکایە تاکو ئێرە وەرە.. چووم، وتیان: فەرموو دانیشە. ئەوەی خانووەکەی کڕیبوو، سکالایکردبوو، وتبووی: رەبەنی خۆیکردووە بە خانووەکەیدا.. ئەفسەری پۆلیس، ئەورەحمان کیلو، وتی: ئەمە لە تۆوە دوورە، وتم: بەگ، خاوەن ماڵی، خۆیکردووە بە ماڵدا، بە خانووی خۆیدا، بەشی زۆری ئەم خانووە هی منە، بەشی کەمی کڕیوە.. وتم: ئەوە فەرمانگەی تاپۆ، خانووبەرە بپرسە.. لە کابرای کڕیاری پرسی، وتی: بەشی هەیە؟ وتی: بەڵێ.. وتم: ئەم خانووە، خانە 3 ماڵی تێدایە، ئەفسەری پۆلیس تووڕەبوو لێی، خەریکبو لێیبدات.. وتم: بەگ، وازی لێبهێنن..

هاتینەدەری، ئەفسەرەکە پێیوتم: بە فەرمانی میری تێیدابە، پۆلیست دەدەمێ.. وتم: بەگ، نامەوێ، ئەوەی کە ناچاریکردووم کە لەوێ بنووم، دراوم نییە

بچمە ئوتێل، گومانلێکراوم، لەسەر شەقامەکان بنووم، بچمە هەر خانووماڵێک، چونکە رەبەنم، پێیان ناخۆشە، هاتینە دەرەوە، سەرزەنشتی کابرای کرێچیکرد، وتم: من ئاوارەو دەربەدەرم، گریمان هاتمە خانووەکەت، گەرەکبوو رێزت لێبگرتمایە... شەرمەزارمکرد.. کابرای کرێچی وازی نەهێنا بەهۆی شێخ لەتیف حەفیدەوە ویستی بەشەکەی خۆمی پێبفرۆشم، بەڕێز مەلا کاکە حەمەی چوارتاو کاک محیەدینی چنارە ئاشنامبوون، برادەریم لەتەک شێخ لەتیف حەفیدو ئەو بەڕێزانە هەبوو.. شێخ لەتیف لە وەڵامی ئەودا وتبووی: بەو کوڕە بڵێم بەشە کەلاوەیەکت هەیە، بیفرۆشە، ئەمە رەوایە؟ ئەو کوڕە، واتە کەریم زەند، ئەگەر بێتەلام، گوندی کەنارۆی پێشکەشدەکەم، کە لە هەموو گوندەکانم لاپەسەندترە.. ئیتر کابرا پەتی پچرا، نائومێدبوو، لەڕێی میریو هەم لەڕێی خێڵایەتییەوە، ناچاربوو لە تەکمدا رێکبکەوێت.

چوومە خانەکەی عەل ماوەتی، کەلاڵەیی، قەشانی لێبوون، وتم: وەرنە خانەکەی من بەخۆڕایی، تێمگەیاندن، کێشەکەم چییە.. ئەوانیش هاتن بە خۆیانو ولاخەکانیانەوە، کابرا بێزاربوو، خواخوایبوو لەکۆڵی بکەوێت.. چوو بۆ لای حاجی قادر جەبارو حاجی مستەفا، جارجار دەچوومە لایان، رێکیان خستین بە 300 دینار، منیش هیچم نییە، دەستگیرۆیی کرام، کاک سدیق شاوەیس، کارمەندی تاپۆ بە زوویی کارەکەی راپەڕاندو خانووە گڵە شڕەکەم، دەستکەوتەوە، پێموت: من دەڕۆم، بە ئارەزووی خۆت چۆڵیبکە، کلیلەکەم بۆ دابنێ لەو شوێنە.

سلێمانیم بە ناچاری بەجێهێشت، چوومە شارەزوور، بەهۆی خوێشایەتییەوە لەتەک بەڕێز کاک تۆفیق قەزازدا.. ماوەیەک لە گوندی کەلۆڕان، سەراو مامەوە، سەپانو وەرزێر لە گوندی چنارو مۆردینەوە، خاووخێزانیان لەتەکدابوو، تووشی نەخۆشی مەلاریا – لەرزووتابوون، دەمردن، یەک هەگبە، حەبی کنینم پێبوو، هەندێکیانم بۆ رزگارکرا، خێزانێک تەنها ئافرەتێکیان لێدەرچوو، هەرهەموو مردن، ئەو سەردەمە شارەزوور، پیسترین جەشنی مێشوولەی لەرزوتای هەبوو، چارەسەریکرا لە لایەن فەرمانگەی مەلاریاوە، هاوڕێیەکی خۆشەویستی منی

تێدابوو، مستەفا کەریم غەفور، راژەی دانیشتوانی شارەزووریانکرد، مەلاریا بنەبڕکرا.

دوایی هاتمە گوندی زرگوێزی گچکە، تلەزمیت، بەری قەراخ، ماوەیەك، لەبەر گرتکخۆر نەمتوانی زۆر بمێنمەوە، وێڕای ناکۆکی شێخی ئەمرو کاك تۆفیق قەزاز، نۆکەرو دەستوپێوەند، شێواندبوویان.

هاتمە پشدەر، کوڕەکانی بەڕێز مەحموداغا حاجیاغا خوێندکارمبوون، وانەم پێدەوتن، زستانم بەسەربرد، هاوین هاتمە هۆمەرامانو کەرپچنە.. خوێندنگەیەکی بێنازمکردەوە، ساڵێ پتر مامەوە، شێخ محەمەدی شێخ ئەبدولکەریم کەسنەزانی، کرپچنە، شێخ حسێنی کوڕی زاوای شێخ سەلامی بوێژ، کوڕە شێخەکانو خزمەکانیان، قالەو قەلەندەر، شێخ عەلی کوڕانی شێخ حسێن مندالبوون، ئەم کارە، بەڕێز شێخ سەلام هۆزانڤان، رەخساندی بۆم..

لێرە کارم نەما، رووەکردە چوێسەی شلێر بۆ زستانی دوایی لای بەڕێز شێخ ئەبدولقادر چوێسە گەرسامەوە.. خوێندنگەیەکی گچکەم کردەوە، کوڕەکانی شێخ کامل، شێخ ئەحمەد دەیانخوێند، ئەوازشیان هەبوو.. ناوبەناو سەرم دەدا لە گوندی وێنە و داروخانو شیوەگوێزانو گۆڵێ، میشیاو، شەیدان، گەرمك، براڵە، دەڤەری شلێرو ناوخوان..

مەجید خانی حەمەرەشیدخان، هاوڕێیەتی کۆنم هەبوو لەتەکیدا، رێزیان لێدەگرتم، هەروەها حەمە سدیق خان سلێمان خان میشیاو، هەرهەموو خاوەن رێزبوون.. حەمە ئەمین بەگ گۆڵەو مەحمود بەگی کوڕی، بەهەمان شێوە رەفتاریان لەتەکدا دەکردم.

## کارگەری:

هاتمــە سەرچــنار، ماوەیــەك کارگــەریمکرد لای مــاتیۆس، کــونترانگریکی ئەرمەنیبوو.. دوای ئەوە هاتمە دەربنـدخان، بووم بـە ئەفسـەری پەیوەندی نێوانی کۆمپانیای سەنرابتوبریسی فەرەنسیو میری.. ساڵێك پتر مامەوە، هۆزانڤان قانع هاتە لام ، دامەزراند، ئەویش لە یاداشتی خۆیدا نووسیویەتی.

لە بارودۆخی دەربەدەریو رەهەندەییو ئاوارەییدا مامەوە تاکو 1959.

## گەڕانەوەم بۆ رووسیا:

دەرفەتم بۆ رێکەوت، بەپێ لە ماوەتو جۆمی تەیەتو کێوی هوملیو، گونـدی بێژوێ لـە شەماشـەوە، پـردی کـەلۆنی خـوارووی سەردەشـت، بـە شـنۆو لاجانـدا، بـە تەرگەڤەڕو مەرگەڤەڕدا، چیای خەلیل، بە ناو شکاکدا، دەشتی سۆما و برادۆست.. بـە ناو ملانیـو کوێرصـونیو مـاکۆ لـە پـردی ئـارەبلوەوە بـەرەو سنووری رووسـیا، وڵاتـی کاپکـاس، ئازربیجـان، تەخچـەڤان، رەوان، ئیریڤـان، بـاکۆ، بـۆ خوێنـدنی ئـەکادیمی مێژووی رامیاری و وتاردان لە شاری تەشکەندو دووشەنبی و شـاری مـاری، مـەرۆ، کە کـوردی ئـاینزای جەعفـەرین، چـەند سـاڵێك لـەم دەڤەرانـە مامـەوە، لێـرەوە بـۆ بولگارسـتان، گــەڕان بــە چــیاکانی بالکانــدا بــەپێ، چــوونم بــۆ یوگۆســلاڤیا و چیکوسـلوڤاکیا و ئـەڵمانیای خـاوەرو خۆرنشـین، شـاری بـەرلین، گەڕانێکی تـەواو بـە خـاوەری میانـەدا، ئەمانـە لـە گەشـتی زەنـدا، نووسـراوە، بـە مەبەسـتی نووسـینی جوگرافیا.

## مامۆستایی دووبارە – 1959:

یاسای پادشاهێتی لە ئێراق رووخـا، کۆمـار بـەرپابوو، گەڕامـەوە سـەر پیشـەی مامۆستایەتی، هاتمە خوێنندنگەی خالیدییە، مامۆسـتا یـونس تۆفیـق ئەبـدوڕەحمان، کارگێڕبوو، پاشـکۆی بـۆ کرایـەوە، وەکـو یارمەتـدەر، بریکـاربووم لـە 1959/10/8، دوای ئەوە کرام بە کارگێڕی خوێنندنگەی پیرەمەگروون لە 1961/3/22، مامۆستا

غەفور مەلا عەلی، کلیلەکانی لای کارگێری پەروەردە، دانابوو، کە مامۆستا موسا سەمەدبوو..

شۆڕشی کورد بەرپابوو، ئەیلول 1961، دەربەندیبازیانو دەربەندخان گیران، ئێمەش پاڵتۆو بەرگمان برد بۆ چەکداران بە ئوتومبیلی مامۆستا ولید کەرکوکی.. سوپای عێراق شاڵاوی هێنا، هەردوو دەربەند بەرگری تێدا نەما..

کارگێڕی گشتی پەروەردە، هەموو کارگێڕانی خوێندنگەکانی کۆکردەوە، داوای تەلەگرافو بروسکەی لایەنگری لێکردن بۆ میری، بەپێی ئەو کلێشەیەی کە دانرابوو مۆڵەتیش 24 کاتە.

هەر لەوێ راوێژکرا، وتم گەرەکە یەکیەتی هەبێت، هاتمەوە خوێندنگە، مامۆستاکان پێشوازییان لێکردم، وتیان چییە؟ وتم داوای بروسکەی لایەنگری بۆ میری دەکەن بەم کلێشەیە.. بروسکە لێنەدرا، 24 کات بەسەرچوو، چاوەڕوانی ئاکامیبووین.. ئاشکرایە، کە ئەم هەموو مامۆستایانە ناگیرێن و دەرناکرێن، گەڕان بەدوای ئەوانەدا کە رابوردوویەکیان هەیە، وەکو ئێمەمانان.. لیستە دوای لیستە دەردەچوو، مامۆستا دەگوێزرایەوە بۆ باشووری ئێراق.. مامۆستا حەمە سالح سەعیدم لابو، فەرمانی گواستنەوەی دەرچوو، هاتو وتی: دابڕانم بنووسە، وتم: باشە، ئەی کێ دابڕانی من دەنووسێت؟.. لەولاوە مامۆستا ئوسمان سەعید هاتوو وتی: پارت منی داوەتە دەست تۆ.. پێموت: باشە، ئەی من بەدەست کێم؟ هەرهەموو بەدەست یەزدانی مەزنە..

هەموو رۆژێ ئاسایش دەهاتن بۆ پرسین لە مامۆستا عوسمان سەعید، ئاگاهی بۆ دەرکرا بۆ ماوەیەك کە بگەڕێتەوە، ماوە تەواوبوو، مووچەی ئەو مانگەم هەرچۆنیبوو بۆم وەرگرت، دوای ئاگاهییەکەی بە ماوەیەك گەڕایەوە، بۆمنووسی کە لە پێش تەواوبوونی ئاگاهییەکەدا گەڕاوەتەوە.. یەکێ لەو ئاسایشانەی کە دەهاتن بۆ کێشەی مامۆستا ئوسمان سەعید وتی: کە من لەو ترسناکترم، راپۆرتیان لێدام کە من نوێنەری خودی بارزانی نەمرم، بەرپرسی شۆڕشم، پەیوەندیم بە دەرەوە و نێو دەوڵەتی هەیە.

ئەم راپۆرتە، لە کەرکوك، فەرماندەی لەشکر، کاك کەریم قەرەنی فریامکەوتو کەمەکێ خاوکرایەوە، بە لیستەیەکی تایبەتی گوێزرامەوە بە دەستبەسەری بۆ ئوستانی ناسرییە، کەناری زۆلکاوەکانی باشووری ئێراق 1962/11/28.. بۆ ئەلبوسالّح، سادە، کەحلا، قەلعەسوکەر لە 1964/10/19.. شەش سالّ بە دەستبەرسەری بە مووچەیەکی کەم، لە ناو هۆرو زەلکاوەکاندا مامەوە، 3 ژمە بەلگەی بوون واژۆ مۆرم دەکرد، لە پۆلیسخانە.

لە ماوەی رێکەوتنەکانیشدا، نۆرەمان بەرنەکەوت کە بگەڕێمەوە، پەنامان دەبرد بۆ هەرلایەك، دەیانوت بەدەست ئێمە نییە، تاکو چەرخی ئەورەحمان عارف، ئەورەحمان بەزاز، نامەیەکی تایبەتیم بۆ نووسی بە عەرەبی، بە هەڵبەستو پەخشان بەم جۆرە: لە برایەکی کوردەوە بۆ برایەکی عەرەب، لە برای زەنەوە بۆ برای مەعازید، نامەی تۆمارکراو گەیشت، کەوتەگەڕ، بەلاّم بێسوودبوو، تاکو ناجی تالب، سەرۆك وەزیران کوڕی حاجی تالبی ناسرییە، ئەو هەموو دوورخراوەو دەستبەسەرانەی کوردی ئازادکرد.. لە گۆڤاری رووداوی عێراقی بلاّوکرایەوە.. دوای ناوی بەرپێزان مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و سمایل عارف، ناوی منی تێدابوو، هاتمەوە بۆ سلێمانی.

الوقائع العراقية، العدد 1306

السنة التاسعة و الخميس، أيلول 1966

هاتمە خوێندنگەی مەولاناخالید، نالی، سەرشەقامی 2 تاکو 1970/1/17، کرام بە کارگێری راهێنگە، تطبيقات دار المعلمين.. لەو کارەدا هەڵبژێردرام، بووم بە سکرتێری کابینە و سەندیکای یەکێتی مامۆستایان، دەستەلاّتی سەرۆکایەتیم پێدرا.

**خانەکین – 1970:**

پەیتاپەیتا لە خانەکینەوە، داوادەکرا کە کارگێڕی پەروەردەی سلێمانی، مامۆستا سامی حسێن نازم بوو، کادەری خولی زمانی کوردی بنێرێت، ئەمیش بە هەر مامۆستایەکی دەوت، داوای نرخی وتارو پێشەکییاندەکرد، ئەویش دەیوت، ئەوە ئوستانێکیترە، لەو بارەیەوە هیچم بۆ دەرنەکەوتووە، بە ناچاری تەلەفونی بۆ کردم، خێرا چووم وتم: تەلەفۆنەکەم بدەرێ، وتی وەرە لە شوێنەکەم دابنیشە، وتم فەرماندەرکە، مامۆستا محەمەد عەبدە، فوئاد رەئوف سەراف، شێرکۆ ئەحمەد شەوقی، خۆم ئامادەین، تەلەفۆنم بۆ کردن، بە زوویی هاتن، پاش نیوەڕۆ، باروبارخانەمان پێچایەوە، ڕۆیشتین بۆ باقوبە، لەوێ شەو ماینەوە، بۆ بەیانی چووینە کارگێڕێتی پەروەردەی دیالە – دێیەلە، ئامادەییمان نیشاندا، فەرمانیاندەرکرد، هەر ئەوە ڕۆژە گەیشتینە خانەقین.

لەوێ لە سەنتەرێکا دەنووستین، زۆربەی ڕۆژەکانیش میوانداری دەکراین، مامۆستا جاوید بەگ، مەحمود زەهاوی ، ئیسماعیل کەرەم، عەدنان مایخان، پێشوازییەکی بە گەرمیان لێکردین، هەفتەیەك بەسەرنەچوو، کارەساتێ ڕوویدا، کوردێکی سەر بە بەعس، کوردێکی پارتی کوشت، پارودۆخ ئاڵۆزا، چوومە بارەگای پارتی، کاك غولام بەرپرسبوو، تکام لێکرد، کە ئەم کارە بدەنە دەستم، زۆر پەسەندیکرد، چەکدار ڕژایە ناوشار، خەریکبوو خوێن برژێت، خۆپیشاندانێکمان سازکرد، خۆمو مامۆستا عەزیز پشتیوان لە پێشەوە، هەموو ڕێکخراوو چەکدار بە دواماندا، گرمانخوارد بە هەموو شەقامەکانی شاردا ، میری، چەکداری ئامادەکردبوو، لەسەر پێبوون، منەی تەقەیەکیاندەکرد، زۆر بە ئارامی کۆتاییمان پێهێنا.. وتارێکم بۆ دان، چوومە لای عەلی عیسا بەگی ئەرکەوازی، هاوکاری کردین، ئاژاوە کوژایەوە، کارەکە لە ڕەگوڕیشەوە دوژمنایەتی ناوخۆبوو، ڕکوکینەی کۆنی چەرخی ئوسمانیبوو بۆ سەردەمی نوری سەعید، هەر بەرەیەکیان لایەکی دەگرت.. بەرەیەکیان، ئیتحادی دەستوری، بەرەکەیتر، ئومەی ئیشتراکی.. بەم جۆرە دوای

شۆڕشی تەمموزی 1958، مۆڵەتی پارتی دیموکرات ، ئەمان لایەنی بارزانی نەمر، ئەولا لایەنی هەڤاڵ مام جەلال تاڵەبانی.

لە چەرخی بەعسدا، ئەوان بەعسی و ئەمان پارتی.. بەم جۆرە، لە رووی خێلایەتییەوە بە تفەنگو ئافرەت، چارەسەرکرا.

## ئامێدی:

ساڵ زۆرا، مامۆستا موحەممەد حەوێز، حەمە رەش کارگێڕی گشتی پەروەردەی دهۆکە - نوستان، دوای گادەری خولی زمانی کوردیکرد، دووبارە خۆمان ئامادەکرد، لە تەك مامۆستا ئەبدوڵا رەزا قادر ئەژدەر، شێرکۆ ئەحمەد شەوقی.. وتم خۆتان سەرپشکبن، بۆ زاخۆ، دهۆك، من چووم بۆ ئامێدی، خولی زمانی کوردیمانکردەوە، ئاسوورییەکان، لە پێشەوە سڵیانئەکرد، بە پێ چووم بۆ لای مەترانی دووری ئەندراوس، لەتەکیدا دوام، فەرمانیدا، بە مامۆستا ئاسوورییەکان کە بەشداربن، وتی ئێمە لە ناو کورداین.

ئەرکی پێسپێراومان بەجێهێنا، بەڕێز ئەسعەد خۆشەوی، کەسی دووەمی شۆڕشی کوردستان لە فرۆکەخانەی بامەڕنیبوو، فەرمانەدی ئەو دەڤەرەبوو، دەبوایە ماڵئاوایی لێبکەم، دوای تەواوبوونی کارکەم، چوومە بامەڕنی، خەسرەو رەشید کەریم، کارمەندی تاپۆی ئامێدی هات لە تەکمدا، کە چووین هەر لە دوورەوە هات بەرەو پیرمان، وتی: من تەمەدیوە، وتم: ئەزبەنی خۆتان بێژن.. دوای هەناسەیەك، وتی: تە کەریمی.. وتم: بەڵێ ئەزبەنی، باوەشی پێداکردم، نیوەرۆ باپراخی بە پەراسوو بۆ کردین، وێنەی خۆی دامێ، لە ناو ئەو هەموو ئامادەبووانەدا، وتی: ئەڤە لەتەك تێمەبوو.. ئەڤە هەڤاڵی بارزانی نەمرە.. وتی: ئەی وردی لە کێرییە، وتم: مامۆستایە، وتی: چەوە مامۆستایە، وتم: مامۆستایە ئەزبەنی، وتی: دەبوایە ئێوە کاربەدەستبن.

دوای نیوەرۆ سیلەم خواست کە بڕۆین، کاك سەلیمی کوڕی کە فەرماندەی هێزبوو، پێیوت: جانتاکەی بۆ هەڵبگرە تاکو سەر جادە و رەوانەیانبکە.. بەمجۆرە هاتینەوە.

## کۆڕی زانیاری – 1971:

لە کۆڕی زانیاری کوردیدا، بووم بە ئەندامی یارمەتیدەر، بە فەرمانی کۆڕ چووینە رانیە، قەڵادزێ، مەرگە بۆ گەڕان بەدوای میراتو کەلچەرو وشەی کوردیو زاراوو دەستنووسدا، گوندەکانمان تەیکرد، مامۆستا کەریم شێخانیم، لە تەکدابوو، چووینە بەستەستێن لای کاک حەسۆ میرخان، میوانداری کردین، نامەیداینێ بۆ مەلا محەڕەمی مەرگە، کە گوایا دەستنووسێکی لایە، لە پێستی ئاسک نووسراوە، باسی چەرخی هاتنی ئیسلامی تێدایە، دەستنووسەکە قورسو سەنگینە، باری ئێسترە. هەرچییەکمان کرد، هیچمان بۆ ساخ نەبۆوە، دەفتەرێکی گچکەی شڕی نیشاندایین، لە نووسینی شاگردی 6 سەرەتایی دەچوو.

هاتینە بێتواتەو سەروچاوە و بالیسان، بە گوندی هەرمکێ، شکارتە، چیوەی سەروو خواروو، بۆ لای مەلا سەلامی چیوە، کەریم شێخانی لە پێشمەرگەبوو بە قولیا نەدەگەیشتم، ئەو شەوە لە گوندی چیوە گرتمەوە.. بە دۆڵی بالیساندا، بە زوینوەتێردا بەسەر شەقڵاوادا هاتینە خوارەوە هەر بە پێ، لەوێوە هاتمە هەران، لای کاکو دیدەنی ئارامگەو خەوابگەی لە چیا هەڵکەندراوەکان لە ئەشکەفتێ، دەربارەی رێبازی پارسایی کاک زانیاریم وەرگرت، هەر بە پیادەیی هاتمە نازەنین، جەلێ، چنارۆکی بڵباس، هاتمە شاری کۆیە. کاک عەلی بەهار سلێمان، فەرمانداربوو، کۆمەکی پێکردین..

لەم ماوەیەدا، کۆنگرەی نووسەرانی کورد لە هەولێر بەسترا، بەشداریمکرد. ئەو گەشتەش بەوجۆرە کۆتایی هات.

دوای هاتنەوەم، مەلا محەڕەمی مەرگە خەریکبوو تووشی گاشەیەکمان بکات لە فەرمانگەی پاشەوار، سکاڵای لێکردبووین، ئێمەش لە رووی راستییەوە، وەڵامێکی یاساییمان پێشکەشکرد، تاوانەکەمان لەسەر لاچوو، شێخ موحەمەد خاڵ خاوەنی هەستونەستی نەتەوەیی، راستیەکەی روونکردەوە بە باشی بەلای ئێمەدا شکایەوە، خۆی بریکاری کۆڕی زانیاری کوردبوو ئەو سەردەمە.

## بنبڕی – نەهێشتنی نەخوێندەواری:

لە چێوەی گەڕانەکەمدا، بەدوای کەلێچەرو دەستنووسدا، چوومە چۆمانو ناوپردانو ماکۆس، نەچوومە خزمەت دیدارو دیدەنی بارەگای سەرۆک بارزانی نەمر، شەو هاتمەوە چاخانەکەی رایات، لەسەر تەختەکان نووستم.

کە سەرۆک بارزانی نەمر، شەو درەنگ دێتە بارەگاو هەواڵی ئێمە دەزانێ، دەڵێن، کەریم زەند هاتووە بۆ ئێرە.. دەفەرموێ: چتوف نەهاتووە بۆ ئێرە، سڵدەبێ.. مام ئەلی کە لە بنەڕەتدا کاپکاسییە، کە شوێنی بتمانەیەتی و تەنها مرۆڤە لە بەردەمی بارزانی نەمردا، بدوێ و بوێرێ.. دەڵێ: ئەزبەنی کەریم زەند کاری بە بەرێزتان نییە، بۆچی دێت.. دەفەرموێ: چەوا، کاری نیتە، مام ئەلی.. مام ئەلی دەڵێ: ئەزبەنی کەریم زەند، زیرەفانو جاسوسو نۆکەرو جاش نییە، تاکو بیبەخشی، جاش نییە کڵاشینکۆفی بدەیتێ.. بەدوای فەرمانبەریو کارمەندیو دراودا ناگەڕێ.. سەرۆک بارزانی، لەمەدا راماو خامۆشبوو، دەست بە شانی مام ئەلیدا دەکێشێ، دەڵێ، خودی راستبێژی.

دوایی هاتمەوە بواری بنبڕی – نەهێشتنی نەخوێندەواری، 15 ساڵ کارمەند، سەرپەرشتیار، بریکاری کارگێڕ، لیستەی گەڕانو هاتووچۆم نەدەکرد، دەرماڵەم وەرنەدەگرت، ماوەی کارمەندێتی زۆر گەڕام، گوندو بەخشو شارۆچکەکانی ئوستانی سلێمانی، زوربەی، خوێندنگامان تێدا دەکردەوە.

بۆ نموونە، لە گوندی زەماوەندگەی نزیکی باوەنور – پێباز سەر بە کەلار، کە لە چەرخی ئوسمانییەوە، خوێندنگەی تێدانەبووە، کوێخا مەلا فایەق، گەواهە.

هەر لەو گەشتو گەڕانەدا، دوای رایات، هاتمە خەلیفان، باپشتیان، لای ئێوارە چاوم بە ئەنوەربەگ عارف بەگك کەوت، فەرمانداری مێرگەسووربوو، لە چاخانەی خەلیفان لایدا، کەمەکێ پەیەکەوە دانیشتین، ویستی لەتەکیدا بگەڕێمەوە.. وتم دوێنێ شەو لە مێرگەسووربووم، چوومەتە خزمەت شێخ موحەمەد خالیدی کوڕی خودانی بارزان، شێخ ئەحمەد، میوانی ئەو بەڕێزەبووم.

چوومەتەلای کوڕی حەمەدەمین میرخان، شیروانی، وێنەم لێداواگرد، دایمێ، لە گۆڤاری دەنگی مامۆستادا، روونی دەکەمەوە، فارمەانێتی ئەم جەنگاوەرە.

هەروەها چوومە گوندی ژاژوك، کە حەسۆ میرخان، خەڵکی ئەو گوندەیە.. لە خەلیفانەوە چوومە جافرەکان، شانەدەر، رێزان، بلێ، بارزان، چوومەلای بەخشدار، دیدەنی مزگەوتە کۆنە دێرینەکەیمکرد کە پێش ئیسلام، هەر پەرستگەبووە، کەنیشتەی جوو، کڵێسەی کریستیانی، چەرخی ئیسلامی گراوە بە مزگەوت.

چوومە دیدەنی ئارامگەو خەوابگەی بەڕێز خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان، 1969 کۆچیدوایکردوە، لە کاتی خۆیدا، کۆچەکەی کاریتێکردووم.

## نووسەرانی کورد:

وێژەی کورد، بە هاوبایەخی بە تایبەتی، نووسەرو بەرپرس لە رابەرێتی و کۆڕو کۆماو رەوتی مرۆڤو مەردوومی کورددا، لە چاخو چەرخەکاندا، کە ئەرکی مێژونووسی چەرخو سەردەمو دەروونو دەربڕینی میللی هەیە، لە بواری ژیانو رووداوەکانیدا لە سنوور و چێوەی وێژەو گۆڕانکاریو رووداو و گەشەکردنو داهێنانو پێشەنەستی ئەطرانو باروداخو کاریگەری وێژەی نەتەوەو میللەتانیتر، ئارمانجو ئاواتی ستراتیجی گۆڕاندا، ناوازەیە.. بۆ ئەوەی پەیدەرپەی، پەی بەوە ببرێت، کۆتایی تروپ، پۆپە، لوتکە نییە.

بەڵکو کۆتاییش هەر نییە، هەر چەندە هۆکاری وەکو رۆژنامەو گۆڤارو تێپەڕبوون بەسەر ئەم شێوازەشدا وێژەیی یاخود رەشۆکی، ئەوەی کە گرنگە چ نوێکارییەك خراوەتە سەر کەڵچەر؟ چ نوێکردنەوەیەك، بابەتی نوێ، فراوانتر، ناواخن، خراوەتە بەردەمی خوێنەر، چونکە وێژە بەشێکە لە هونەر، هونەریش لاساییکردنەوەی ژیانە، هەرهەموو لە کێشو سەنگو پێوەرو تەرازوودا، دەردەکەوێ.

هەموو زمانێك بنەماو پایەگاو بنەڕەتو بناغەی پتەوی خۆی هەیە، شەقڵو گۆڕانکاری، دیاردەی تایبەتی خۆی هەیە.

ئەرکی نووسەرو شارەزایی لە زمانداو هەست بە گرفتی میللەت، بڕوا بە گەشەکردنو نوێخوازی، پشت بەستن بە رۆشنبیری گشتی، هەروەها بە تایبەتی ئەو سوورِ و خولو رۆڵەی کە بە گۆڕانکاری دراوە.. ئەمانە هەر هەموو کێشو سەنگی دیاریکراوی خۆی هەیە، وێژەی کوردی هاوچەرخ شانبەشانی مرۆڤایەتییە، لە بونیادنانی داستانە مەزنەکەیدا. لە هەموو بوارو لکەکانیدا.

لێکۆڵینەوەی مێژوویی وێژە، لکێکی زیندووە، رشتەیەکی پرشنگدارە، لە لکەکانی رۆشنبیری و چاوگە بنەڕەتەکانی کە بەرووبوومی هەیە، بەرهەمی هەیە، ئەو بەرهەمەی کە توانای بیرکردنەوەو ئاراستەیی، بونیادنانی مرۆڤایەتیو جێگیرکردنی هەستونەستو نیازو خوازە، لە هەموو جۆرە ژیانێکدا و ئاشکراکردنی رامانە، بە بەدی یاخود نێکی، چاکو بەد.

هەرچەندە گەڵە هۆزانڤانو هۆنەرو نووسەرانی وەکو حاجی قادری کۆیی، مستەفا بەگی کوردی، نالی، حەمدی، پیرەمێرد، گۆران، زێوەر، نوری شێخ ساڵح، بێکەس، بێخود، سەلام، هەردی، رەمزی مەلا مارف، تۆفیق وەهبی، محەممەدی خاڵ، قانع، د. عیزەدین... لە هاوچەرخەکان، حەسیب قەرەداغی، ع.ح.ب، ع.ع. شەونم، کاکەی فەلاح، دیلان، کامەران.

دوای شۆڕشی گەلاوێژی 1958، جموجۆڵ و چالاکی وێژەیی، سەریهەڵدا، نووسەرانو شاعیران لە خانەی یەکتردا، کۆدەبوونەوە، لەوانە، بەڕێز محەممەدی خاڵ، شاکیر فەتاح ئەحمەد، رەمزی مەلا مارف، کامەران، کەریم زەند... هیتر.

لە لایەکی ترەوە، بوێژی ئەمر گۆران ئەبدوڵا، لەتەك نووسەرانی عێراقییدا، تەبابییەك پەیدابوو، چەند نووسەرێکی تێدابوو بە ئەندام وەکو مستەفا ساڵح کەریم، کەریم زەند... هیتر.

چەند جارێك کۆبوونەوەکرا، ئەبدوڵا گۆرانی مەزن وتارێکی درێژخایانیدا، لەبارەی مێژووی وێژەی کوردەوە، لەم کەشمەکەشەدا، دەستەیەك، لە نووسەرانی کورد، کۆمەڵێ نووسەرو وێژەوانی کوردیان دامەزراند.. ئەم بەڕێزانە، بوون بە دەستەی دامەزرێنەر: ئەنوەر مائی، ساڵح یوسف بامەرنی، محەممەد تۆفیق وردی،

حسێن رشوانی، کەریم زەند، مەجید ئاسنگەر، بورهان قانع، محەمەد مەولود مەم، حەیدەر محەمەدئەمین، مستەفا نەریمان سەید ئەحمەد، شەفیقە لەیلان، حەسیبە محەمەد، ئەحمەد حەمە رەشید، رۆستەم نافع فەتاح، بەشیر موشیر، دوای سالآنی شەست، بارودۆخی کوردستان ئالۆزبوو، شۆڕشی کورد لە ئەیلولی 1961 بەرپابوو، نووسەران بلآوبوونەوە، یە کیەتی شێوا، یاسایی نەما.

سەر لەنوێ، دەوستەیەکی نوێ، بەرنامەو پێڕەوو پرۆگرامو یاسای ناوخۆییان دانا، 1970، دەستەی دامەزرێنەری لەم بەرێزانە پێکهات: جەمال بابان، د. ئیحسان فوئاد، حسێن عارف، د. مارف خەزنەدار، کاکە مەم بۆتانی، د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، خالید دلێر، د. کاوس قەفتان، د. نەسرین فەخری، محەمەد مەلا کەریم، نوری عەلی ئەمین.

بەیانی ئازار – ئاودار 1970، رێژەی ژیانی خەباتی میللی گۆڕی، خاڵی وەرچەرخانبوو لە مێژووی، کۆششو خەباتدا، رێڕەوو یاسا بۆ رێکخراوەکاندانرا، دەستەیەکیتر لە نووسەرانی کورد، کودەتا، گەرددانیانکرد بەسەر دەستەی دامەزرێنەری پێشوودا، بە سەرۆکایەتی ئەورەحمان هەژار موکریانی. رێخۆشکرا بۆ بەستنی یەکەم کۆنگرەی نووسەرانی کورد لە بەغداد لە هۆڵی خولد، لە حوزەیرانی 1970، بە وتاری مامۆستا هەژار موکریانی کۆنگرە کرایەوە، لە وتارەکەیدا، هێرشی بردە سەر دەستەی پێشوو، بە خۆفرۆشی ناوبردن، ئەم ناووناتۆرەیە لەسەریکەوت.

ئەگەر رەوابێ بڵێین کە مێژوو گردوکۆو سەرجەمی چەرخوچاخی دێرینو کۆن بێت، بە رووداوو کارەساتو پیاوو مرۆڤو قارەمانەکانیەوە، چەرخو سەردەمی هەنوکەش پشتیوانو پاڵپشتە، قووڵاییو رەهەند دەبەخشێ بەو رووداوو کارەساتە مێژووییانە، درێژە پێدانی مرۆڤایەتی قارەمانانو پیاوەکانیەتی.

یاسای ویستی خەباتە، ئەو ویستە تێکۆشەرو خەباتگێرە ئەخشەکێشەری بەرهەمهێنەرو بەدیهێنانی ئەو گردو کۆیەیە کە سەرئەنجامی پاڵپێوەنەرو هاندەری رەوتی مێژووە، لەسەر رێی کردار و بەدیهێنان.

رەوا، لە ئابڕوی وشەدایە، ئەو دروشمەی کە بە سەر داری ئاڵاوەیە، بەرزو بڵندە، لە ناوقەدی ئەو مرۆڤانەیە، کە بەخشراوە پێیان، بە ئاشکرا دەڵێن و پێشەنگن، بوێرو نەترسن، چونکە وشە هەڵوێستە لێرەدا، بە ئاگایە، لە بیرەوەریدا دەیپارێزێت، مێژووش، لە یادەوەریو مێشکی خۆیدا، پەسەمەندەی دەکاتو چیرۆکو سەرگوزەشتەو سەرهەڵدانی بەسەرهاتیان دەگێڕێتەوە، لە شێوەی داستاندا بە درێژایی چەرخو سووڕی گۆی زەوی، لە پێچانەوەی ساڵەکان لە دووتوێیدا، پەپوولە بە خولی چراو گڕی مۆمدا، دەسووتێ، رووناکی چراو مۆم کز دەبێت، رەوغەنی تێدا نامێنێت، شەوگار شەق دەبێت، بەڵام چیرۆکی دڵی من کۆتایی نایەت.

## کۆنگرەکان:

1. 1970/6/23 لە هۆڵی خولد، هەژار موکریانی بوو بە سەرۆك.
2. 1970/7/17-14 لە هەولێر، سەیدا ساڵح یوسفی کرا بە سەرۆکی نووسەران
3. 1973/11/5 لە بەغداد، دووبارە سەیدا ساڵح یوسفی کرا بە سەرۆك.
4. 1974/1/10 بەغداد، هۆڵی زانکۆی موستەنسرییە، هەر سەیدا ساڵح یوسفی دانرایەوە بە سەرۆك.
5. 1978/9/10 لە هەولێر، د. عیزەدین مستەفا دانرا بە سەرۆك.
6. 1979/9/15 لە بەغداد، دووبارە د. عیزەدین دانرایەوە. 12 ژمارە لە گۆڤاری نووسەری کورد، دەرچوو.

دوای 1974-1975 دووبارە سستی کەوتە ناو ریزی نووسەرانو بزاڤی وێژەیی.

لە دەرەوە یەکێتی نووسەران دامەزرا، ئەندامانی کارای: مامۆستا هەردی ئەحمەد، سەعید ناکام، بە سەرۆکایەتی سەیدا ساڵح یوسفی، لە بایەکراواو دەربەند، ژمارەیەکیش لە نووسەری کورد دەرچوو.

7. کۆنگرەی راپەڕین – شەقڵاوە، 1991/10/17-15، د. عیزەدین، فەلەکەدین کاکەیی، ئەبدوڕەحمان مزوری، محەمەد موکری، ئیدریس چەلکی، فوئاد جلیزادە، حەمە، حەمە باقی، ئەبدوڕەقیب یوسف، جەلال بەرزنجی.. ئەندامانی سپێر: زاهیر رۆژبەیانی، ئەبدوڵا سەراج.

**لقی نووسەرانی سلێمانی – سەرۆکەکانی:**

1- بەڕێز، قازی شێخ محەممەد خاڵ شێخ عەلی حاجی شێخ ئەمین، 1970/10/4 - 1971/1/1 ، 1973/11/22 - 1974/7/26، 2 جار.

2- بەڕێز شاکیر فەتاح ئەحمەد، 1971/10/1 - 1971/10/10.

3- ئەحمەد هەردی حەسەن عەزیز بەگ، 1971/10/10 - 1972/12/8.

4- ئەمین میرزا کەریم شریف، 1972/12/8 - 1973/11/22.

5- ئەزی گۆران عبدالله، 1974/7/26 - 1978/10/9.

6- مستەفا ساڵح کەریم، 1978/10/15 - 1979/10/23.

7- کەمال مەمەند میراودەلی، 1979/10/25 - 1982/3/5.

8- موحەممەد ئەمین پێنجوینی، 1985/2/23 - 1986/1/12.

9- کەریم زەند محەممەد ساڵح، 2 جار 1986/1/12 - 1986/7/18
1986/7/18 - 1988/4/8

10- دلشاد محەممەد ئەمین مەریوانی، 1988/4/8

دەستەی کارگێڕی: فریا جاف، هوشیار بەرزنجی، حەسەن تەنیا، سەلاح محەممەد، ئازاد مەحمود.

11- فریاد جاف.

12- دەستەکارنیتر، 1991/3/19:

حەمە فەریق حەسەن، حەسیب قەرەداخی، ئەبدوڕەقیب یوسف، ئەبدولقادر سەرچناری، د. شێرکۆ ئەبدوڵا، هیوا قادر، ئازاد بەرزنجی.

13- رەئوف بێگەرد، 1991/11/7.

دوای کۆنگرەی راپەڕین، دەستەی کارگێڕی: شێرزاد حەسەن، جەمال غەمبار، قادر سەعید سەچناری، ئەحمەد سەلام، فوئاد محەممەد ئەمین، هیدایەت ئەبدوڵا حەیران.

**بیرخەرەوە:**

❁ دوای شکستی کۆماری کوردستان لە مەهاباد 1947، جەنگی پارتیزانی دەستیپێکرد، لەتەك چەند چەکدارێکدا، ئێوارەیەکی زستان، روومانکردە گوندی ژاراوا لە مەرگەڤەر، خودانەکەی، سەید ئەبدولواحیدبوو لە بنەماڵەی نەهری، چووینە دیوەخانەکەی، دانیشتین، کابرایەك بە ژووری دیوەخانەکەدا پیاسەی دەکرد، دەهاتوو دەچوو، سەرنجی راکێشام، تێیوردبوومەوە، ئەو تێروانینەم سەرنجی ئەویشی راکێشا، لێم هاتە پێشەوە، وتی: کاکە، پسمام، تە سەرنجی من زۆر دەدەیت، بە کێم تێدەگەیت؟ وتم: تە مەلانەجمەدینی کتومت، بەڵام ئەویش نیت، شێوەو رەفتارو وتووێژت هەروەکو ئەوە.. وتی: ئای بە قوربانی دەمت بم، تە کێیت؟ خەڵکی کوێیت؟ لێرە چ دەکەی؟.. وتم، من کەریم زەند، خەڵکی سلێمانی گەرەکی مەڵکەندیم، مەلا نەجمەدین دناسم، وتی: من کاکە برای ئەوم، ناوی خۆی نابوو میرزا عەلی.

دوایی زانیم کە ئەمە بارچاوەشی پۆلیس بووە، لەمەدیو، پیاوی لەدەست کوژراوە، هەڵاتووەو کەوتۆتە ئەم دەڤەرە.

رۆژان، رۆژگار دەژفرێت، دوای سالی 1958، هاتینەوە ئەمەدیو، چوومە دیدەنی مەلا نەجمەدین، بۆمگێڕایەوە، گەشکەداربوو، باوەشی پێدا گردم، وتی: توخودا ماوە، لە کوێیە؟ ئەوە برامە.. وتم: بەڵێ ماوە، لە گوندی ژاراوای مەرگەڤەرە، نزیکی گۆمی ئورمییە.

❁ رووژانی بێکارەیی، لای سورداش، لەسەر جۆگەی چالاغ، لەتەك سەید عەلی درەیی، باوکی ئەحمەد و مەحمودی هاوڕێم، یەکمانگرت، بەرەو گوندی حاجیتان، حاجی تەنگ، هەڵکشاین، بۆ سەر کەژەکە، ئەودیوی گوندی شەدەڵەیە، خێرا سەردەکەوتین، هەرزەکاری مێردمنداڵی ئەویش زۆر بە خێرایی سەردەکەوت، تێمانخوڕی، کوڕە بۆ وا خێرا دەڕۆیت؟، ئەویش ترساو رایکرد، شۆڕبۆوە بۆ شەدەڵە، منیش هەستمکرد، وتم کاك سەید عەلی باخێرا خۆمان بگەیەنینە

دیوەخانی شێخ یوسفی شەدەڵە، ئەگینا چەکدارمان بۆ دەردەچێ، دەڵێن ئەمانە چەتەن، تووشی گاشەیەک دەبین، ئەم کوڕە، هەواڵی بەد دەگەیەنێت، دەڵێ ئەم کێوە چەتەی پێوەیە، ئەویش پەسەندیکرد.. بە خێرایی خۆمانگەیاندە دیوەخانەکەی شێخ یوسفی شەدەڵە، ئاوایی، ئاو گوند شڵەژابوو، کەوتبوونە مقۆمقۆ، خەریکی خڕکردنەوە ی چەکداربوون هێرش بەرنە سەر چەتەکان، کە ئێمەین..

منیش سەرگوزشتەکەم بۆ بەڕێز شێخ یوسف گێڕایەوە، ئەویش وتی: وەرن کوڕینە، وا چەتەکان ئێرەن، بوو بە گاڵتە و پێکەنین.

شێخ یوسف زۆری لێکردین، کە ماوەیەک بمێنینەوە، میوانداریمانبکات، بەڵام بۆ دوای نیوەڕۆ چووینە مێرگەپان، نێوانی پیرەمەگرون، لای تووتنەوانانی شێخ تەیفورو حاجی عومەر ئەفەندی ساماغا، باوکی جەلال ساماغا، چەند شەوێ لایان میوانبووین.

بەڕاستی عومەر ئەفەندی ساماغا، پیاوێکی قۆز و ڕێکوپێکو وتەخۆش، ڕۆشنبیر، جیهاندیدە، سوودم لێوەرگرت، زۆری پێخۆشبوو لە تەکیدا بمێنمەوە.

ڕۆژان دێتو دەڕوات، لە بواری بنبڕی – نەهێشتنی نەخوێندەواری، لە فێرگەی ناوشار ئەو هەرزەکارەم دیتەوە، لە تەمەنێکی تردانە ناسیمەوە، ناوی شێخ تەیفور بوو، کارەساتوو ڕووداوەکەم بیرخستەوە، ئەویش کارگوزاربوو لە بەکرەجۆو شەرمەزاری نیشانداو بیریکەوتەوە.

❁ لە فەرمانگەی بنبڕی نەخوێندەواری کارگێڕو کارمەندبووم، کیژێك جەوان، بەگریانەوە هاتەلام، لە دەرگایدا، وتی: تۆ کاك کەریم زەندی، وتم: بەڵێ کچم.. وامزانی لەتەك مامۆستاکانیدا هەرابووە، ئاڕەوایی دەربارەکراوە، وتم: ها کچم چییە؟.. وتی من لە خانەقین هاتووم، لە خوێندنگەی پیشەسازی وەرنەگیراوم، چوومەوە خانەقین، وتیان بچۆرە لای کەریم زەند لە نەهێشتنی نەخوێندەواری، هاتووم بۆ لایتۆ..

وتم: با بڕۆین، بردم بۆ کارگێڕێتی خوێندنگەی پیشەسازی لە سلێمانی، هەموو ڕێزیان لێگرتم وەکو کۆنە مامۆستایەك، وتیان فەرموو، وتم: ئەم کیژە بۆ وەرنەگیراوە؟ وتیان ئەم کچە زێدی ئێرە نییە، خەڵکی خانەقینە.. وتم ئەم کچە، خوشکەزامە، خوشکم لە خانەقین شوی کردووە، خاڵی ئەوم.. بەخێوکەریم، بڕوام پێهێنان.. دەستەبەریبووم بە 100 دینار، شەوانەم بۆ سازکرد، هێنامەوە فەرمانگە، لای ئافرەتەکان.

پێش بەربوون، هەڤاڵ زاواکەی، بەهەڵەداوان هاتوو، سوپاسیکردەو بردیە لای خۆی.

ئەمەش، دەرئەنجامی ئەوەبوو، ماوەیەك لە خانەقین مامۆستابووم، ئەو خێزانەم خۆشنوودکرد. ساڵی دوایی بۆم گواستنەوە بۆ باقووبە.

❃ لە ماوەت، قەشان، کارگێڕو مامۆستابووم، زۆربەی پاش نیوەڕوان دەهاتینە چۆمی قەشان بۆ مەلەکردن.

چۆمی قەشان لکی ڕۆباری زێیە، لای پردەکەیەوە، کیژێکی تێدابوو، خۆمڵێدا نوقمی کردم، قژی سەرم وەکو گوڵوڵەبەن، بەسەر ئاوەکەوە، دیاربوو، هاوڕێیەکانم، مەلەیان باشتر دەزانی، شێخ موحەمەد شێخ حسێن بەرزنجی ع.ح.ب، جەلال شاکیر، ڕزگاریانکردم.

پەند:

چ نهێنییەك هەیە؟ بۆ پەی پێنابەین؟ گروپی خاوەن بیرو ڕۆشنبیر و هوزانڤانو وێژەوانی ئەم میللەتە، دەربەدەری هەندەرانن، لە ئاوارەییدا، لە دووروڵات ، بە نەداری، بە کەساسی، سەر دەنێنەوە، دەبێ نهێنییەك هەبێت، تاکو ئیستەکەش ئەم گرێکوێرەیە، نەکراوەتەوە، بۆ ئاوارەدەبن؟ دەبێ حاجی قادر کۆیی، ئێسکوداری، ئەسپەردەی ئەسکودار بێت لە ئەستانبوڵ، لە گۆڕستانی ئەبانەیوبی ئەنساری، سەر بنێت بەلای سیاسەتگەوە، نزیکی نالی – ناڵی هۆزانڤانی

مەزنى كورد، نالى مرۆڤ لە ژێر خاكدا هاوسێى هەمیشەیی بن؟ لە ئاوارەییدا، بێكەسو بێدەر؟

بۆ؟ داماو حسێن حوزنى موكریانى لە رەواندوز، خاوەنى مەزرگەى زارى كرمانجى بە تاوانى دزێتى گوریسوپەتێك لە دادگا 3 مانگ فەرمانى بەسەرابدرێت؟. گوشارى بۆ بەرن، داواى وڵاتنامەى لێبكەن، رەوانەى ئەودیو سنوورى بكەن.. ئەویش بە ناچارى پەنا بۆ زانا تۆفیق وەهبى بەرێت، لە گۆڤارى دەنگى گێتى تازە ببێت بە كارمەند مانگى بە 10 دینار.. كە مرد، شارەوانى تەرمى لە جاو بگرێتو كفنى بۆ بكات، بە ئاخ بسپێرێت؟

بۆ؟ ئەمین فەیزى، لە پەككەوتەخانە، خەڵوەتگەى پیران، لە ئەستانبوڵ، بە نەدارى، بە بێكەسى، گیان بسپێرێت؟

بۆ؟، زانا وەهبى تۆفیق لە لەندەن، كۆچیدوایی بكات، راسپێرێ تەرمەكەى بێتەوە زێدێ، پاڵبدا بە گۆڕى پیرەمەگروونەوە؟

بۆ؟، ئەفسەرى خەباتگێرو پایە بڵند، عیزەت ئەبدولعەزیز تاكو ئەكرا بەسێدارەدا، هەر ناوى نۆكەریو ناپاكیو زێرەڤانى جاسوسى بەدواوە بێت؟

بۆ؟ حاجى تۆفیق پیرەمێرد، 1867-1950، پیاوى بێگانەیی، تاكو كۆچى، دواى مردنى پەیكەرى بۆ بكرێت؟

بۆ؟ قانع، 1898 – 1965، پەنا ببات بۆ كارگەرى لە دەربەندیخان، كاتێ كەریم زەند ئەفسەرى پەیوەندیبوو لەوێ، فریاى بكەوێت، بە پسووڵەیەك كە تێیدا نووسیبووى: یا كەریمى كارساز مەدەدێ.. ئەویش فریاى بكەوێت لاى ئەندازیارى جێگر كۆلۆنێل گریفس، كۆلۆنێل فانس، مسیو بۆتۆفۆس، كارگێرى گشتى كۆمپانیاى سەنرلبتوبرس، فەرەنسى، كۆلۆنێل كریفس، یاوەرى سەركۆمارى ئەمریكى، ئایزنهاونەر، قانع وا پێشكەشكرا كە شكسپیرى كوردە.. بە سەرسامییەوە، وتیان: ئوە، منیش وتم: باوەڕم پێبكەن، بە ئینگلیزى پێم وتن.. ئەوانیش وتیان، خۆت دەزانى، كردمان بە سەرۆكى پاسەوانان، پێم راگەیاندن، كە ئەمە قانعە.. بە ئارەزووى خۆى دێتو دەڕوات، كارناكات، ئاوى بۆ بهێنن، چایى بۆ

لێبنێن.. ماوەیەك مابەوە، لە سەرماوەزەوە تاكو بەهار خۆروبان گەرمبوو، چونكە رەفتار دەروێشیبوو، كنترت بخستایە لووتی بەند نەئەبوو، دانەدەنیشت..

هاتەلام وتی: كەریم، فنیشمكە، بەڵكو نۆتیس وەربگرم، واتە 7 رۆژ پێتری، منیش وتم ئەمە كەڵكی كاركردنی نییە بابڕوات، 7 رۆژ پترییەكەی وەرگرتو بە مووچەكەیەوە. ئیتر نەمدییەوە تاكو دوای شۆڕشی گەلاوێژی 1958.. كرام بە كارگێری خوێندنگەی پیرەمەگرون.. هاتەوە لام، داوای ئەلفبایەكی كوردی پۆلی یەكەمی سەرەتایی كرد، منیش دامێ، رۆژی دوایی هاتەوە، نوسراوەكەی رەشید یاسمی، مێژووی ئەزادو یەیوەستەگی لە باخەڵ دەرهێنا، وتی: كەریم: ئەم هاوكارییە بكەین، وەریگێڕینە سەر زمانی كوردی، نووسراوەكە فارسیبوو، وتی تۆ لاوی، چاپی بكە، ناوم بهێنە.

دەستمان پێكرد، چەند مامۆستایەكی خۆشنووسم هێنا، 3 روونووسمان بەدەست نووسییەوە، یەكێكیان لای من، ئەویتر خۆی خستیە باخەڵیو بردی، لە جیابوونەوەمدا وتی: كەریم: دەستم دامێنت خۆت مەخەرە ناو هیچ بەرموورەزمێكەوە..

هەرا بەرپابوو، لە دەربەند بازیانو دەربەندخانەوە، كە لایەرەیەكی تری مێژووە، بەڵام ئەم نووسراوە چاپبكە.. بە سەریا دستبەسەركرام، 6 ساڵ بە مووچەیەكی كەم لە كەناری خوارووی زۆنگاوەكانی باشووری میزۆپۆتامیا.. دوای هاتنەوەم.. لە ژێر زەوی دەستنووسەكەم دەرهێنا، نووسیمەوە دووبارە، لە چاپمدا، د. عیزەدین مستەفا یارمەتیدام لە چاودێری رزگاریكرد.

ڤانع، لە برسا، رووەكاتە شلێروناوخوان، لە گوندی لەنگەدێ بەخاك سپێردرا. ئەو نیشتمانە دایكەی خۆیو روونووسەكەی بە لێفە شرەكەیەوە، لە دووتوێی خۆیگرتو گڵ شاردییەوە، ئەو كوردستانە كە خۆی واتە ڤانع سنووری دیاردەكردبوو بە هەڵبەست.

خاوەنی گوند، ئەحمەد مینەرمندان، ئەرکی ئاشتنی گرتبوە ئەستۆ، تاکو لە خەوابگەو ئارامگەکەیدا ئارامبگرێت بە یەکجاری جاویدی. هەڵبەستەکەی دێنینەوەیاد.

زەمانێکی فراوانە دەنۆشم شەربەتی تاڵی
دەروونم پڕ لە ئەشعارە و لە ترسا دەفتەرم خاڵی

ئەمانە لە بیرەوەرییەکەیدا، ئاماژەم بۆ کردووە.. دەبێ رەفتارو ئەریتو یاسای ئەم جیهانە، ئەم گێتییە بێنەمەکی تێدابێت.

پێغەمبەر عیسای یەسوع، د.خ، لە کاتی بەندییدا لە زیندانی چەرخی بیلاتۆسدا.. بەرئەباسی، پیاوکوژ، چەقۆکێش، دز، لەتەکیدا بەندکرابوو، بەپێی رەفتاری ئەرستوکراتییەتی چەرخ، لە جەژنەکاندا، لە بۆنەکاندا، بەند ئازاد دەکرا، داواکرا لە جەماوەر، کێ بەربدرێت؟ هەموو هاواریانکرد، بەرئەباس !!، ئەو پیغەمبەرە، ئەو رابەرە، پێیان رەوانەدی کە ئازاد بکرێت لەو جەژنەدا، دەبێ سروشتی چەرخی چەپگەردی رۆژگار، وەهابێت؟

کریستۆف کۆڵۆمب، ئەمەریکا بدۆزێتەوە، لە 1492 بەر لە ئەو لە 1000ز، لیف ئەرکۆن، دۆزیبیەوە، گەشتی کۆڵۆمبۆ، 72 رۆژی خایاند، لە نێوانی شینایی ئاسمانو شینایی دەریادا، ئەم مرۆڤە مەزنە، رۆژانی دوایی ژیانی بە هەژاری، بە نەداری، بە نەخۆشی، بە کەساسی، لە زیندان بەسەربرد و بە داخو پەژارەوە سەری نایەوە.

د. ئەحمەد سۆکارنۆ، لەسەر نەخشەی جیهان، ناوی ئەندەنووسیای نەخشاند، کەچی لە زیندانیدا، سەرینایەو کۆچیکرد.

هۆی چیبێت؟ نەخشەکێشێ لە نەبوومەوە، ئەندەنووسیا بهێنێتەبوون، ئەمەش ئاکامو ئەنجامی بێت؟

وردی محەممەد تۆفیق – کۆڵان، 1924 – 1976، هەموو ژیانی نەهاتیبوو، پاداشتی ئەو هەموو لێبوردنەی، نائومێد، لە خێزانو جیابوونەوەی ناڕەوا، بێبەهرە لە ژنی دووەم، جەنگو ئاژاوە، لە ژنی سێیەم، وێڕای نەداریو ئاڵۆزی ژیانو چەرخی چەپگەردی ناهەموار، درشتی ئەگەرچی خۆی وردیبوو، چەرخو رۆژگار لەتەکیدا درشتبوو، ئەمەش نموونەیەکیترە لە بەسەرهاتوو رەنگدانەوەی رووداوی بەدبەختی کە رووانەتی کۆڵیو بێبەشیو چەوساوەیی میللەتی ستەمدیدەیە.

## نەجمەدین مەلا – 1888 – 1962:

گەنجینەو کۆکەرەوەی رۆژنامەو گۆڤارو وێنەی دێروکو مێژوویی، دەستنووسی کۆن، خاوەنی نامەخانەو نووسراوەکانی مێژووناس، داماو حسێن حوزنی موکریانی، کارکێڕی خوێندنگەی کەشتی نوح.

خوێندکاری ناوەندی بووین، ئەو نووسراوانەمان لێدەکڕی، مەڵبەندی رۆشنبیری ئێمەی لاوبوو، لە رۆژانی دوایی ژیانیدا ویستی بیبەخشێ بە پارێزەر ئەحمەد زرنگ وەچەی پیرەمێرد.. لەتەك مامۆستا ئەبدوڵا زێباری چووینەلای پێمانوت: بیبەخشە بە نامەخانەی گشتی، ناوت دەمێنێ، مەیبەخشە بەکەس.

کاتێ کە پارتی دیموکراتی کوردستان، فەرمانوسیلەی وەرگرت، کاك ئوسمان سەعید، بە ناوی پارتییەوە دەچنەلای، ئەویش هەندێکی پێبەخشین، ئەوی‌تری دوای مردنی، 3 رۆژ تەرمەکەی لە ژوورەوەبوو، پشیلەکەی دەمووچاوی کرانبۆوە، نووسراوە شرەکانی، رۆژنامەو کۆڤارەکان، لە دالانی دادگای یاسایی، هەراجکرا..

خۆی دەیوت: ئێمە زیندوکوژی مردوو پەرستین.. لە ژیانی خۆیدا، بەردەباران دەکرا، گاڵتەجاڕی هەرزەو ئەزانو منداڵە وردکەبوو، دەرگا تەنەکەکەی وەکو شەستیر دەدرایە بەربەرد.. بەرانبەری گەرماوی مفتی‌بوو لە سابوونکەران، خانووی لەعلی خانم.. کەسێ نەدەچوو پێی‌بڵێ، مامۆستا با زەمێ نانت بۆ بێنم، یاخود کراسەکەی بۆ بشۆن..

شەوێك ئوستانداری سلێمانی عومەر عەلی دەچێتە خوێندنگەکەی، ئەڵێ: کوڕە تۆ چیت؟.. دەڵێ: من پزیشکم.. ئەویش نازانێ پزیشك چییە، دەڵێ: کوڕە پزیشك چییە؟.. دەڵێ: دوکتۆرم.. دەڵێ: دوکتۆری چی؟ دەڵێ دوکتۆری چاوم، کوێر چاکدەکەمەوە.. دەڵێ: کوا ئامێرو کەرەسەت؟ ئەویش فێرخوازێ هەڵدەسێنێ، نانەوا دەبێت، دەڵێ: بنووسە، لەواشەی گەرم... خوێندکارێکیتر هەڵدەستێنێ، دەڵێ: بنووسە کەبابی گەرم.. کە ئەویش کەبابکارە.. ئەمە لە رووی پیشەییەوە، بۆ فێرکردنی گەورە.. رەوانناسی، سایکۆلۆژی، بە کارکردنو رەفتار، شۆڕەسوارو پسپۆر و بلیمەتی ئەو گۆڕەپانەبووە، بۆ؟ دەبێ بەردەبارانبکرێت؟

رایسپارد کە تەرمەکەی، لە کێوی ئەزمەڕ، ئەزمیرە بنێژن، بە هەڵپەڕکێو ئاهەنگ.

## مەلا کاکە حەمە سەیفوڵا:

خۆیتەرخانکرد بۆ رازەی میللی فێرکردنی منداڵانی دێهات، وازی لە کەسوکارو خوێش و خێزان هێنا، چووە سەنگاو، قەراخ، کە خۆی دادوەربوو، کاتی خۆی لەوێ خوێندنگەی لە گوندەکان دەکردەوە، هەتاکو کۆچی نەهاتەوە شار.. ئەمەیە مەزنی، ئەمەیە گەورەیی، ئەمەیە مامۆستای نەمر، لە بواری بنبڕی نەخوێندەواریدا.

## ئاغای ئەقدەسی:

بەیانییەکی زوو بەر لەوەی بچمە فەرمانگە، پێیانڕاگەیاندم کە ئێوە نووسەرانن؟ وتم: بەڵێ.. ئەو کاتە سەرۆکی لقی نووسەرانبووم.. وتیان: ئاغای ئەقدەسی مەریوانی تەرمەکەی لە مزگەوتی ئەبوبەکری سدیقە، گەڕەکی مەجید بەگ.. لەسەر سکۆکە دانرابوو بە بێکەسی.

ئەقدەسی ئەبدوڵا مەریوانی، پەنابەرو لێقەوماو، هۆنەر، لە کاتی خۆیدا کارگێڕی شارەوانی مەریوان بووە، رێزی لە کوردی ئەمدیو گرتووە و میوانداری کردوون..

منیش خێرا خۆم گەیاندە مزگەوتەکە، ئەوەی کە پێداویست بوو، بۆیکرا، بە پەرۆشەوە بە دوای تەرمەکەیەوە، بردمان بەرەو سەیوان، بەخاك سپێردرا.. وتارمدا لە سەر گۆڕەکەی.. سەرنجمدا خۆفرۆشێك لە تەنیشتمەوە، خرەخڕی تۆمار دێ لە بنباخەڵیدا.. وریا بوومەوە، زمانم گۆڕی، وتم: شەرمەزار نییە، سەیوان کە تۆی لە ئامێز گرتووە، چونکە سەیوان ، پشتیوانی مەریوانەو سەنگەری کوردی ئەودیوە، سەیوان شانازیت پێوە دەکات، کە تۆ، ئاغای ئەقدەسی میوانی بیت.

پرسەمان بۆ دانا، بە گیرفانی نووسەران، ویستیان ئەو مەزاختنەمان بدەنەوە، سوپاسیانکردین، ئێمەش وەرمان نەگرت، چونکە ئەرکی خۆمانەو برای ئێمەبوو.

## مارف چیاوک:

سەرۆکی یانەی سەرکەوتنی کوردان بوو لە بەغداد، سەرۆکی دادگای باڵابوو لە چلەکاندا 1945، کرا بە ئوستانداری سلێمانی، نێوانی تێکچوو لەتەك تۆفیق قەزازو شێخ قادر حەفید، گوشاری بۆ هێنان، بە پۆلیس دیواری خانووەکەی شێخ قادر حەفیدی تێکدا، بە بیانوی ئەوەی کە سیلەو مۆڵەتی وەرنەگرتووە، سەریدا لە خوێندنگەی فەیسەڵییە، منیش مامۆستابووم لە 1944، داوای لێکردم کە ببمە فێرکاری تایبەتی منداڵەکانی، یەکێکیان ناوی باران بوو، منیش نەمکرد..

ئەم مرۆڤە کەللە رەقە، بە دەمارە، هەڵچوونو هەڵەشەیی هەبوو، بەڵام، دەست پاکوو داوێن پاکو خاوێن و دڵسۆزبوو، کە مرد، خاوەنی جاوی تەرمەکەی نەبوو، کە پێی بشارنەوە، سەربازی گومناو، کوردپەروەر، خاوەنی نووسراوەی بارزانی ستەمدیدە، مەزلومە.

## مێژووی نەتی خاوەری میانە:

کورد لە وشەی کارەوە هاتووە، واتە کاری، وەکو: دەردی کاری، ئازا، کاریگەری، هەورەها گۆتی، گۆتیام، زەوی جەنگاوەران، لە نووسینی ئاشووریدا، بینراوە، ماد، واتە میدیوم، ناوەند، ناڤەند.. پارس، پەراسوو، کەنار، ماد، مید، لە ناوەندا بووە، بەپێی نەخشەی جوگرافی سەردەم..

پارس – فارس، لە کەناردا بوون.

یۆنان، - گریك، بە کوردستانیان وتووە، کوردوئان، هەر لە کۆنەوە، زەوی کوردستان مەیدانی جەنگو لەشکرکەشی بووە لە نێوانی شاهەنشاهێتی فارسو ئوسمانی بە تایبەتی، دوای نەمانی مید، دەستەڵاتو فەرمانڕەوایی کورد نەما و کشایەوە.

هاخامەنشی هاتنە سەرکار، یەکەمجار ئوسمانی بە سەرکردەی سوڵتان یاوز سەلیم، پۆستاڵی سەربازی ئوسمانی، پێیان خستە سەر زەویو ئاخی کوردستان، لە جەنگی چاڵدێراندا، 1513، میرنیشینی بتلیس لاوازی تێکەوت، مەلا ئیدریس

بتلیسی، هاوکاری ئوسمانیکرد.. کورد، دەستەڵاتی رامیاری نەمان، لە پەلوپۆکەوت، کشایەوە پاشەکشێیکرد، کوردستان پەرتکرا بە 2 هەرێمەوە، لە نێوانی ئوسمانیو ئێراندا، لە چەرخی شائەباسی سەفەویو سوڵتان مورادا، هەروەها شائیسماعیل سەفەویو سوڵتانی ئوسمانی موراد، لە سەدەی 16 ئەو پەرتکردنە، لە زنجیرە چیای ئاراراتەوە، تاکو کەنداو کە هەرێمیخاوەرە، ئەمکەرتەی بۆ ئێران... خۆراواشی بۆ ئوسمانی، تاکو 1917، هێرشی ئینگلیز بۆ سەر ئێراق لە کەنداوەوە بە سەرکردەی ژەنراڵ تاوسند، کە لە جەنگی شاری کوتدا بەدیل گیرا...

هێرشی دووەم، بەهێزتر، بە سەرکردەی ژەنراڵ مۆد، بەغدادی گرت، بە ناوی رزگارکەرەوە، گرتنی ولایەتی مووسڵ بەهۆی ئاگربەستەوە، کێشەی مووسڵ، دوای پەیمانی سایکسبیکۆ، دابەشکردنی موڵکەکانی ئوسمانی، پیاوە نەخۆشەکە..

ئەسکەندەروونە، درا بە تورکیە لەبری ولایەتی موسڵ، لکاندنی هەرێمی مووسڵ بە ئێراقەوە، کە بریتیە لە ئوستانی مووسڵ، هەولێر، کەرکوو، سلێمانی، تاکو خانەقین و مەندەلی.. هەرهەمووی خرایە سەر فەرمانڕەوایی عێراق.

گۆڕینی پەیمانی سیڤەر، ئاب 1920، بە پەیمانی لۆزان 1923، بەندەکانی سیڤەر، 62، 63، 64... کپبوونەوەی کێشەی کورد، کوژاندنەوەی شۆڕشی شێخ سەعید 1925، خنکاندنی سەرکردەکانی، شێخ سەعیدو د. فوئاد، شێخ ئەبدولقادر ئەفەری، پێکهاتنو دروستبوونی تورکیای کەمالی، ئەمە لە تورکیاو بەستنی پەیمانی سەعداباد 1937.

تەختی ئێران، لە مێژووی هاخامەنشییەوە، تاکو ئیستەکە تەهرانی پێتەخت، پێشبڕکێبووە، لە نێوانی گەلی فارسو کوردو ئازەریدا، بۆ کۆنترۆڵو دەستبەسەراگرتنی.. هەر ماوەیەك، دەوستەڵات بەدەست لایەکیانەوەبووە..

کەریم خانی زەند، 33 ساڵ فەرمانڕەوا و شاهەنشای ئێران بوو، نوێنەری میللەت بوو، خۆی ناو نەنا شاهەنشا، دیموکراتیو ئەوازشو دادپەروەربوو.. دوای زەند، قاجاری فەرمانڕەوابوون، ئازەری بوون تاکو 1908، کودەتاو گەردشی رەزشای پەهلەوی، گەڕانەوەی دەستەڵات بۆ گەلی فارس، گۆڕینی ناوی

شاهەنشاهێتی فارس بە ئێران، ئاریایی لە عێراق، شۆڕشی 14 گەلاوێژ 1958، بەر لەوەش هەموو راپەڕینەکانو بەسەرهات، هێزی کورد، بە نهێنی بەشداربووە، بەڵام کاتی بەرهەم، کاتی خەرمان، کورد بێبەشبووە.

ئەمانەو زۆریتر، بەڵگەی ئەوەن کە مێژووی نهێنی هەر هەموو خاوەری میانە، هێزو پەلاماری گەلی کوردی ستەمدیدەی بەشخوراوە.

کورد لە چێوەو ستراتیژیەتی دەوڵەتاندا بۆ راگرتنی لەنگەر، هاوسەنگی، هەر گۆڕانکارییەك لە دەڤەرەکەدا، بە گەلی کوردەوە، ئەگەر تەبایو گونجاوی پەیدابووبێ لەتەك بەرژەوەندی ئەو ئەخشەو ستراتیژییەدا، بەو پێودانە، بەو پێوەرە، کێشەی کورد هاتۆتە پێشەوە، بۆتە کێشەیەکی نێونەتەوەیی، بەپێی چەرخو شوێن بە پێی رۆژگار، ئەو رۆژگارو دەرفەتە دروستنابێ، پێکنایەت، تاکو گۆڕانکارییەك پەیدا نەبێت لە کێشەی کوردا.

2 لایەنە، کێشەی کورد لەسەر 2 لاقە، یەکیەکتری دێنێتە ئاراوە، لە 1991، جەنگی کەنداو بەرژەوەندی ئابووری، زێرخانی پەتەو بۆ باڵاخانە، کێشەی کورد تا رادەیەك هاتە پێشەوە تا رادەیەك بوو بەکێشەیەکی نێودەوڵەتی، ئەگەرچی دەوڵەتانی هاوسێ، ئەوانەی کوردیان لە ناودایە، وەکو ئێرانو تورکیە و سورییە.

ئەوانیتریش، سعودیو کوێت، دەوڵەتە میرنشینەکانی کەنداو هەریەکەیان، پارسەنگی خۆی هەیە، سەنگێکە لە شایەنەو تای تەرازوودا بۆ هاوسەنگیو لەنگەر راگرتن، پارسەنگ بۆ سەقامگیری ستراتیژی خاوەری میانە، ئاڤەند، لە ئەخشە گشتییەکەدا، کە رامیاری باڵا و بەرژەوەندی بنچینەیی هێزە گەورەکانی جیهانی، ماسۆنیەتی، ئاراستەکردنی نهێنی، ئەو دەوڵەتە زلهێزانە، دەوڵەتانی سێبەر، دۆستە هەمیشەییەکانیان، رەنگڕێژی گشتی و تایبەتی بەرژەوەندی هەمیشەیی لە تاکتیکی رۆژانەداو ستراتیژیەتی گشتی، بۆ ماوەی دوورو نزیك.

میللەتی کوردیش لەو بازنەیەدا سەنگی خۆی هەیە، نموونە بۆ ئەمە، هاتنی ژەنراڵی رووسی لە 1943 بۆ شارۆچکەی سەردەشت، کاتی جەنگی دووەمی

جیهانی، ئەو سەردەمەی کە فەرمانڕەوایی شێخ لەتیف حەفیدو دادوەر و جێگرو بریکار حاجی مەلا ئەسعەد مەحوی، لە ڕۆژانی دوایی کۆمەڵەی برایەتی.

وتەی ئەو ژەنراڵە کە درکانی، کە کورد هێشتا نەخراوەتە پرۆگرامو نەخشەی کارو بەرنامەوە، مەگەر جەنگی 3، ئەو جەنگەی کە نابێت، جەنگی سارد، جەنگی پێشبڕکێی چەك دەبێت.. خۆتان هەڵگرن بۆ دەرفەتێکیتر..

نموونەیەکیتر، هاتنی نماینەدەی ئەمریکی لەسەر ئاستو بارستایی بەرز بۆ مەهاباد، 1946، لە ژیانی کۆماری کوردستاندا، روون نەکردنەوەی کێشەی کورد بۆ ئەو نماینەدانە لە لایەن سەرانی کوردەوە.

خۆم چوومە خزمەت پێشەوا قازی محەمەد، دوای من کاك میرحاج چووەلای کە ببین بە یاوەریان، زمانزان بە ئینگلیزی لەتەکیاندا بین.. پێشەوا فەرمووی: با دەستوور وەربگرم، لە رووسەکان.. ئەوە پێکنەهات، کاك سدیق حەیدەری، بەرپرسی راگەیاند، کرا بە یاوەریان.

جرابەرقو چاپخانەکەیان دی، بێنەوەی زانیارییەکی وایان بدەنێ، دەربارەی کێشەکە... ئەوانیش وێنەی ستالین ئاودامان، تابلۆی چەکوشو داس بە گەورەیی. هیچ گومانان نەما کە ئەمە پارچەیەکە لە مۆسکۆ.. بەڵکو مۆسکۆی دووەمە.

مایۆر جەلال ئەمین بەگم دی و پرسی، بارودۆخ چۆنە؟ وتم: مانگێکیتر بەردەوام نابێ کۆمارەکەمان.

**نەوت:**

چەکی کاریگەر، بگرە داگیرکەرە، سوورو رۆڵی خۆی هەیە لە کێشەکەدا، لەم جەنگو ململانێیەدا..

نەوت، کوردستانی باشور - ولایەتی مووسڵی لکان بە میری عێراقەوە.

کەنداو دڵی جیهانە، چەقی گرنگی گێتییە، جیۆپۆلیتیك، رامیاری جوگرافیا، سوورە لەسەری.

جوگرافیای رامیاری وەکو زانیارییەکی بەهادار، رامیاری جوگرافیاش، جیۆپۆلیتیك، بایەخێکی هێجگار زۆری هەیە.

لە کۆندا، کاپکاس، بیرە نەوتەکانی، دڵی جیهانو ناوەندیبووە، هەنوکە کەنداو، کە کانگای نەوتو چەقو ناڤەندی هاتوچۆیە، دڵی گێتییە، ناڤەندو سەنتەری هەرهەموو جیهانە.

ملانێ لەسەر کەنداوە بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی، فەرمانڕەوایی بەسەر کەنداودا فەرمانڕەواییە بەسەر هەر هەموو جیهاندا.

ئەمە ئامانجی دەوڵەتە زلهێزەکانە.. سەرمایەداران بەتایبەتی.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی، جەنگی سارد، جەنگی پێشبڕکێی چەك، ئەو جەنگە درێژخایانە کە ئۆردوگای سۆسیالیستی و هێزی تێدا شکستی هێنا.

بەڵام ئایە، بەرەی دەوڵەتانی سەرمایەداری تاکەی دەتوانێ قورسایی هەموو گێتی و کێشەی نەتەوایەتی گشتی هەڵبگرێت، لە کۆڵینی، ئەو رەنگرێژییەی کە سۆڤیەت کێشابووی بە ناوی گلاسنۆسو پرۆسترویکا، کراوەیی، بنیادنانی ئابووری دروستکردنەوە؟

ئایا دەوڵەتە سەرمایەدارەکان، بە سەرۆکایەتی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا، دەتوانێ ئەم ئەرکە مەزنە گرنگە بەدیبهێنێ؟ تا چ رادەیەك ئەم بارە قورسە دەتوانێ هەڵبگرێ؟

ئەم دۆزانە، ئایندە ئاشکرای دەکات، پەردە لەسەر کارەسات لادەدات، هەر ئایندەش دەستەبەرە، زەمینەی رووداو، خۆی سەر هەڵدەدات.

## بەرژەوەندی گشتی هەمیشەیی:

کێشەی گەلی کوردو ستراتیژییەتی خەباتی، دوای لەکیسچوونی دەستەڵاتی رامیاریو کشانەوەی لە گۆڕەپانی رامیاریو لەسەر شانۆ، لە کەوتنی شاهەنشاهێتی میدەوە، هاتنی هاخامەنشی تەختی ئێران، ملانێی گەلی کوردو ئازەریو فارس بووە، هەر دەمەی یەکێکیان خاوەنی دەستەڵاتبووە، گەلی کورد، لە تەقەلاو کۆشش نەکەوتووەو لە پێناوی رزگاریدا.

خاکی کوردستان مەیدانی جەنگو لەشکرکەشیو جێگەی ملانێیبووە، لە چەرخی ئوسمانیو سەفەوییەوە تاکو بەرپابوونی جەنگی یەکەمی جیهانی.

پەیمانی سایکسبیکۆ، پەرتکردنی کوردستان، دابەشکردنی موڵکەکانی ئوسمانی، پیاوە نەخۆشەکە.

پەیمانی سیڤەر 1920، گۆڕینی بە پەیمانی لۆزان 1923.. ئەم دۆزە لە چێوەی نێودەوڵەتیدا، دێتو دەچێت، لە هەڵچوونو داچووندایە، لە بەرپابوونو خەفەو کپبوونەوەدایە، لە تایتەرازووی لەنگەرو هاوسەنگی دەوڵەتاندا.. شۆڕشی شێخ سەعید پیرانو ژەنراڵ ئیحسان نوری، سمایلخانی شکاکو شۆڕشەکانی شێخ مەحمود حەفیدی نەمر، لە 1925 – 1931، شۆڕشی بارزان 1933، 1943، 1945، کۆماری کوردستان لە مەهاباد 1946، شۆڕشی ئەیلول 1961، بەیانی ئادار 1970، شکستوهەرەسی بزافی کورد، پەیمانی جەزائر، کۆڵی ئامادەکراو.

ئەمانە هەرهەموو، نموونەی زەقو ئاشکرایە، کە هەمیشە ئەم دۆزە، ئەم کێشەیە، کارتی کارە، بۆ مەبەستی گشتی دەوڵەتان بەکارهێنراوە، سووتەمەنیو جیلکەوچەوێڵی ئاگر خۆشکەری بەرژەوەندی گشتی دەوڵەتە مەزنەکانبووە، لە بازنەی 2 لایەنیدا، لە نێوانی 2 هێزی زەبەلاحدا، هەریەکە بە مەبەستی تایبەتی خۆی، لە ناو ئەم 2 لایەنییەدا، کێشەکە ونبووە، بێسەروشوێن، ماوەتەوە..

هەنووکە رامیاری یەک لایەنییە، دوای بردنەوەی جەنگی سارد و شکستی سۆڤییەت.

بارودۆخی نوێ، دوای کۆتایی پێهێنانی ئەرکی پاسەوانێتی، ئەرکی پۆلیسی کەنداو، لابردنی شاهی ئێران، هاتنی کۆماری ئیسلامی بە رابەرێتی ئایەتوڵاخومێنی، هێڵی بەرگری ئێران نەما، قورسایی کەوتە سەر تورکیە، کە درێژەی ئەوروپایەو لەتەك بازاڕی یەکیەتی ئەوروپا، نێوان پەیدا دەکات.

کورد، لەم نزیکبوونەوەیە، دەکەوێتە سەر سنووری ئەوروپاو شوێنی ستراتیجی، زۆرینەی مۆنات، هێزی مەردووم، ئەم فاکتەرانە لە لایەکو، لە لایەکیترەوە، بنەما کزو لاوازیە ئابوورییەکەی تورکیە، لەیەکدانی 2 پارچەی کوردستان، ئەمانە هۆی لاسەنگین، کە گۆڕانکاری ستراتیژی خەباتی گەلە.

کامپی سەرمایەداری، دوای کەوتنی شاهەنشاهێتی ئەفغان، لاچوونی زاهیرشا دەرئەنجامی کودەتاو گەردشی کۆمەڵەی گەل، هاتنی نورمدین تەراکی، بەدوایدا، نەجیبوڵا، ئەم گۆڕانکارییە، لە لەنگەری تەرازووی هاوسەنگی نێودەوڵەتی، دابڕا.

سەرمایەداری کەوتە خۆی بۆ دروستکردنی پشتێنەی ئیسلامی بە دەوری سۆڤییەتدا... کۆماری ئیسلامی هاتەکایەوە بۆ بەگژاچوونی ئایدۆلۆژی مارکسیو کۆمۆنیستی کە 60 ملیۆن پتر ئیسلام لە 6 کۆماری ئیسلامیدا لە سۆڤییەت، دوای شکستی لە جەنگی ساردا، ئەو مەترسییە نەما..

ئیمرۆ، لەنگەرو هاوسەنگی دەوڵەتان گۆڕاوە، لەیەك لاییدا دەبینرێت. ئەم بارودۆخە، دیبلۆماسییەتی گۆڕیوە.. کێشەو دۆزو ستراتیژییەتی خەباتی گەلی کوردیشی گۆڕیوە، لەو بازنەیەدا، کە رووالەتێکی تری داوەتێ.

## رامیاری – پۆلیتیك:

رامیاری، باروبرایی نییە، واروەرگر براوەیە، قورمارکەر دۆڕاوە..
کەسێ رەنجخۆرەو من سزا لۆشم لە ناوتانا.. موور دەسووتێ، کوانوو گڕی پێخۆشە لە ناومانا.

لە عەرەبییەوە وەرگێڕاوە

مرۆڤ لەو هاوکێشەیەدا، کە جەمسەرێکی چەرخەو جەمسەرەکەیتری زەوییە، لەتەك هەڵچوونو داچوونو بەرگریو پەیڕەوی ژینگەدا، سەوداو مامەڵە دەکات، لە بوونو بوومەوە.

کاری رامیاریش، بەشێکی گرنگە لەم سەوداو مامەڵەیەدا، کە بارو لایەنی ئابووری ژێرخانو بنچینەو بنەڕەتە، لەم کێشە سەرەکییەدا.

ژیانی رامیاریم لە 1937، سەرهەڵئەدات لە کۆمەڵەی برایەتیدا کە بە کردگار، ئەندامی کاراو نیمچە زاگرێبووم، چونکە ئەو سەردەمە، ئەم زاراوانەی کە ئێستەکە هەیە، ئەو کاتە نەبوو.

لە ئەنجامی کارکردنما لەو بوارەدا، تووشی گەلێ جورتەو گاشەو گۆڵەمز بووم، لەوانە:

- دوای کەوتنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، لانەوازی زۆری بۆ هێنام، شەوانە تەنها بۆ نووستن پەنامبردە بەر بەڕێز حسێن بەگ جاف، بەهۆی ئەوەی مامۆستای حەسەن بەگی کوڕی بووم، خۆشی خانەدان، خاوەنی دیوەخان بوو، رێزی لێئەگرتم، شەوانە لەسەربانەکەیان دەنووستم.. لە ئەنجامی ئەو ئەزموونو کارامەییەی، کە لە کۆماری کوردستان، سوودم لێوەرگرتبوو، سەرەڕای راسپێری سەرکردایەتی بەرزو ئامۆژگاری.. سەرکردایەتی سوپاییو رامیاری سۆڤیەتی، راپۆرتێکم پێشکەشی برا کۆمۆنیستەکانکرد، کە گەرمکە بە ناوی نەتەوایەتیو ناسیۆنالیستو کوردایەتییەوە، کاربکەن، ئەگەرچی کاری پێنەرکرا، بە دوژمنکاری شکایەوە بەسەرمدا، برای هاوسەنگەرو هاوڕێی تێکۆشانو

خەبات لێمبوون بە دوژمن، چەند کەسێك لە ناو لیژنەی ناوچەی ئەو سەردەمە، ئەحمەد غەفورو عومەر عارف قاپڕەش، کە جیهانیان بەجێهێشتووە، فەرمانیاندابوو کە فڕێمبدەنە خوارەوە لە سەربانەکە... خانەخوێیەکەشم، ئەو کارە نارەوایەی پەسند نەکرد.

- دوای 1958، لە ئێران جموجۆڵێ هەبوو، شێخ نەسرەدین لە بنەماڵەی شێخانی بیارە، بە فەرمانی دەزگای ساڤاکی سنە، هاتبووە لای بەڕێز حەمە رەشید خان وئەو داروخان... ژەنراڵ بەختیاری، دەیویست کودەتاو گەردش بەسەر شاهی ئێراندا بکات.. ئەو ئێردراوە، نامەیەکی نووسیبوو بۆ من بە کوردی بە کاك ئازادی کوڕی ئەنوەر بەگی حەمە رەشید خاندا، ناردبووی بۆم، داوای هاوکاری کردبوو، بە ناوی کۆمەڵەی شۆڕشەوە، گوایا شۆڕشی کوردە.. منیش وەڵامم نەدایەوە، چونکە گومانم لێی هەبوو، ناوەکەیدابوو بە ساڤاکی ئێران، ئەوانیش بە ئاسایی هاوکاری ئاسایشی عێراقن، شتێکی ئاشکرایە، ئەم جۆرە هاوکاریانە... لەسەر ئەوە راپێچکرام بە دەستبەسەری بۆ باشووری عێراق، 6 ساڵ، بێئەوەی ئاگاداریم هەبێت لەم بەزمە، ئەو سزایەم نۆشی.
- دوای 1970، بە کاری یەکێتی مامۆستایان، سەندیکا، بە مەبەستی یەکیەتی ریزەکانی مامۆستایان بە گیرفانی خۆم، چوومە خانەقین، دهۆك، هەولێر، برایانی بیرتەسکو تاکڕەو، لە مامۆستایان، راپۆرتیان لێدام کە بمگرن، راپۆرتەکە گەیشتە سەرکردایەتی، لەوێ بەڕێز و خەباتگێر، ئەسعەد خۆشەوی، دەیناسیم بە توورەیی لێیانراپەڕیبوو، وتی: هەرن ئەو کەریم زەندە لای سەرۆك بارزانی قاوەی دەخواتەوە، کێ پیاوە بچێ بیگرێ، بەوە لەو گاشەیە قورتاری کردم.

## هێزی چوارەم* - دەوڵەتی سێبەر Shadow:

بگرە، هێزی یەکەمو دەستەڵاتی یەکەمە، ئەو هێزە نهێنییە کە کاروباری هەرهەموو جیهان بەڕێوەدەبات، تەنانەت چارەنووسی میللەتە گچکەکانو گەلە چەوساوەکانیش، بەپێی بەرژەوەندی خۆیان، هەڵدەسووڕێنن.. کارتی کارنامەو بەرنامەیە لە پرۆگرامو ستراتیژییەتی خۆیاندا، بەکاری دەهێنن، ئەو هێزەش CIA، پێنتاگۆن، پاناگان، مۆساد، ئینتلجنسێرفس، کە ئاسایشو پاراستنی دەوڵەتە زلهێزەکانن.

دۆزو کێشەی کورد، بەپێی ئاووباو کەشی ئەم هێزە نهێنییە، سەرهەڵئەداتو کپ دەبێتەوە، لە هەلومەرجی رەخساو و بارودۆخی گونجاودا لەتەك رامیاری ئەواندا لەو تەباییەدا کە دێتە ئاراوە، گرژوخاو و هەڵچوونو داچوونی بەپێی ئەو پێوەرەیە، کە رەچاوکراوە بۆ راگرتنی لەنگەرو هاوسەنگی گشتی لە نێو رامیاری نێودەوڵەتیدا... ئەمە وەرامی پرسەکانی پێشووە.

بۆ دەوونە، سەرکۆماری ئەمەریکا، جۆن کەنەدی کوژرا لە پێچێکی ئوستانەکانی ئەمەریکا، بە تفەنگی دووربیندار، قەناسە، لە مەودای 3 کم، لە بالاخانەیەکەوە بە دەستی لیئوز والد کوبی، ژنەکەی سۆفیەتیبوو، گوللەی ئاراستەکردو پێکانی، لە تەنیشتی خاتو جاکلینی خێزانییەوە. خێزانەکەی بەرنەکەوت.. دەستی تریش هەیە لەم کارەساتەدا، شوێنەکەیان پشکنی، کوژەر دەستگیرکرا، لە کاتی هێنانی بۆ دادگا، جاك رۆبی، کارگێڕی تیاترۆخانەی شەوانە لینوز والدی کوشتەوە، تاوانەکە گومکرا.

هۆی کوشتنی جۆن کەنەدی چیبوو؟

لە هێڵی رامیاری سەردەم لایدابوو.. براکەی، رۆبەرت کەنەدی، لە کاتێکدا خۆی هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی، بەدەستی، سەرحان بەشارە سەرحان، ئەردەنی، کوژرا، لە ئوتێلێکدا، مەترسی ئەوەی لێدەکرا کە ببێت بە سەرکۆمار و تۆڵەی براکەی بستێنێ.

---

* ماسۆنی Free Masons – Masonie – فەرمەسۆن.

## زەنگی مەرگ – 1991/1/4:

کاتو دەرفەتو ڕێکەوت لەتەك ئاكامدا، یەكدەگیربوو، لەبەرەبەیانی ڕۆژی هێنی ڕێکەوتی 1991/1/4، لە زەنگی خانووەکەمدرا، بە پەلە هەستام جارێکیتریش لێدرا، بۆ ئەوەی تاوانەکە زوو تەواو بکەن، خێرا چووم، بێئەوەی بپرسم ئێوەکێن؟ سرگی دەرگاکەم کردەوە، دوو بۆرە زەلام، پیاوکوژ تاکولۆ وەستابوون، شەرواڵو قەمسەڵە لەبەر، تەمەنیان 30-35 ساڵ، هەردووکیان قەویوقۆڵ، توندوتۆڵو تۆکمە، سەر رووت.

ئەوی ئەملایان پرسی: خاڵە، ئەمەش پەرلەیە.. وتی: مزگەوتی حاجیحان لە کوێوەیە؟.. منیش وتم: فەرموون، کاکە، دووبارە وتم فەرموون، فەرمانتان چییە؟ فەرموون.. سەیر دەکەم 2 کابرای تێکسمڕاو، نامۆ، نایانناسم، ئاوڕم بەلای ئەوەیانەوە دایەوە کە پرسی لێکردم، مزگەوتەکە لە کوێوەیە؟.. ئەویتریان، لەبەر پشتێنەکەیەوە، خۆی ئامادە دەکرد، نیشانەی لەسەرمدەگرتەوە.. وامدەزانی گاڵتەم لەتەکدا دەکەن.. گوللەیەکی لە دەمانچە ستیلە بێدەنگەکەیەوە، فیشەکی فلچەی گرداری ئاراستەی سەروچاومیکرد.. ئەگەر رووم لەوبوایە، ئاراستەی ناو دەمیدەکردم..

ئاوڕدانەوەکە، بوو بەهۆی ئەوەی کە گوللەکە جیفبکات، گرمکەی دەموولووتی سووتانم، دەمووەدانی هەڵتەکانم، وەکو فوارە، خوێن بە دەمولووتمدا هاتە خوارەوە..

منیش لەباتی هاوار بۆ خێزانو ماڵبەرم، هاوارم بردە بەر جادەوشەقام، خێزانو کوڕەکەم لەوێ نەبوون، خێزانەکەم چووبو بۆ سەردانی خوشکێ کچم لە دەربەندیخان.. کوڕەکەشم، سەربازبوو..

هاوارمکرد، ئەیهاوار کوژرام، بەدەم خوێنەوە دەتلامەوە، تاکو دوکانی مام کەریمی دراوسێمان هاوسێیەکان هاتن بە هاوارمەوە،

لەو کاتەدا، ئەورەحمان حاجی ئەبدوڵا بۆسکانی بەو بەیانییە ساردە، بەسەر کارەساتدا دێ، دەوەستێ، دوودڵە، ناوێری بمبات بۆ بیمارخانە، پێ بە جەرگی خۆیدا دەنێو، بە بەتانیا دەمخەنە ناو ئوتومبیلەکەی.. هاتمەوە هۆشخۆم.

بووکەکەمو مام کەریم، دراوسێمان لەتەکمدان.. ئەورەحمان دەڵێ: بڵێ کەوتووم.. ئەگینا دەمگرن.. وتم: کاکە گوللەیان پێوەناوم، لەبەردەمی ئەخۆشخانە دایانام، هەرچۆنێبوو بە چنگەکرێ چوومە ژوورێ، کاتێ هاتمەوە هۆشی خۆم، لۆکە دەخەنە لووتمەوە.. وتیان: پەرەی پۆلیسخانەت پێیە؟ وتم: نەخێر، ئیتر رایاننەگرتم.. وتیان بچۆرە دادگا، ئەوانە کێبوون؟ وتم: نازانم، کەس دوژمنم نییە، ناچمە دادگا.

د. محەمەد باقر پارمەتیدام، وتی ئەمە مامۆستایە، خزمەتی کەمە، ئەوە خەڵاتە..

بە راستی ئەوە پاداشو خەڵاتی ئەو هەموو دەربەدەریو ئەشکەنجەو ئازاری ژیانەبوو کە دیومە.. ئەزرائرا چیبوو، هۆی چیبوو، هیچ لایەنێکی رامیاری دەری نەخست.

گومان، هەر رژێم بوو، رەنگە پریشکی مامۆستا شاکیر فەتاح بووبێت؟ چونکە لە کاتی خۆیدا دادگۆکیم لێکردبوو.. 25 شەو لەسەر جێگە کەوتم، ئاکامم نەهاتبوو.. خوداوەندی میهرەبان و بەخشندە و پاکی خۆم، فریامکەوتن.. ویستی یەزدانی بزورگبوو، دوایی دەرکەوت لە بەڵگەی ئاسایشدا.

## گەڕانەوە – بیرخەرەوە:

## شێخ مەحمود حەفیدی نەمر، 1881 – 1956:

کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ محەممەد کوڕی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە.

لەتەك باوکو مامەکانی لە تەمەنی 10 ساڵیدا دەبن بە مێوانی سوڵتان ئەبدولحەمید ئوسمانی، ماوەی 2 ساڵ پتر لەوێ دەمێنێتەوە، دوای ئەوە لەتەك کاربەدەستانی ئوسمانیدا تێکدەچن، ئاڵۆزبوو کێشە پەیدادەبێ، وایلێهات لە 1907 بانگکران بە فەرمانی دەوڵەت بۆ مووسڵ، کارەسات روویدا، شێخ سەعیدی باوکی کوژرا.

ئەم رووداوە لە نووسراوەی 3 قوربانییەکە – شێخ ئەبدوسەلامی 2 بارزانی، شێخ سەعید کە لە مووسڵ کۆتایی بە ژیانیان هێنراوە.

20 ی گەلاوێژ، 1914، شێخی نەمر لەشکر رێکدەخات لە کوردستانەوە بەرەو شعێبە و بەسرە، بۆ بەشداری شۆڕشی 20، بە شانازییەوە، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان.. کارگێڕێتی کوردستانی گرتۆتە ئەستۆ، بە لەشکرەوە رووبکردۆتە سنوور، لەتەك سوپای رووسدا جەنگاون.. دوای 1918، فەرمانڕەوایی پێسپێردراوە، تاکو جەنگی دەربەندبازیان 1919، شێخی نەمر، بە برینداری گیرا، لەپاڵ بەردەقارەماندا، رەوانەی بەغدادکرا، دادگای سوپایی فەرمانی خنکاندنی بەسەرا درا، لە تەك شێخ محەممەد غەریبی زاوای، لە شێخانی گوندی قازانقایەی قەراخ.

فەرمانی خنکاندنیان گۆڕدرا، رەوانەی هیندستانکران، 3 ساڵ لەوێ مانەوە، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ کوێت لەوێوە بۆ سلێمانی، کراوە بە فەرمانڕەوا لە 30 ی ئەیلولی 1922 تاکو 1924.. دووبارە پەیوەندی لەتەك کاربەدەستانی ئینگلیزدا تێکچووە، جەنگی پارتیزانی دەستپێدەکات تاکو 17 حوزەیران 1927، سەردەمی شاپارێتی جەعفەر عەسکەری، شێخی نەمر لە ئەنجامی گفتوگۆکردندا دێتەوە بۆ بەغداد، ماوەیەکو گەڕاوەتەوە بۆ دەفەری پێنجوین.

کارەساتی رۆژی رەشی شەشی ئەیلولی 1930، لە شاری سلێمانی، کە ئێمەی منداڵانی گەرەکی مەڵکەندی، هاوبەشبووین بەپێی توانای منداڵی.

بۆ تۆڵەی ئەمە، شێخی ئەمر بە گەرمی جەنگاو بۆ خوێنی گەشمەردەو بەهەشتییان جەنگی ئاوباریك 1931 بۆ سارێژکردنی برین روویدا.

بەپێی گفتوگۆ لەتەك میریدا، 1933 شێخی ئەمر بە دەستبەسەری هێنرایە بەغداد تاکو 1941، بزاڤی رەشید عالی گەیلانی، لە مایسی 1941، دەرفەت رێکەوت گەڕایەوە.. منو سالح ئەحمەد بابان، مستەفا کەریم غەفور لە خزمەتیدابووین تاکو گوندی سیتەك لە شاربازێڕ.. ئەمە لە کۆمەڵەی برایەتیدا لێی دواوین.

دوای ئەمە، لە گوندی داریکەلی دانیشت لە بازیان، کەڵە هۆزانڤان، ئەحمەد حەمەدی ساحیبقران دەڵێ:

| | |
|---|---|
| وەك مەدینە بێنەبیبێ | یا نەجەف بێ بێ عەلی |
| شاری غەزنە بێ مەحموده | ئیستە وەك داریکەلی |

لە 1956/10/9، لە نەخۆشخانەی حەیدەری لە بەغداد، گیانی سپارد بە ناکامی سەری نایەوە.. شێخی ئەمر، لای مەلا کاکە حەمەی رەباتی دەڵێ:

شابازێ بووم لە مەیدانی شکاری دوژمنا

جەهلی میللەت بوو بە زیللەت هات بەسەرشانی منا

تەرمەکەی هاتەوە بۆ سلێمانی، شێخ لەتیفی کوڕی لەو کاتەدا، بەندکرابوو، خۆپیشاندانکرا، تەرمەکەی گوللەی بەرکەوت، ئەختەری خێزانی رەسوڵ، لەو کارەساتەدا کوژرا.

عومەر عەلی ئوستاندارببوو، بەڵام لەو کاتەدا بە سیلە و مۆڵەت رۆیشتبوو، بریکارەکەی کاك فەوزی جەمیل سائب بوو.

شێخی ئەمر 3 کوڕی هەبوو، شێخ رەئوف، شێخ بابا عەلی، شێخ لەتیف. ئارامگەو خەوابگەی لە مزگەوتی گەورەیە لە تەنیشت باپیریەوە، کە قالبی گڵی راکشاوە، بە ئەمری هەرماوەو زیندووە.

## بیرەوەریم لە خزمەتیدا:

لانەوازیو ئاوارەیی بردمی بۆ گوندی داریکەلی لە رۆژانی پیرەشێری کەنەفت، شێخی ئەمر، تفەنگێکی فرۆکەشکێنی ئەڵمانیم پێبوو، چوومە خزمەتی، کامیابیوو ئەو شانشینە کوردە، باخیگەران لێی خڕببوونەوە، هەموو سەرنجیان لێدەدام، منیش تفەنگەکەم چاکتر نزیککردەوە، تا بە چاکی بیبینن، بزانن کە خواردنی ئەوانیش نییە..

شەو چوومە لای کوردە ئاوارەکانی ئەودیو، بەیانی هاتمەوە خزمەتی، فەرمووی، شەوێ لەکوێ بوویت؟ وتم: قوربان لای ئەوان بووم.

ئەو باخیگەرانە، خولە قەویلەیی، جەبار سوێراوا، حەمە کەریم و حەمە سوور وێڵەدەری، ئەورەحمان، حاجی سەعدون.. بۆ نیوەڕۆ، خودی خۆی 2 جار چووە خوارەوە، نەیدەتوانی، دەچوونە ژێر باڵی، فراوینم خوارد لە خزمەتیدا، ماڵئاواییمکرد.. فەرمووی لێرە بمێنە، بردمیە ژوورەکەیخۆی.. مۆبیلەی تۆزاوی سەرنگشکاو، لانەی ئەو پیرە شێرە، نزیکی کۆتایی ژیانی، هاتە گفتوگۆ، فەرمووی: کەریم، تۆ بڵێیت ئاڵای کورد جارێکیتر بلەرێتەوە؟.. وتم: لەرییەوەو خۆمان تێکماندا.. کڵاوو جامانەکەی بە توندی فڕێداو دایبەزەویدا، وتی: بە گۆڕی کاکە ئەحمەد من تێکم نەدا.. فرمێسک بە هەردوو چاویدا هاتە خوارەوە، منیش گوتەکانم گۆڕی، لە پاشدا داوام لێکرد کە ماوەمبدا بڕۆم.. وتم: دەچم بۆ گوندی تەنگیسەر بۆ لای شێخ قادر حەفیدی برای، ئەمە بۆ شوێنە ونی، سڵکردن لە باخیگەران، ئیتر رووەمکردە گوندی خاوێ.

**کاریگەری چەرخ:**

شێخی نەمر، لە 1919، لە دەربەندبازیان، بە چەند تفەنگێکی وەکو حسکەو جاملێنرلرو ژێرسافو مەعدەنو مارتلیو داداشو 3 تیرو قەپاغلی و ماکەنزییەوە، چوو بەگژ سوپای ئینگلیزداو قارەمانی سەردەمبوو.

ڕۆژانی دوایی پیرەشێر، کەنەفتی، پەککەوتەیی، 1955 عومەر عەلی بە پۆلێ سەربازو پۆلیسەوە، چووە سەری، شێخی نەمر، سواری ئەسپەکەی دەبێ، دەچنە ژێر باڵی، تفەنگەکەی دەخەنە بەردەمی بە 2 کەس بنباڵی دەگرنو، پێی دەخەنە ناو ئاوزەنگییەوە، تاکو گوندی بارۆیی ڕۆیشتە دوایی ئاوڕیدایەوە تەنها 5.4 چەکداری بەدواوەیە، فەرمووی: بگەڕێنەوە.

پێشوازی لە عومەر عەلی دەکاو فەرمووی: پاشا ئەوە چووبووم بۆ ڕاو، ئەویش لە ڕووی دیبلۆماسییەوە، دەستی ماچدەکات، بە دەستبەسەری هێنای بۆ سلێمانی ڕۆژی 3 جار بە پێپیلکەی سەرادا، سەردەکەوت بە کۆمەکۆمە و خەنجەرەکەی قەدی خەریکبو بیدا لە ناوچەوانی، ئەوەندە کۆمابۆوە، پیرو پەککەوتەیی.

ئەمەیە داستانو چیرۆکی میللەتی ستەمدیدە.. عومەر عەلی لە گۆڕو کۆمادا، بۆ خۆهەڵکێشان دەیوت، شێخ مەحمود کێمە، واتە کێیە؟ کەرەتەیەمن گێڕدم.. وەکو کەرەتە هێنام.

ئەمە کاری چەرخو زەمەنە، چەرخو زەمەن قارەمانە، ئەم پیرەشێرە، قارەمانە مەزنە، لە ڕەنگدانەوەی میللەتەکەیدا بەرجەستە دەبێت.

ئاخ، کاریگەری زەمەن، پیرەشێری وەکو شێخ مەحمودی نەمر لە بارۆییەوە بگەڕێتەوە، پێشوازی عەمەر عەلی بکات، لەتەك خۆیدا بیهێنێ بە دەستبەسەری، کۆمەکۆمە بە پێپیلکەی سەرادا ڕۆژی 3-2 جار بچێ واژوو، موژری بەلگەی ئامادەبوون بکات، ئەمەیە کاری چەرخو شکستی گەل.

هەمان عومەر عەلی دوای 14 ی تەمموز، 1958، بدرێت بە دادگای گەل، لە دادگادا دەپاڕێتەوە.

## ژەنراڵ بارزانی ئەمر 1903/3/14 – 1979/3/1:

**مێژووی بارزان 2 خولە،**

- له ڕێبازگەی نەخشبەندییەوە، شێخ تاجەدین بارزانی سەرۆکی بارزانو زێبارو دەوروبەری.. ئەم خولە، ئەم چەرخە بە خنکاندنی تاجی بەهەشتیان، شێخ ئەبدو سەلامی 2 بارزانی، کۆتایی هات، لە مووسڵ 1914، لەلایەن دەستەڵاتی ئوسمانییەوە.

**ئەمە لە نووسراوەی 3 قوربانیەکەدا باسکراوە.**

وشەی بارزان، بەرازی، خێڵی بەرازی، یاخو ناوی باپیرەگەورەیان، بارزانی دێرین، واتە رەوا، پارسان، پاوچاکان، خوداناسان، دەروێشەکان، دەروێشان، یاخود، بارزان – برایانی ئەباو زانا.. دەچنەوە سەر خێڵەکانی هەکاری، حیانشین، دوور لە هێرشی مەغۆل، لە چەند بەرەیەك پێکهاتوون.. شێروانی، مزوری، دۆڵەمەری، هەرکی، بەرۆژی، بەرۆژوان، خانەوادەو بنەماڵەی شێخەکان، ئەوەی شێخ تاجەدین نەخشبەندی.

بارزان، دەڤەری شاخاوی، بریتیە لە بارزان، مێرگەسوور، مزوری باڵا، بە چیای پێرس، ئابلۆقەدراوە، زێبار، ، شیرمان، براتە، لە خۆرنشینو باشوورەوە بە چیای شیرین، بارۆش، برادۆست، پیرانی، کانیرەش، گلەشین، لە خاوەرەوە.

چەند کێوێکیتر لەمانە جودا دەبێتەوە، بە نێوی جیاوازەوە، کە هەموو لە زنجیرە راکشاوەکەی زاگرۆز و کانگاکەی کە چیای ئارارانە، 5125 م بەرزە، جودا دەبنەوە.

ژەنراڵ بارزانی ئەمر، کوڕی شێخ محەممەد بارزانی، برای خودانی بارزان، شێخ ئەحمەدی بەهەشتی، شێخ ئەبدوسەلامی 2 گەشمەردە، شێخ محەممەد سدیق، شێخ سلێمان، شێخ بابۆی برازای..

دوای زنجیرە بزاڤو شۆڕشەکانی بارزان، بە ئاوارەیو، دەستبەسەرکراوی لە سلێمانی، لەتەك خودانی بارزانو جەنگاوەرانیدا، بە کۆمەکو یارمەتی کۆمەڵەی برایەتی، بەهۆی شێخ لەتیف حەفید و بریکاری حاجی مەلا ئەسعەد مەحوی،

چەکدارانی ئەو کۆمەڵەیە: مچە فرگەیی، مکایەلی، براگەورە، شێخ حسێن بەردەزەردی، بەرزنجی، حەمە پیزە، بێسەری، ئەحە بێورەیی، بلباس، ئەمانە نیگابانی شێری بارزانبوون، رەوانەیانکردەوە، گەیشتەوە لانەی خۆی، شۆڕشی بارزانی 1943 بەرپاکرد، کە کۆمەڵەی هیوا دەستی باڵای هەبوو لەو شۆڕشەدا.

هەروەها شۆڕشی ئەیلول 1945، شکستی بارزانو رۆیشتینان بۆ شنۆو لاجان، لەتەك ئەفسەرە کوردەکانو فەرمانبەرو رۆشنبیراندا کە هاوکاری شۆڕشەکەبوون، سەرماو برسێتییانکێشا تاوەکو وەرگیران، لە کۆماری کوردستاندا بەشداربوون، هێماو پەیکەری دیموکراتی بوون، لە هەڵکردنی ئاڵای پیرۆزی کوردستاندا هاوکاربوون، کە بە ئاهەنگو سروودی میللیو وتاری پێشەوای مەزن، لەو رۆژە پیرۆزەدا ئەنجامدرا.

بارزانی، بەرگری مانونەمانی کرد لەو کۆمارە، تا دواهەناسەی کە شکستی هێنا بەرەو کاپکاس، لە کۆڕەوی مەزندا، کە باسکراوە، لە رۆباری ئاراس پەڕینەوە.

لە شۆڕشی ئەیلولی 1945، دەرئەنجامی فشارگەری ئاڕەوای هێزی میری زۆردار، کە دەیویست پشتی لێبگرێت، ئابلۆقەی بارزان بدا لەڕێی باپشتیانو دیانەو بادلیانو کۆنە گوندەوە، هێزی بارزان بە سەرکردەی نورو شیروانی، بەرەنگاری یەکتربوون، تاکو ئێوارەی خاپاند، بە کوشتنی فەیسەر هورمز کۆتایی هات، کە سەرکردەی هێزی ئائاساییەکانبوون، لەشکری میری شکاو گەڕایەوە، کوژراو و چەکو چۆڵی بەجێهێشت، شێخ محەمەد سدیق برای ژەنراڵ بارزانی بریندار کرا.

دوای ئەوە، جەنگی ئەحلە، نێوانی چیای ئاگرێو پیرس لە 1945/9/8، هێزی میری، تۆپوفڕۆکەی بەکار هێنا، بارزانیش بە تفەنگ ئابلۆقەی هێزەکانی میرییاندا، بەڵام خێڵە کوردەکان ئابلۆقەکەیان شکاند.

جەنگی هافدیان، هاودیانو مەزنە 2 ئەیلول 1945، بارزانییەکان، لە ئەشکەوتی هاودیاندا خۆیان متکردبوو، دوور لە مەزنە بە ماوەی کاتێ.

حەمەداغای مێرگەسوور شێروانی، نورو شێروانی هێرشیان برد، لەشکری میری شکا.

لە جەنگی هەرندا، لە پشتەوەی چیای پێرس، 3 کات لە بارزانەوە دوورە، بەرەنگارییەکیتر روویدا.. مایۆر عیزت ئەبدولعەزیز، ئەفسەری تۆپ، تۆپبارانیکردن، گوللە تۆپەکان کورتیهێنا.. سەرۆک بارزانی ئەمر، فەرمانیدا کە تۆپەکان نزیکبخەنەوە، لە کۆتاییدا، بارزانییەکان بە ناچاری کشانەوە.

25 ئەیلول 1945، سوپای عێراق هێرشی برد، بارزانییەکان بەرگرییان لێکرد، جەنگ تاکو شەوێ خایاندی، بارزانییەکان کشانەوە بۆ گوندی هەرفتە، خانەوادەی بەرۆژی، تیرەگانیتر، گەیشتنە کێلە شینی پشتی شنۆ، ناو خاکی هەرێمی کوردستانی خاوەر لە 1945/10/12، خاکی کوردستانی باشوریان بە تەواوی بەجێهێشت لەتەك ئەفسەرو چەکدارانداا.

سوپای رووسی لەوێبو، خێڵەکوردەکان پێشوازییان لێکردن، لە دەڤەری شنۆو لاجان جێگیربوون... دوای شکستی کۆماری کوردستان بەرەوە کاپکاس رۆیشتن بە جەنگی پارتیزانی، خۆشم بەشداربووم.. 13 ساڵ لە رووسیا مانەوە، دوای 14 گەلاوێژ 1958 گەڕانەوە خاکی نیشتمانی دایك.

دووبارە بارودۆخ گۆڕدرا، 13 ساڵیتر لە شۆڕشدابوون، تاکو دەرچوونی بەیانی ئادار 1970.

دووبارە شۆڕش بەرپابۆوە، 1974، ماوەی ساڵێك، شکستی هێنا، ژەنەراڵ بارزانی ئەمر بەرەو ئەمەریکا رۆیشت، بە ناسۆری سەپنایەوە.. ئارامگەو خەوابگەی لە شنۆیە، ئارامگەی جەنگاوەر ئەسعەدخۆشەوی، بەتەکیەوەیەتی، کەسی دووەمبوو لە شۆڕشەکاندا.. 1979/3/1 بارزانی ئەمر کۆچیدوایکرد.

**بارزانی نەمر:**

1903/3/14 لە گوندی بارزان هاتۆتە ناو جیهانەوە.

1906 بەندکراوە لەتەك دایکی بەڕێزیدا.

1919 بە فەرمانی شێخ ئەحمەد، خودانی بارزان، براگەورەی، چۆتە کوردستانی باکور، چاوی بە شێخ ئەبدولقادر نەهریو شێخ سەعیدی پیران دەکەوێ لە شاری مووش.

1919 بە هێزێکەوە لە دۆڵی بیاو هاوکاری شێخ مەحمودی نەمر دەکات.

1920 لە کوشتاری ئەرمەنیدا، دەگاتە هانایانو فریایاندەکەوێتو، ئەنتزانیك پاشایان و خێزانەکەی قورتار دەکات.

1931 لە یەکەم راپەڕینی بارزاندا، لە جەنگی بەرقی بەگدا سوپای دەوڵەتی شکاند.

1936 بۆ وتووێژ دەچێتە مووسڵ، لەوێ دەستبەسەر دەکرێت.

1943/3/12 لە سلێمانی بە کۆمەکی کۆمەڵەی برایەتی دەرباز دەبێو دەگاتەوە بارزان لە شنۆوە.

1943 سەرکردایەتی شۆڕشی بارزان دەکات.

1945/10/11 کشانەوە بۆ کوردستانی خاوەر، دوای شکستی شۆڕشەکە.

1947/6/18 لە رۆباری ئاراس پەڕینەوە بۆ رووسیا.

لە ئایاری 1953، دوای مردنی ستالین، گوێزراوەتەوە بۆ مۆسکۆ، چاوی بە خرۆشۆف کەوتووە.

1958/10/6 گەڕایەوە بۆ نیشتمانی دایك، دوای کودەتاو وەرچەرخاندنی رژێمی پادشاهێتی عێراق.

لە سەرتای ئاداری 1960 بە یەکجاری گەڕایەوە بۆ بارزان.

1961/9/11 سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولی کردووە.

1971/9/29 لە پلانە گڵاوەکەی، مەلاکاندا، بە سەرسامی رزگاری بوو.

ئاداری 1974 دەستیدایەوە شۆڕشی بەرگری.

ئاداری 1975 بە هۆکاری ڕێکەوتننامەی جەزائیرەوە، کشایەوە بەرەو کوردستانی خاوەر.

1979/3/1 لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە نەخۆشی شێرپەنجە، کۆچیدوایییکرد و چاوی ئارامی لێکنا، لەسەر ڕاسپێری خۆی لەسەر سنوور، لە شاری شنۆ، ئەسپەردەی خاکی پیرۆزی نیشتمانکراوە.

هەزاران سڵاو و درود لە گیانی پاکی، لە ڕەوانی پیرۆزی... هەزاران سڵاو لە یارانو دڵسۆزانو هەڤاڵانیو لە ڕێبوارانی ڕێبازی بارزانی نەمر و شکۆمەندو سەرفرازەکەی.

## کۆمەڵەی خۆیبوون - 1927:

القضية الكوردية، د. بلەج شێرکو،

1930-1349 مطبعة السعادة

بجوار محافظة مصر.

دوای شکستی شۆڕشی 1925، کوردە دڵسۆزکان لە ئەنجامی ئەو کارەساتە دڕندانەیەدا، بڕیاری بەستنی کۆنگرەیەکی کوردی یەکگرتوو درا لە 1926، هەموو رەگەزە کوردییە سەرەکییەکان، کۆ بکاتەوە لە نوێنەرانی کۆمەڵو رێکخراوو سەرۆکی خێڵەکانو ناوداران بە مەبەستی خۆکۆکردنەوەو بەرگریو رزگاری کوردستان لە جەنگی دوژمنی خوێنخوار و بەربەستکردنی هێرشی ناڕەواو پارێزگاری جەنگاوەرانی چیاکانو هەڵۆی کێوەکان.

ئەو کۆنگرەیە لە 1927 لە کوردستانی باکوور – داگیرکراو، دانیشتنەکانی مانگونیوێکی خایاند، لە بڕیارەکانی:

1- هەڵوەشاندنی هەموو کۆمەڵەو رێکخراوێک، بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵێکی گەورەی سەرەکی یەکگرتوو، هەموو ئەندامانی کۆنونوێ بگرێتە خۆی.

2- درێژە پێدانی شۆڕش و خەباتی هاوبەش لەتەك گەڵ تورکدا، تاکو دوا سەربازی تورك خاکی کوردستانی پیرۆز بەجێبێڵێ.

3- رەچاوکردنی ئەم لایەنانەی خوارەوە:

أ) دانانی فەرماندەی گشتی بۆ هەموو هێزە نیشتمانییەکان.

ب) یەکخستنی هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکان بە مەشقی سەربازیو جەنگی، چەکدارکردنیان بە نوێترین چەکوتەقەمەنی جەنگی.

ج) دامەزراندنی سەرکردایەتی گشتی باڵای شۆڕش بۆ هەموو هێزەکان، هێزە نیشتمانییەکانی کورد، لە چیایەکی کوردستاندا.

د) پەیوەندی بەستن لەتەك گەڵ فارسو تورکدا لەسەر بنەمای برایەتیو تەباییو گونجاو.

ھ) بەستنى پەيوەندى برايەتى لەتەك عێراقو سوريە و قايلبوون بەو مافەى كە چەكى دالە – پارێزراو – ئينتيداب – پەيمانە نێو دەوڵەتيەكان كە بڕياريان لەسەر داوە، داواى مافى راميارێتر نەكرێت.

لةو ڕۆژى ئەم كۆمەڵە لە هەموو كوردستاندا بڵاو بۆوە، ژەنراڵ ئيحسان نورى پاشا كرا بە فەرماندەى گشتى سوپا لە چياى ئاگرى، شۆڕش بەرپاكرا، دەستپێكرا بە فراوانى، رۆژ لە دواى رۆژ، تاكو شالاوى مەزنى تورك 1928، برايە سەر ئاگرى، شكستى تورك لەم هەڵمەتەدا.

لە ئەنجامى ئەم شكستە، تورك رێبازى خۆيانگۆڕى بە فێڵو تەڵەكە، ياساى بەخشينيان دەرگرد و راگوێزانو ئاوارەيى راگيرا، رێپێدان بە گەڕانەوەى دوورخراوان، دانانى سەرپەرشتيارى گشتى بۆ كوردستان – Vice Roi، بە مەرجى هەڵوەشاندنى كۆمەڵەى خۆيبوون.

ئەم پيلانە سەرينەگرتو بەسەرهاتەكانى رابووردوو وانەيەكى روونو ئاشكرابوون... كۆمەڵەى خۆيبوون، لەسەر ئەوە سووربوو، كە گەرەكە، دوا سەربازى تورك، خاكى كوردستان بەجێبهێڵێ، توركيا، دان بنێ بە سەربەخۆيى كوردستاندا.. بەڵام دواى شكستى هەڵمەتەكانى 1928، 1929 بۆ سەر چياى ئاگرى، خۆى ئامادەكرد بۆ هێرشێكى مەزنتر لە ئەپريلى 1930، تاكو 5 يۆنيۆ، خۆيبوون ئەخشەى بەرگرى هەبوو، ئەم پيلانە بۆ ماوەى 3 مانگ، لەو چيايەى كە ئاڵاى كوردى لێهەڵكرابوو.. ئەو هێرشە مەزنە بۆ سڕينەوەى ناوى كورد، بۆ كوژاندنەوەى پێناسەى نەتەوەيى كوردبوو.

بەرەبەيانى 11 يۆنيە 1930، شالاوى سوپا برايەسەر شۆڕشگێڕان، 3 رۆژ بێدەنگى و خامۆشى ئەو چيا پتەوە سەختە خۆڕاگرە كشوماتە لە ئێخنێرو تەندركو ئەرجيتو ڤانو بتليسو چياى سوبحان – سيپان، شكستى توركو هەڵوێستى بەرگرى، 13 يۆنيە تاكو 13 يۆليە، كوشتارو بريندار، تێكشاندنى 12 فرۆكە،

گرتنی 60 تۆپ، 6 هەزار گوللە، 150 خیوەت، 3 هەزار تفەنگ، 40 بار ئازوخە، شکستی 4 هەزار، تەنها لەشکری 7، 8، مایەوە لە ئاگری.

تورك، بە ناچاری سەربازیگرت لە جەوانانی 1901، 1905، دواخستنی هێرش بۆ سێپتێمبەر، دانان بەو شکستەدا، کوردی کەرتی باشووری گەورە و گچکە، لە جەنگاوەرانو پێشمەرگە، کەوتنە فریای برا کوردەکانیا.. کارەساتی وێرانکاریو خاپورکردن، دەستیپێکرد.. تۆڵەی درندانەی، بێبەزەیی کەوتەکار... 220 گوند خاپورکرا، لە شێوەی زیلان، لە پیرو پەککەوتەو منداڵ، تیرە بارانکران، سووتانیانن، بە سەدان لە رۆشنبیران گیران، فرێدرانە گۆمی ڤانەوە بەدەم سروودی نیشتمانییەوە.

30 گوندی بەروپشتی چۆڵەمێرگیان وێرانکرد، 5 سەد ئافرەتو منداڵیان لەسێدارەدا، 400 گوندی نزیکی چیای ئاگری، سووتێنراو خاپوورکرا، هەروەها نشینیانی چیای تەندرك، بە بۆمبای سووتێنەر و گوللە تۆپ سووتانیانن.

هێزی جەواد پاشا لە ئوستانی هەکاری، بەهیت شەباب - خانەی لاوان، شەمدینان، هەموو گوندو دێهاتەکانی سەرڕێی ئەو لەشکرە کە ئەکشا، وێرانکرا، نزیکەی 120 گوند و کێڵگە.

لای ڤانەوە، بە فەرماندەی کەمالەدین سامی پاشا، دەڤەری چالدێران، 83 گوند سوتاو 600 کەسیان کوشت.

دوای ئەم هەموو وێرانکارییە، بڕیار لەسەر ئەمانە درا:

1- هەڵوەشاندنی ژیانی خێڵایەتی، دابەشکردنیان بەسەر ئوستانەکاندا.
2- نەهێشتنو قەدەغەکردنی چەك لە کوردستاندا.
3- راگوێزانی کوردە گوندنشینەکان.
4- بەزۆرکردن بە تورك بە گشتی، قەدەغەکردنی زمانی کوردیو نووسین بە کوردی.

رۆژنامەی ئەحوالی بێروت

13 ئاب 1930.

نوسینگەی کارگەرانی نێودەوڵەتی لە زۆریخ، بێزاری دەربڕی، 30 ئاب 1930... لە رۆژنامەی ئەهرامی میسر 9 سێپتێمبەر 1930 پەسەندکرا.

9 حوزەیران – 1963:

**شەبە یخونی شەوی مەینەت کتوپڕ دایەسەرمانا**

**لە دەریای میحنەتا خنکا، گوڵی شادی لە دڵمانا**

**دەستی فاشستی 63 لە 23 حوزەیرانا**

**خزانی سونبولی نوزی لە ناو جەرگەی کوردستانا**

9ی حوزەیران، کارەساتی درندەیی 1963، دەرئەنجامی کودەتاو وەرچەرخانی 8 مانگی رەشەمە، رۆژی هەینی 14 رەمەزان، رۆژی کۆتایی فەرمانڕەوایی ئەبدولکەریم قاسم، تاکڕەو 1963.

شەوی 7 لەسەر 8، مانگی رەشەمە، هەینی 1963، لە بەغدابووین، لە ئوستانی ناسرییە لە تەك مامۆستا کوردەکان، گوێزراوەبوون، منیش بە دەستبەسەری ، مامۆستا سابیر ئەحمەد، سەعید مەلا کەریم، جیهان شاوەیس، ئەو شەوە لە ئوتێل شەهلا بووین، لە کاتی 8ی شەوەوە شەقامەکانی بەغداد، جۆڵەجۆڵ، کەسی پێوەنەبوو.. بۆنی خوێنی لێدەهات، وتم: کوڕینە با بڕۆینەوە بۆ ئوتێل.. کارەسات رەچاو دەکرێت.

بەیانی زوو هەستاین وتم: بابڕۆین، تاکو نەقەوماوە، بەگوێیانکردم هاوڕێکانم، هاتینە گەراج، بەرەو ناسرییە هاتین، لەسەر بازگەی رەشید و پری بیالە، دەرپازبووین... نزیکی عەزیزییە، شۆفێرەکە، رادیۆیکردەوە، لەپڕ بە دەنگی بەرز وتی: **قضینا علی الطاغی – نسور الجو..** وتیان رادیۆکە بگرە.. وتم: نەء.. هاوڕێیەکانم وتیان بگەڕێنەوە، وتم: نەخێر.

هەریەکەمان بچینەوە شوێنی خۆمان، ئێمە دەستبەسەرین.. رژێمی نوێ لەتەك سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلو 1961، کەوتە گفتوگۆ بەهۆی بەڕێزان، کاك فوئاد عارف، سەیدا سالح یوسفی بامڕنی، کەریم قەرەنی برام.

ئەو کاتە سەیدا ساڵح یوسفی، دەستبەسەربوو لە ناسرییە وەکو ئێمە.. ئەم هەواڵە لە وێستگەوە راگەیەنرا، پرۆژەی لامەرکەزی هاتە کایەوە.

دوای رۆژونیــوێ بــەرگری ئەبدولکــەریم قاســم لــە شــاپارێتی بــەرگری، خۆبەدەستدانەوەیو کوشتنی لە چیمەنی وێستگەکەدا، ئەو وتووێژە سەرینەگرت.

سەرهەنگ سدیق مستەفا کرا بە فەرماندەی سوپا لە سلێمانی، فەتحی سقللی کـرا بـە دادوەری سـوپایی هـەرێمی بـاکوور.. پۆسـتی بەروپشـتی شـاری سـلێمانی قایمکرا.

لە بەرەبەیانی رۆژی 9 حوزەیران، بە بڵنـدگۆ جاڕی قەدەغـەی هاتووچۆدرا، تـانکو زرێپۆش ئابڵوقـەی شـاریدا.. شـاڵاو و هێرشـی دڕندانـە برایـە سـەر خێزانـو خانەوادەو ئافرەتو منـداڵ، پەلاماری، لاو و پیرۆ فەرمانبـەرو کارمەنـدو دوکتـۆرو کاسـبکارو دادوەرو هـەموو دانیشـتوان درا، راپێچـی نـاو زیلکـران بـەرەو تەویلـەی سـەربازخانە.. دووچـاری برسـێتی، تینوویـەتی، هەڕەشـەی مـەرگ بوونـەوە، تەویلەکان سیخناخکرا، 5 هەزار کەسی تێئاخنرا.. پتر لە 460 کەسـیان لیکوشـتن لە شیوی مەرگدا – وادی الموت، زیندەبەچاڵکران.

سەرهەنگ سدیق تەلـەگرافیدا بـە بەغـداد وتـی: 5 هـەزار یاخیبوومگرتووە، فەرمانتان بەچییە؟.. ئەبدوڕەحمان عارف، سپاپودبوو، لە وەڵامدا، دەڵێ: دوایفە، چـونکە سەرسـامە لـەوە کـە لـە مـاوە یـەکی زۆر کەمـدا 5 هـەزار چـەکدار بەیەدەسـتیکاتو بیـانگرێ.. خـودی خـۆی دێتـو، بارچاوەشـێکی کـورد لـە تەکیـدا و دەچنە لای گرتووەکان لە تەویلەکان.

یەکێك لەو گرتووانە بانگدەکاتو دەڵێ: تۆ چیت؟.. دەڵێ: کۆڵبـەرم، دەڵێ کـوا چەکت؟.. دەڵێ: نیمە، گوریسو پەتکم هەیە.

دووەم بانگدەکاتو دەڵێ: من پۆلیسم، پاسەوانبوومو گیراوم.

سێیەم دەڵێ: کارگێڕی گشتی پەروەردەم.

چوارەم دەڵێ دوکتۆرم.

پێنجەم دەڵێ دادوەرم .. بەمجۆرە..

سەدیق باندەکات، دەڵێ: کوا چەکیان؟ تاپڕێکو تەنها دەمانچەیەك گیرابوو.
دەڵێ: ئەزمرێ گیراوە، ئاماژەی نەخشە دەکات، کوا زێوێنی پیرەمەگرونت گرتوو؟
وەڵام نییە.

بەڵام کار لەکار ترازابوو، 5 سەد کەسی زیندەبەچاڵکردبوو..

هەروەها لە شاری کۆیە، بە فەرمانی تەها شەکرچی، دەیان کەس بە دنگەکانەوە – کۆڵەکەکان، تیرەبارانکران، لەوانە مامۆستا کەمال رەشید حەوێزی.

لە کەرکوك، گەڕەکی جەمهوری بە شۆفڵو بیلدۆزەر تەختکرا.

لە 23 حوزەیراندا، بەهەشتیان – گەشمەردان، مارف بەرزنجی، حسێن بەرزنجی، کوڕانی شێخ ئەبدولکەریم قادر کەرەم، لەسێدارەدران.. نموونەی خەباتی میللیو هاوچەرخبوون.

منیش 6 ساڵ دەستبەسەریم کێشا لە ئوستانی ناسرییە، لە کەناری خوارووی زۆنگاوەکان، لە ئەلبوساڵح، ئیسلاح، کەحلا، قەلعەسوکەر، بە مووچەیەکی زۆر کەم، رۆژی 3 جار دەبوایە ئامادەبوومایە لە پۆلیسخانە.

لە هەولێر، بەدرەدین عەلی ئوستاندار، ئەویش لە وێرانکاریو گرتنو کوشتن درێخی نەکرد، جەبی لە خوێنڕێژەکانیتر کەمتر نەبوو.

## ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا، 1892 – 25 ئادار 1976:

لە خێڵی جەلالییە، بە بڕیاری کۆمەڵی خۆیبوون، لە یەکەم کۆنگرەدا 1927، بەپێی برگەی ا، ب، ج، ژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا، دانرا بە فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارە شۆڕشگێڕەکانی چیای ئارارات، ئاڵای کورد لە لوتکە بڵندەکانیدا هەڵکرا.

ڕووداوەکانی ئارارات، لە ڕۆژنامەی کۆهستان، خاوەنی ئیسماعیل ئەردەڵان، بڵاویکردۆتەوە، ئەم ڕۆژنامەیە لە تەهران دەردەچوو، لە ساڵانی چلەکاندا..

ئەو دەمە بە کاری رامیاری، بەر لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، لە شارۆچکەی بۆکان لە خانەی قاسماغا ئێلخانیزادە، دیبووکری، بەیەکگەیشتووین.. لەم بوارەدا لەتەکیدا دواوم، لە شەوێکی مانگی ئاب 1945، کە بەرەو ئەمدیو دەگەڕامەوە.

دوای کزبوو لاوازی شۆڕشی ئاگریداخ – ئارارات، دەرئەنجامی نەمانی ئازوخەو کەمبوونەوەی جەنگاوەران، بە ناچاری خۆیدا بەدەست ڕژێمی ئێرانەوە، چەرخی ڕەزاشا، بە دەستبەسەری مایەوە لە تەهران – تاران.

نامەی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان نارد دوای 14 گەلاوێژ 1958، وەڵامی ئەوتۆی نەدرایەوە، کە دەربارەی کۆمەکو دۆزی کورد بوو.

ئەم فارمانە، بە ئەدەری، بە هەژاری، بە دەستبەسەری گوزەراندی، تەنانەت بەرگی شڕو کۆنی لەبەردابوو، پاڵتۆی بەسەردا لەبەردەکرد، بۆ ئەوەی دیار نەبێت.. شەوانە دەچووە دەرەوە لای دۆستو ئاشناکانی.. لە شەقامێکی تاران، ماتۆرسایکل لێیداو کۆتایی بە ژیانی ئەو کەڵەمێردە هێنا.. لە مەزارگەی بەهەشتی نێژراوە، بە بێناز، فەرامۆشکراوە، بێبایەخدانو ئەرزش، تەنها ژەنراڵ بارزانی ئەمر بەسەریکردەوە، نماینەدەی خۆی لە پرسەو ناشتنی ئامادەبوو.

د. ئەبدوسەتار تاهیر شەریف، دەڵێ: لە بتلیس 1892 هاتۆتە جیهانەوە، فەرماندەی شۆڕشی بۆتان بووە 1925، بانگەشەی یەکەم کۆماری کوردی کردووە، ڕووپێوی 960 کم2 .. لە ئەیلول 1930 بە دەستبەسەری چۆتە تاران، لەوێ ماوەتەوە تاکو 25 ئاداری 1976، ماتۆرسایکل شێلای.. لە مەزارگەی بەهەشتی نێژراوە، گیانی بە بەهەشتی بەرین شادبێت.

## جوگرافیای کوردستان – 1945 – 1958:

Geography is behind history

ئەگەر رەوابێو بڵێین، مێژوو بە راستی، سەرجەمو گردو کۆی جەمسەرەکانی چەرخو چاخو سەردەمی رابوردووبێت، بە کارەساتییەوە، بە کەڵەمێرانییەوە، بە رووداوەکانییەوە.. هەنووکەو ئیستەکەو سەردەمی نوێ، مەودای قووڵایی دەبەخشێت، بەو کارەساتانەو بەو رووداوانە، مەوداو لایەنو قوڵایی دووریش - رەهەند دەبەخشێت بە کەڵەمێردانی.

باسای ویستی خەباتگێڕ و تێکۆشەر، رەنگرێژو دانەرو بەرهەمهێنەرە و رەوتو رێڕەوی مێژووە، بە کردارو پێکهێنانو پرۆسەوە.

لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی، بە قووڵایی سەردەم، بە مەوداو لایەنی دووری - رەهەند چەرخەکەی، دەبێت بە جوگرافیای مێژوویی، کە لێکۆڵینەوەی جوگرافیایە بە 3 لایەنەکەیەوە.

**شوێن ، کات ، مرۆڤ.**

بریتییە لە 4 باسی بنەرەتیو بوومی:

1- گۆڕانکاری زەویو ژیان، لەسەرهەڵدانیەوە ئەمە جیۆلۆجیای مێژوویی و زانای گۆڕانکاری چارەسەریاندەکات... خاک، نیشتمان، زەوی، شانۆی کارەساتە مێژووییەکانە، مێژوو، شانۆگەرییە، جوگرافیاش شانۆیە.

2- گۆڕانکاری شانۆی جوگرافیایی سەردەم، کە بریتیە لە لێکۆڵینەوەی چەرخی چوارەم، تاکو گەیشتۆتە سەر بارودۆخی سەردەم، لە رووی فیزیۆگرافیو ئاووباو کەشەوە.

3- لە سەرهەڵدانی مرۆڤەوە، لە جیهانی ئاژەڵییەوە لەو گۆڕانکارییەیدا، هەر مرۆڤ خۆی، دروستکەرو بنیاتنەری کەڵچەرو ژیارو شارستانی بووە.. هەر خۆی خاوەنی بڕیاری گۆڕانکارییەکەیە، تاکو ئیمڕۆ و سبەینێش.

4- تێکەڵاوی جۆشو گونجاندنی مرۆڤ لەتەک ژینگەو دەڤەر بە بەرفراوانی واتاکانیەوە.

ئەمەيە شانۆگەريو شانۆ... هيچ جۆرە داستانو چيرۆكێك ناچێتە ناخى مێژووەوە، نەپساوەو نەبڕاوەو نە درێژخايانى كاتو چاخو چەرخو سەردەمەكەيناينێت، بە مەبەستى روونكردنەوەى چێوە مێژووييەكە، بەگشتلايى، كە دەچێتە ناو ئەو بازنەو سنوورەوە، كە رێبازى لێكۆڵينەوەكە، باوەش دەكات بە بوونو بوومدا، پەردەى لەسەر لادەداتو ئاشكراى دەكات.

جوگرافيا، پالپشتى مێژووە، كارەساتو رووداوى مێژووە، شانۆكەى خاكو ئاخو نيشتمانە، كە جوگرافيايە... مرۆڤ رەگەزى سەرەكى، هۆكارى بنەڕەتييە، لە ناو ئەو هاوكێشەدا، كە جەمسەرێكى زەوييە و جەمسەرەكەيترى چاخو چەرخە.

رەگەزى بڕياردەرو تەواوكەر، هەر مرۆڤ خۆيەتى، مێژوو بە تەنها، ناتەواوە جوگرافيا تەواوكەريەتى، هەر ئەمەيە هۆى نووسينى جوگرافياى كوردستان، چونكە كێشەى سەرەكيو بنەڕەتى ميللەتى كورد، پەرتكردنى خاكەكەيتى وەكو لەشێكى بێباڵو قۆڵو لاقو دەستو قاچى لێكراوە وايە، لەشێكى ناتەواوە خۆى لەسەر زەوى خليسك بۆ راناگيرێ، تواناى وەستانى نييە لەسەر هەردووپێ، راوەستاوبێت، ئەبێ بە هەر نرخێ بێت، تەقەلاو كۆشش بكرێت، بجەنگێين، خەباتبكەين بۆ يەكگرتنەوە، بۆ يەكخستنەوەى ئەندامانى ئەو لەشە ناتەواوەو دابڕاوە، بە مەبەستى يەكگرتنەوە، يەكيەتى.

بەو بڕواو بۆچوونە ئەم كارەم كردووە، 13 ساڵ بە پێ، گەڕان بە ناسنامەو پاسپۆرتى ساختەو درۆ گەڕاوم، قورو چلپاوى گوندو دێهات نييە كە بە پاشەڵمدا هەڵنەپڕژابێت، سەگى گوندێ نييە كە پێم نەوەڕيبێ، لە مزگەوتدا، نووستووم، دەريانكردووم، وتويانە تۆ دزى، تاوانبارکراوم، منيش نوێژمكردووە، وتوومە براكانم بە خوداى مەزن پياوى خراپو بەدكار نيم، بەيانى نوێژيان دەڕۆم.

لە 1945 – 1958، بۆ ئەمكارە گرنگە خۆم تەرخانكرد.

پەرتكردنى خاكى كوردستان، بەشكردنى، كێشەكەى ئاڵۆزكردووە، بە يەكگرتوو رەچاو ناكرێت، بە كەرتى گچكەو كەم دادەنرێت، سەوداو مامەڵەى نێودەوڵەتى هەر لەسەر ئەم بارە پەرتكراوەى، دێتەكايەوە، نەك وەكو لەشێكى

تەواو، بەڵکو وەکو مرۆڤێکی بێلاڤو بێباڵو بێدەست، سەیر دەکرێت، کێشەکەش هەر بەو چاوە دەبینرێت، بۆیە، هەرواماوەتەوە، گەرەکە بەر لە هەموو، یەکگرتنەوە رەچاوبکەین، دروشمو ئارمانجمان خۆییبوونو یەکبوون بێت، چونکە تاکو هەنوکە هەر کەرتوپەرتە، بۆچوونو تێڕوانندم بۆ ئەم یەکگرتنوو یەکبوونە، هۆی گەڕانمە بەدوای ئەم راستییەدا کە جوگرافیای کوردستانە، لە 1945 وە دەستم پێکردووە، تاکو 1958، هێڵی ئەتنی، ئەتەوایەتی، ئەتنوگرافیم بە گەڕانی مەیدانی، خۆم، ئەخشەم کێشاوە.. ئەم شوێنە خاکی کوردە، ئەو شوێنە کورد نین.. بەمجۆرە، ئەو ماوەیە، بە ئەداریو دەربەدەری بە راونراوی.

هەر ئەم بارودۆخەو رۆژگارە ناهەموارە بووە بەهۆی ئەمکارەم، ئەگینا ئازایەتی خۆمنییەو دلاوەری خۆم نەبووە، بەڵکو قارەمانی، رۆژگاربووە، هەر چەرخو چاخو سەردەمو زەمەن قارەمانە.

کەڵەمێر و هۆزانڤانو نووسەر دێنێتە کایەوە.. هونەرە بۆ دیواری قوڕو قوتیلە و چراو لامپاو دیوارکۆ، کە زانای وەکو شێخ محەممەدی خاڵو نالیو مەحویو کوردیو سالی پێکەیاندووە.

هەژاری، چەوساوەیی، ئەداری، ئەبوونی کە قانعی هۆزانڤانی گەیاندۆتە پلەو پایەی بڵند، ئەمریو دلاوەریو قارەمانێتی ئەوەیە کە ئەو دەرفەتە لە کیسنەدرێت بە فیڕۆ نەڕوات.

سەردەم، چەرخو چاخ هەمیشە فەرمانڕەوان، شێخ مەحمودی ئەمر نموونەیەکی بەرجەستەی، لە گۆڕەپاندا، بە چەند تفەنگێکی حسکەو جاملیزارو ژێرسافو مەعدەنو داداشو ماترلیۆ قەپاغلی، لە جەنگی دەربەند بازیاندا، قارەمانبوو.

هەر هەمان شێخ مەحمودی ئەمر، شاهی نشینی کورد، پیرەشێر.. ئوستاندار عومەر عەلی، بە پەلی سەربازو پۆلیس توانی شێخی ئەمر بە قوڵبەستکراوی بیهێنێ، بە پێپیلکەی سەرادا بە کۆمەکۆمە، بە پشتی کۆمەوە، مۆرو واژووی ئامادەبوونو ئارابوون بکات.. ئەمەیە چەرخو زەمەن، نووشستی، ئەهاتی رۆژگارە،

گەرەکە دۆستایەتی دوژمن بکەیت، هەر ئەم نەهاتییە، ئەم پەرتکردنە، کێشەی نێودەوڵەتی، لە ئاستی ئەم گرنگکوێرەیەی گەلی کوردا، لە بەرانبەر ئەم تەلیسمەدا، هەروەکو خۆی ماوەتەوە.

بەم ئومێدە نەمکارەمکردووە، کە ئەم جوگرافیایە بێت بە دەستووریاسا بۆ هەموو کوردو کوردستان بەو بڕوایە کە کوردستان یەکەو دوو نییە.. یەك میللەتیش هەیە، کە ئەویش کوردە.. خاکەکەی یەکپارچەی جوگراف لە یەکدانەبڕاوە، کەرتو پەرتنییە، گشتییە، لەسەر ئەم بنچینەیەش، سەوداو مامەڵەی لەسەر دەکرێت.. گشت، نەك کەرت... کێشەکە، یا گشتە، یا پەروەردەکەی نایەتە ئاراوە.

## چـــار: What is to be done?

ئەرکی سەرەکی هەموو نەتەوەییو نیشتمانپەرستو کورد پەروەرێك ئەوەیە کە بجەنگێو خەباتبکات، لە تەفەلاکردنو کۆشش درێخی نەکات، بۆ بەدیهێنانی خواستی نەتەوەیی گۆشەگیریو کەنارەگیری پەرپکاتو وەلاوەی بهێنێ، خود پەسەندی گۆربکات، شوێن رێبازو شەقامی شارێو گشتییەکە بکەوێت.

ئەم ئەرکە خۆی لە گوزارشتو دەربڕینێکدا دەبینێتەوە، سووربوونە لەسەر رامیاری کوردایەتی هاوبەش، کاری رەسەنە بۆ یەکخستنی چالاکییە نیشتمانییەکان بۆ یەکێتی خەباتی رزگاریخواز لە هەموو کەرتەکانی کوردستاندا.

بوونی رێبازی رامیاری کوردایەتی هاوبەش، پێداویستی کاتیو هاوچەرخە، رامیارییەك کە هەموو کورد لە کەرتەکاندا، بگرێتەوە.

بۆ ئەم مەبەستە گرنگە پیرۆزە، کۆبوونەوەی گشتی گەرەکە، نوێنەری هەموو لایەکی تێدابێت.. بۆ رەنگرێژیو نەخشەکێشانی رامیارییەکی هاوبەش، ستراتیژییەکی هاوبەش، بە ویستی نەتەوەیی بە پەلە، هەموو لایەنەکان بگرێتەوە، بە ئارەزووی میللیو خواستی نەتەوەیی میللەتی کورد، بۆ پێکهێنانی یەکیەتی نەتەوایەتی.

ئاشکراکردنی ئەم دروشمەی بۆ هەموو گەلانی جیهان سووربوون لەسەر ئەم خواستە، پیشاندانی وورەی بەهێزی میللەتی کوردە بۆ گەلانی دووورونزیك، بەجێهێنانی ئەرکو پێداویستییەکی نەتەوەییە، لەم بارودۆخەدا، لە رۆژگاری ئیمرۆدا.

بوونو رەسەنێتی ئەم ستراتیژییە هاوبەشە یەکگرتووە لەسەر بنەماو پایەگای پتەوو قایم، نەخشەکێشراو لە لایەن رەگەزە دڵسۆزەکانەوە، پێویستییەکی مێژوویییەو هەر بوونە، رۆژگاری کوردستان، هاواری بۆ دەکات، گەرمکیەتی بۆ

دانانی ئەو ستراتیژییە یەکگرتووە و پەیڕەوی بکرێت، یەکەم خواستو دوا خواستە.

لایەنە رامیارییەکان، بەرپرسن بەرانبەر بەمە بۆ رافەی ئەمە، بنوارە:

کوردستان و بزاڤی نیشتمانی کوردایەتی

سەلاح محەممەد سەعدوڵا،

چاپخانەی ئەهالی ، بەغداد، 1959.

کەواتە:

بۆ بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی،

بۆ یەکگرتن، بۆ رێکخستنی ریزەکانی گەل، بەمەبەستی یەکخستنی ستراتیژییەتی یەکگرتوو،

بۆ راگەیاندنی سەنتەری هاوبەش،

بۆ کوردستانیەتی پارتو کۆمەڵە رامیارییەکان،

ئەی برای کورد...

ئەوەی دەمانچە بە رابردووەوە بنێت،

دواڕۆژ تۆپی پێوە دەنێت.

ئەوەی کتێب هەتکبکات،

کتێب هەتکی دەکات.

گەلی بێکتێب، وەکو مرۆڤێکە چاوی بەستراوەتەوە،

تەماشای ئاوێنە دەکاتو خۆی نابینێ.

خودشکاندن، مەبەستێکە لەوە گرانترە کە

هەموو جیهان بە شیرو ئاگرو ئاسن داگیربکەیت.

غاندی

هەر بێشە کونانەیە کە واڵاو خاڵییە

لەبلدا پڵنگی خەوتووی تێدابێ.

بەدکار چ بەدییەکی دیوە لە چاکە، کە نایکا.

بەعلی

# پیرۆزگە

ژیانی تەمەنی 11 مانگی کۆماری کوردستان لە مەهابادە.

یادی کۆماری میللی کوردستان لە مەهاباد – سابلاغ – ساوقبولاق – کانیسارد بە پێشەوایی قازی محەممەد، ئەو کۆمارەی کە ساڵێکی نەخایاند، مافی کۆمەڵو سنوورو جێوەی پەیوەندییەکانی دیاردەکرد.

یەکەم کابینەی تێدا دامەزرا، دوای فەرمانڕەوایی دەوڵەتو مەملەکەتی شێخ مەحمودی مەزن – حەفید، کە بریتیبووە لە:

| | |
|---|---|
| حاجی بابا شێخ | سەرۆك |
| محەممەد حسێن خان – سەیفی قازی | شایاری بەرگری |
| مەناف کەریمی | شایاری فەرهەنگ – پەروەردە |
| سەید محەممەد ئەیوبییان | شایاری تە ندروستی |
| ئەبدوڕەحمان ئێڵخانیزادە | شایاری دەرەکی |
| ئیسماعیلاغا ئێڵخانیزادە | شایاری هاتووچۆ – گواستنەوە |
| ئەحمەد ئیلاهی | شایاری ئابووری |
| خەلیل خەسرەوی | شایاری کار |
| کەریم ئەحمەدیان | شایاری شارەوانیو پۆست |
| محەممەد ئەمین موعینی | شایاری ناوخۆ – ناوەکی |
| مەلا حسێن مەجدی | شایاری دادوەری |
| مەحمود وەلیزادە | شایاری کشتو چاندن |

کۆماری کوردستان – 2 ڕێبەندان 1324 هەتاوی، ڕێکەوتی 1946/1/22 دامەزراوە.

لە 1946/12/15 شکستی هێناوەو کەوتووە ڕێکەوتی 10 فروردین – خاکەلێوە 1326 هەتاوی.

پێشەوا قازی محەمەد، لە کۆڕی چوارچرای شاری مەهاباد، لەسێدارەدراوە، لە 30 مارس 1947، لەتەک سەیفی قازی، حەمە حسێن خان، سەدری قازی، ئەبولقاسم، برای پێشەوا.

بابمێنێ یادی لە بیرو هزرو مێشکی هەر هەموو کورد و ئازادیخوازو ڕزگاریخوازی بەڕێزدا[*]..

Karim Zand
هاوینی 1959

---

[*] پێداچوونەوەو پەسەند کردنی د. کامیل بەسیر.

لە ئەفسەران: عیزەت ئەبدولعەزیز ئامێدی، میرحاج ئەحمەد ئاکری، مستەفا خۆشناو، سەید عەزیز شەمزینی سەید ئەبدولا ئەهری، جەلال ئەمین بەگ، نوری ئەحمەد تەها، بەکراغا ئەبدولکەریم حەوێزی، خەیرولا ئەبدولکەریم، محەمەد سالح زاژلی فەقێ محەمەد ماوەت، محەمەد مەحمود قودسی، ئەبدورەحمان مفتی.

بریکاری ئەفسەر: شەوکەت نەعمان ئامێدی لە نیشتمانپەرستو، سەرانی خێلو رۆشنبیران، ژەنراڵ حەمە رەشید خان، زێرو بەهادر هەرکی میرزا سدیق، میرزا مەنگوڕی، پارێزەر هەمزە ئەبدولا، کەریم زەند، جەعفەر شێخ حسێن بەرزنجی، مەحمود ئەحمەد رەواندزی، محەمەد تۆفیق وردی، مەحمود مەجید، ئوسمان دانش شەریف، ئیسماعیل عارف، شێخ محەمەد ئەمین مەڵحە، فایەق مەحمود، قانع، ئەنوەر ئەبدولا، وجدی محەمەد بەگ.

بێگومان، میللەت رۆڵەی دڵسۆزی خۆی لەبیرناکات، لە سەربازانو دڵسۆزانیتر.

مەلا عەلی سوسی، کۆمەڵی هەقە، ئەحمەد ئیسماعیل، محەمەد ئەبدورەحمان، ئەبدولا سۆفی کەریم سەراج، ئەبدولا رەشید، عوسمان عەلی بەگ، مامۆستا ئەبدولقادر ئەحمەد هەولێری، مامۆستا جەمیل بەهادین ئامێدی، ئەسعەد عومەر، سالح زاخۆیی، سەعید فەرەج، شێخ عابد، مەغدید، لەتیف زەند، شێخ جەلال کاکەلاو، خۆیو 13 سەربازی هەلاتە، نامەی شێخ مەحمودی حەفیدی ئەمریان هێنابوو.

**شوێن:**

شـــەقای مـــەهابادە.. کۆمـــەڵی جوێجــوێ وەســـتاون.. چـــاوەڕوانی ڕەو و خۆپیشاندان دەکەن.. سێچوارێ لەتەکیەکدا وتووێژ دەکەن، بیرورا بەم ڕۆژە پیرۆزە دەردەبڕن.

- خوێندکارێ:

گـەلی کـورد لـە مێـژە، ڕاژەی زانسـتو زانیـاری کـردووە، لـە چـەرخی زەردەشتەوە، لەسەردەمی مـاد – میـدەوە، لـە چاخی گۆڕانکاری کۆمەڵگەی شــوانکارەییەوە بـۆ کۆمەڵگـەی کشتوچـاندنو چـێنگەو نیشـتەجێبوون.. بەڵگەش بۆ ئەوە زۆرە.. پاشماوانی ئەشکەوتی شانەدەر لای بارزان، چەرمۆ – چـەرمگ.. قەڵاچـەرمەڵە لای چەمچـەماڵ، ئەشـکەوتی هــەزارمێردی سلێمانیو زەرزی و قزقاپانی سوردەش.. کۆنترین مرۆڤـ نیانـدەرتاڵ، تێیـدا ژیـاوە.. ئـەمڕۆ، کـە کۆمـاری میللـی خۆمانـدی، گەرمکـە زۆر کۆششـو تەقەلابدەین بۆ ڕاژەی مەردوم.

- کـــوردێکی هـــەڵاتوو بـــە قاچـــێکی شـــەلەوە، وەســـتاوە، دێتـــە بـــەردەم خوێندکارەکەو دەڵێ: شۆڕشـی شـێخ سـەعیدی پیرانـو شـێخ ئەبـدولقادری ئەهری بەڵگەی خەباتمانە.. خۆشم لاقێکم لەسەر ئەمە داناوە.. ئەم کۆمارە ڕووناکی هەرهەمموو کوردانە.

- کارگەرێك، دێتە پێشەوە و دەڵێ: ئێمـەش تـاکو هەنووکـە چەوساوەبووین، بەڵام پەیدابوونی ئەم کۆمارە، دوارۆژێکی باشترو بەختەوەرمان دەبێت.

- جوتیارێك، دێتە بەرەوەو دەڵێ: تاکو ئێستەکە بەشخوراوبووین، تا ئیستە، لە سایەی کۆماری دیموکراتییەوە بووین بە خاوەنی زەویوزار.

- نووسـەر و بوێـژێ دەڵـێ: ئیسـتەکە دەتـوانین بـە سەربەسـتی بنووسـینو بدوێین.

رەوی سەربازو دانیشتووان لە خوێندکارو فێرکارو کارگەرانو ئافرەتانو ڕێکخراوان تێدەپەری، بە سروودی نیشتمانییەوە.. پێشەوای مەزن، بە بەرگی سەربازییەوە سڵاوی گەل دەسێنێتەوە.

دوای تەواوبوونی رەوەکە، پێشەوا، وتارێکی پێشکەشکرد..

گوێگرانی بەرێزو هێژا، جەوانانی بەهێز، سەرباز و پێشمەرگە قارەمانو دلێرەکان، سوپاسی بێپایان بۆ یەزدانی بەخشندەی میهرەبانو مەزن، کە رزگاربووین.. ئەم کۆمارەمان پێکهێنا، تاکو ئێستەکە لە مافی رەوای خۆمان بێبەریبووین، قوربانیمان زۆر داوە، مێژوومان خوێناوییە، بەڵام شۆرشی ئەمجارەمان بێخوێنرشتن جێگیربوو.. شۆرشی سپییە، یەکەم جارە لە مێژووی گەلەکەماندا بە بێخوێنرشتن، سەرکەوتن وەگیرکەوێ.

رۆیشتنم بۆ تاران لەتەك حەمە حسێن خانو شاپارانی ئازربیجاندا، وتووێژمکرد لەتەك سەرەك وەزیران نوخست وەزیر – ئاغای قیوام سەڵتەنە، بە جۆرێکی وەها پێکهاتووین کە سوودبەخشە.. لە بەندو برگەکانی پەیمانی نێوانمان:

1. ئۆتۆنۆمی، خۆفەرمانی، کوردستان لە ناو مەری ئێراندا، وەکو کۆماری ئازربیجان.
2. کشانەوەی سوپای ئێران لە هەموو دەڤەرو ناوچەکانی کوردستان.

وێرای ئەمانەش، دەربارەی جەنگی مامەشەو قارەمانێتی بارزانیو ئەفسەری دلێر مستەفا خۆشناو، گەشمردە و بەهەشتی، خۆشەوێ.. دوای چەپڵە.. مژدەیەکی خۆشتر.. لەتەك ئازربیجانی میللیدا، پەیمانمان بەستووە لە رووی جەنگیو رامیاریو ئابوورییەوە... چەپڵە

شوێن:

بارەگای ژەنەراڵ بارزانییە لە گوندی سەراو سەرچاوە.. سەرۆک بارزانی، لەتەک پۆدپۆلکۆنیک عیزەت ئەبدولعەزیزی فەرماندەی ڕۆخی سەقز، پۆدپۆلکۆنیک میرحاج ئەحمەد، دانیشتوون، پاسەوانێك بە چەکەوە لەبەر دەرکە وەستاوە، هەموو سەیری نەخشەی هێرشبردنە سەر شاری سەقز دەکەن..

سەرۆک بارزانی ڕوو دەکاتە کاک عیزەتو میرحاج، دەڵێ: پۆستەکانی نزیکی شاری سەقز باش قایمبکەن.. ئامادەبن بۆ هێرش بۆ سەر سەقز..

کاک عیزەت: بەڵێ ئەزبەنی..

کاک میرحاج: هێرشێکی دەمەگازی گەرمکە بەرینە سەر سەقز لە 25٪ زیانبدەین، هەر سەرکەوتووین..

ئا لەم کاتەدا، کاک نوری ئەحمەد تەها، مایۆر، بە بەرگی ئەفسەرییەوە دێتو دەڵێ: تەورێز گیرا، دانیشتووان هەموو سەرسامبوون..

سەرۆک بارزانی: چۆن تەورێز گیرا؟..

مایۆر نوری: بەڵێ ئەزبەنی.. بڕیار وایە سوپای ئێران بە ناوی هەڵبژاردنی نماینده بۆ پەرلەمانی نوێ، بێتەوە بۆ شارەکان بۆ پاراستنی هێوریو هێمنی و ئاسایش.. بەم بیانووەوە، دێتەوە، هەر 2 کۆمارەکە لەناو دەبات.

سەرۆک بارزانی: لە مێژەوە ئەم بڕیارەم بیستووە، لەو کاتەوە کە سەرۆکی شایارانی ئێران، ئەحمەد قیوام سەڵتەنە، بە فڕۆکە چوو بۆ مۆسکو لەتەك ستالیندا ڕێکەوتن بۆ لەباربردنی کۆماری ئازربیجانو کوردستان، کردنی و دانانی بە کارێکی ناوخۆیی..

کاک میرحاج: بەڵێ ئەزبەنی، جەعفەر پێشەوەری، سەرکۆماری ئازربایجان، لەمە ئاگادارەو نیازی کشانەوەی هەیە.

کاک نوری، ڕاست بێژی.

سەرۆک بارزانی: ئێمەش گەرمکە بکشێینەوە.

کاک میرحاج، ڕوودەکاتە سەرۆک بارزانی، دەڵێ: چۆن بکشێینەوە؟

سەرۆك بارزانی: 2 سەد مێری جەنگاوەر بەرە لەتەك خۆت، ژەنراڵ عەزیمی سۆڤیەتی لە میاندواو ببینە، ئەو نەخشەتان بۆدادەنێت.. گەرەكە ساینقەلا بگرن، تاكو بەبێ زیان بكشێینەوە.

كاك میرحاج، كەریم زەند، شێخ محەمەد ئەمین مەڵحە بە دووسەد جەنگاوەرەوە، بەرەو شارۆچكەی بۆكان دێن، لە میاندواو، دەچنە سەربازگە، بە جۆڵی دەیبینن، بڕیار دەدەن بچن بۆ مەهاباد.

**شوێن:**

شاری مەهابادە.. مەردووم، بە شەقامەكاندا دەڕۆن، بە خەماویو خەمگینی، ئاڵای كوردستان داگیراوە، كاك میرحاج، كەریم زەند، شێخ حەمەدەمین مەڵحە، دەچنە خزمەت پێشەوا، لە ماڵەوە، لەبەرە بەهانو نوێژی بەهانیدا، لەتەكیدا دێن بۆ بارەگا.

پێشەوا ئاوڕدەداتەوە، فرمێسك بە هەردوو چاویدا دێتە خوارەوە، كە جەنگاوەران دەبینێ، هەنگاوی كورتو سست دەبێت.. دەچنە بارەگا، شێخ حەمە ئەمینی مەڵحە، كەسی دووەم دوای بەرێز مامە رەزا، لە رێبازی هەقەدا، لەتەكیانە، پێشەوا لە شوێنی خۆی دادەنیشێو، رەوشبیران، كاك میرحاج، كەریم زەند، سەرانی خێڵ، لەو تەنگو چەڵەمەو گرژیو تەنگزەیەوە دەدوێن..

نوێنەری جوتیاران، دەچێتە لای پێشەواو دەڵێ: لەم بزاڤەدا، هەموومان بەشدارین، ئارمانجی دوورونزیكمانە، ژیانی ئابووریمان پێوە بەستراوە، من كە نماینەدەی جوتیارانم، پەیماندەدەم كە هەرگیز لێت جیا نابینەوە.

پێشەوا: ئاشكرایە كە باوەڕم پێتانە، ئێوە زۆرینەن.

كارگەرێك، دێتە لای پێشەواو دەڵێ: ئێمەش وەكو برا جوتیارەكان، شانبەشانی یەكتر، ئامادەین بۆ خۆبەختكردن لەڕێی رزگاریدا.

پێشەوا: خۆبەختکردن، لە ئێوە دوورنییە، چونکە پێڕەو و پرۆگرامی پارتی پێشڕەوی کوردستان بۆ ڕاژەی کارگەرانو جوتیارانو خوێندکارانو ئەرککێشو بەشخوراوو زەحمەتکێشانە.. هەر ئەم پارتییەیە، کە نوێنەری راستەقینەی میللەتە..

میرحاج: بەڕێز پێشەوا، فەرمانت بەچییە؟

پێشەوا: ئێوە منتان دانابوو بە پێشەوا، بەڵام، ئیستەکە، ئێوە پێشەوای منن، من سەربازی ئێوەم.

کاك میرحاج، بە سرپە پێیوتم: هەستە بڕۆین، بەرەو سەردەشت، بۆ خرکردنەوەو ئاگادارکردنی پۆستەکان.. شێخ حەمە ئەمین مەڵحە، لەتەکماندایە.

پێشەوا هەر لە بارەگایە، دەستەدەستە، ئەفسەرو سەرانی خێڵ دەچنەلای، وتووێژدەکەن بۆ چارەسەری کارەساتو ڕووداو.

سەرۆکی خێڵێك: ئێمەش ئامادەین بۆ بەرگی لە خاکو زەوی خۆمانو بابو باپیرانو باوانمان.

دوای لێکۆڵینەوە، ئەنجومەنو کۆمای جەنگ پێکهات.. باری جیهانو تواناو دەسەڵات ڕەچاوگیرا، بە تایبەتی هەڵوێستی سۆڤیەت، کە ناتوانێ یارمەتی بداتو کۆمەك بکات، لەتەك ئێران ڕێکەوتوون، کە ئەم کێشەوگرفتە، بە بارێکی ناوخۆیی دانراوە.

3 ڕۆژی تەواوی خایاند ئەم ڕاوێژە.

سەرۆك بارزانی دێتە لای پێشەوا.. پێشەوا لەبەری هەڵدەستێ، بە گەرمی لەتەك یەکدا دەدوێن.

سەرۆك بارزانی، ڕوودەکاتە پێشەواو دەڵێ: چی بکەین؟

پێشەوا: بڕیارمداوە لە میللەتو نەتەوەی خۆم دوورنەکەومەوە، لە خۆشیدا لە تەیکاندابووم، لە ناخۆشیشدا هەر لەتەکیاندام... جەعفەر پێشەوەری، بروسکەو تەلەگرافی بۆ ناردووم، کە بکشێمەوە بەرەو سنووری سۆڤیەت.. بەڵام گەرەکە من لەم خاکە دانەبڕێمو تێیدا بنێژرێم.

سەرۆك بارزانی: ئێمە ناتوانین خۆمان راگیرکەین، کاتێك دوژمن دێتە ناو شارەکانی کوردستانەوە، لەبەر ئەوە، دراوو چەك، چیەهیە بۆ ئێوە، کە دەجەنگێن بۆ هاتنەدی خواستو ویستی گەلی کورد.

پێشەوا: زۆر بەجێیە، بچن دراوو چەك چیەهیە لە گەنجینە وەربگرن، وا ئالآی خەباتو تێکۆشانی دانەبڕاوو درێژ خایانم بە بارنتە دایە دەستان، دەستی پیرۆزی سەرۆك بارزانی، لە پێشینەوە بۆ پاشینە، بتمانەی میللەتن.

سەرۆك بارزانی: وا دیارە هەر لەسەر بڕیاری خۆتان شێرگیرن؟

پێشەوا: بەڵێ، بەڵێنم بە میللەتداوەو، سوێندم خواردووە کە لە خۆشیوناخۆشیدا، لە تەکیاندا دەژیمو دەمرم، ئازارو زیان لەسەریان هەڵدەگرم.

سەرۆك بارزانی و پێشەوا، دەست دەخەنە ناو دەستی یەکەوە، جوێدەبنەوە.

سەرۆك بارزانی: هەر پێشەوامانی، مەزنا میللەتی.

پێشەوا: وا ئالآی خەباتو شۆڕشی بێوچانی میللەتی کوردم بە بارنتە دایە دەستان، ئەی ژەنەراڵ بارزانی قارەمانو دلاوەر، ئێوە بە راستی پێشەواو سەرۆکی گەلو نەتەوەی کوردن.. هەر بژین بۆ کورد، هەر بژین بۆ کوردستان..

**شوێن:**

دیوەخانی پاشاخانو قولیخانی سەرلنی خێڵی قەرەپاپاخە لە شارۆچکەی نەغەدە.

قولیخان، لەتەك سەرهەنگ غەفاری و چەند ئەفسەرێکی ئێران دانیشتوون، وتووێژدەکەن، دلوای سەرۆك بارزانیو خودلنی بارزان شێخ ئەحمەد بارزانی دەکەن. لەم کاتەدا بەرێز سەرۆك بارزانی دێتە ژوورەوە، هەموو لەبەری هەڵدەستن، خۆشهاتنی لێدەکەن.

سەرهەنگ غەفاری، ڕوودەکاتە سەرۆك بارزانیو دەڵێ: من فرستادەی ئالا حەزرەت شاهەنشاهم، خودی شاهەنشا پەرۆشە بۆ خانەوادەی بارزانی، بە تایبەتی شێخ ئەحمەد بارزانی، گەرەکە بیبینم.

سەرۆك بارزانی: بەڵێ ئاغای غەففاری.. بانگدەکاتە حەسۆ، نامەیەك بۆ بەڕێز شێخ ئەحمەد بەڕێدەکەن، داوای هاتنی لێدەکەن.. حەسۆ دەڕوات بۆ شنۆ، نامەکە دەبات بۆ خودانی بارزان، بەڕێز شێخ ئەحمەد.

شەو کاتی نووستن دێتو بڵاوەی لێدەکەن.. بۆ شەوی دوایی، هەمان دیوەخانە، بەڕێز شێخ ئەحمەد دێت، هەموو لەبەری هەڵدەستن.

سەرهەنگ غەففاری: خۆشهاتی ئاغای شێخ ئەحمەد.. هەمایۆن شاهەنشا دەیەوێ، دەخوازێ نوێنەرتان بنێرن بۆ لای، لەو بڕوایەدایە کە بارزانیان خێڵێکی جەنگاوەرو قارەمانن، لەیەك ڕیشەو نەژادێکین.. فەرمان بفەرموون کە لەتەك بارزانیدا بەرەو تاران بچین.. هەر خواستێك هەبێت دەیگەیەنین بە بارەگای ئاغای نوخست وەزیر قیوام سەڵتەنەو سپاپۆد عەلی ڕەزمارا، فەرماندەی گشتی ئارتەش.

بەڕێز شێخ ئەحمەد: بارزانی، هەرە لەتەگیدا.

بەڕێز سەرۆك بارزانی: ئەز بەمنی بچم؟

شێخ ئەحمەد بارزانی: بەڵێ.

سەرۆك بارزانی لەتەك سەرهەنگ غەففاریو میرحاج ئەحمەدو عیزەت ئەبدولعەزیز و نوری ئەحمەد تەها، بەرەو تاران دەڕۆن.. 40 ڕۆژێ خایاند، سەردانەکەیان.

دووبارە دیوەخانی سەرانی خێڵی قەرەپاپاخە لە نەغەدە.. کەریم زەند ئامادەی هەر هەموو کۆبوونەوەکانە، لەو دیوەخانەی شارۆچکەی نەغەدە.

هەر هەمان دیوەخانە، دوای گەڕانەوەی سەرۆك بارزانی لە تاران.. دیوەخانی پاشاخانو قولیخانە، سەرانی خێڵی قەرەپاپاخ.

سەرۆك بارزانی، لەتەك سەرهەنگ غەففاریو میرحاجو عیزەت ئەبدولعەزیزو نوری ئەحمەد تەهاو حەمە ساڵح زازێڵیو جەلالی ئەمین بەگو گەلێکیتر لە ئەفسەرانو خەباتگێڕان، لەتەك چەند ئەفسەرێکی ئێران گفتوگۆ دەکەن.

سەرهەنگ غەفارى: سبەينێ هەنگى سوارە بەرەو نەغەدە دێت.

سەرۆك بارزانى: بەڵێ دەزانم ئاغاى غەفارى.

سەرهەنگو ئەفسەرانى ئێران بڵاوەى لێدەكەن.. سەرۆك بارزانى لەتەك شێخ سلێمان بارزانى و ئەفسەرە كوردەكان، دەڕۆن بۆ پۆستى سلێمان بەگ، لەوێ راوێژدەكەن.

سەرۆك بارزانى: سبەينى 1700 سوارەى ئێران دێنە نەغەدە، تەگبیر چییە؟ دەبێ ئیمشەو بیبڕێنینەوە.

شێخ سلێمان: وا باشە نەغەدە بەجێبهێڵین بەرەو سنوورى رووسیا بڕۆین.

هەموو پەسەندیانكرد، كشانەوە بەجێیە..

كاك عیزەت ئەبدولعەزیز: ئەمە نەخشەیەكى سەربازییە، پشتمان گەرمكە قایمبێت.

بەو شەوە، دەڕۆنو خۆیان ئامادەدەكەن.

**شوێن:**

دادگاى ئێرانە..پێشەوا، لە ركەى ئاوانـدا وەستاوە، زنجیرو كۆتى لەبیدایە، پاڵتۆیەكى سەربازى، خاكى، لەبەردایە، مێزەرى سپى بەسەرەوە.

سەرۆكى دادگا، روو دەكاتە پێشەواو دەڵێ: ناوت.

پێشەوا: قازى محەمەد.

سەرۆكى دادگا: كارت.

پێشەوا: رابەرى پارتى دیموكراتى كوردستان.

سەرۆكى دادگا: تۆ، رەهبەرى پارتى دیموكراتى نیت. تۆ، كوڕەى مەحمودیانى بازرگانى مەهابادیت.

پێشەوا: ببەخشە، من كوژەرى دوژمنانى گەلى كوردم.

سەرۆكى دادگا، روو دەكاتە نماینەدەى گشتى دەڵێ بفەرموو.

نماینـدەی گشـتی: گـوێگرانی هێـژا، رەنگـە نـەزانن چـۆن خودفـەرمانی کوردسـتان پێکهات، پـێش دامەزرانـدنی کۆمەڵە، بێـزاری مـەردوومی مـەهاباد، بـە تایبەتی قازی محەممەد، لە رەفتارو کردەوەی فەرمانداریکی ناپەسەند.. دەستکرا بە دامەزرانـدنی پێکهاتـەو بناغـەی ئـەم مەبەسـتە، دوای راوێـژو دیتنـی ئـاژاوەگێران، چوونی قازی محەممەد بۆ تاران، گوێنەگرتنی میری لـە خواستو سکاڵای دانیشتوان، گەرانەوەیان بە بێسوودی، لەم هەڵوێستەی میری، رقیان هەسـتاو راگـردوو، بێکارە، کۆبوونـەوە، پـەلاماری فەرماندارییانـداو لایـانبرد، بـە کۆمـەکی بێگانـە – بیـانی، نەخشەی خودموختاری کوردستان کێشراو قازی محەممەد ئەم ئاگاهیەی‌دا، لە شاری مەهاباد.

رۆژ بـە دوای رۆژ، پەرەیانسـەند، چـەکو جبەخانـەو ئازوخـەیان لـە بیـانی وەرگرت، لە پردی سوورەوە لە رۆژی 2 مانگی بەهمەن، رێبەندان 1324، هەتاوی، رێکەوتی 22 ک2 1946، قازی محەممەدو سەرانی خێڵو سەرۆك بـارزانی بـانگکرد بۆ شاری مەهاباد، بانگی دامەزراندنی کۆماری میللی کوردستاندرا و ئاڵایان هەڵکرد لە 26 ک2 1946، شاهەنشاهێتی نیگەرانبوو بـە سـازکردنی ئـەم گەردنـە، بـەڵام کـوردان، نیشتمانپەرسـتوو پەیوەنـدن بـەم خاکـەوە، لـە بیـانی دوور دەکەونـەوە.. هەموو شاهنامە دەخوێننەوە، لەبەر ئەوە داوا کارم لە دادگای سوپای دلێـری ئێـران کـە فەرمانبـدا بـە برینـی سـەری قـازی ناپـاکی بـەکرێگیراو، پابەنـدە بێـت خـاکی ئێران... زیندووبێت باڵا بەرێز هەمایۆنی شاهەنشا.. بمرن نیشتمانفرۆشان.

پێشـەوا، بـو هـیچ جۆرێـك دان بـەم دادگایـەدا نـانیم، چـونکە دادگایـەکی رووکەشە.. ماوەمبدەن، کە گومرایی نمایندەی گشتی دەربخەم.

سەرۆکی دادگا: هیچ مافی دادکۆکییت نییە، تۆ تاوانباریت.

سەرۆکی دادگا، فەرمانەدات بە بردنی پێشەوا... پێشەوا، دەچێتە دەرەوە، ئەنـدامانی دادگـا راوێـژ دەکـەن، پـاش نـەختێ، پێشـەوا دێنـەوە نـاو رکـەی تـاوان، سەرۆکی دادگا.. فەرمانی خنکاندنی دەخوێنێتەوە..

- رای گەل، رۆژنامەی هەفتەیی، رامیاری، سدیق بلوکینی، 1959، کەرکوک، جەمیل رۆژبەیانی، هاوکاری بوو.
- هیوای کوردستان، گۆڤاری هەفتەیی، یەکیەتی خوێندکاران، سلێمانی، 1959، 12 ژمارە.
- رۆژی نوێ، سلێمانی، پارێزەر جەمال شاڵی، کامەران موکری، محەرەم محەمەد ئەمین، د. ئیحسان فوئاد، کەریم زەند، ئەبدوڵا ئەزدەر، 1960، 18 ژمارە.
- بروا، رۆژنامە، پارێزەر کەمال میرزا کەریم، سلێمانی، 1960.
- دەنگی کورد، رۆژنامەی رامیاری، ئومەر جەلال، بەغداد، 1960.
- رووناهی، گۆڤاری هەفتەیی، کرمانجا ژووری، حافز مستەفا، 1960.
- ئیراقی نوێ، گۆڤار، مانگانە، وێنەیی، راگەیاندن، بەغداد، 1960.
- چارەسەری کشتوکاڵ، گۆڤاری مانگانە، شایارێتی کشتوکاڵ – چاندن، بەغدا، 1960.
- کوردستان، رۆژنامەی رۆژانە، رامیاری، بیرمەند مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و هەڤاڵی خەباتگێڕ مام جەلال تاڵەبانی، 1961، 5 ژمارە.
- ئەدەبی عیراقی، گۆڤاری وێژەیی، نووسەران، 1961، تەنها یەك ژمارە.
- ژیان، گۆڤاری دەوری گشتی، یەکیەتی خوێندکاران، هەولێر، 1961، 2 ژمارەی دەرچووە.
- هەولێر، شارەوانی هەولێر، 1962.
- توتن، گۆڤاری وەرزی، 1963.
- راپەرین، ئەبدولعەزیز تالبی، 1964، لە سلێمانی، تاکو 1967.
- دەنگوباس، رۆژنامە، محەمەد بریفکانی، بە عەرەبی، بەغداد، 1966.
- سلێمانی، گۆڤاری شارەوانی، 1968، محەرەم محەمەد ئەمین، جەمال شاڵی، نوری وەشتی.
- کاری گەل، هەرموز، بەغداد، 16 ژمارە.

- رزگاری، هەفتانە، نەوشیروان مستەفا، شازاد سائب، 1969، 15 ژمارە لە سلێمانی.
- رووناکی، رۆژنامە، حیلمی عەلی شەریف، عومەر مستەفا 1969، 2 ژمارە.
- بەیان، گۆڤار، 1969، بەغداد.
- هاوکاری، رۆژنامە، 1970.
- برایەتی، گۆڤاری نیومانگی، حەبیب محەمەد کەریم، عەلی ئەبدولا، سەرنووسەر، 1970.
- دەفتەری کوردەواری، د. مارف خەزنەدار، جەمال خەزنەدار، 1970.
- زانیاری، گۆڤاری زانستی گشتی، 1970، وەرزی، د. عەزیز ئەمین، تەلعەت نادر، نوری ئەمین، سەرنووسەر، سکرتێری د. ساماڵ مەجید فەرەج.
- ژین، رۆژنامەی وێژەیی، هەفتەیی، لە سلێمانی، چاپخانەی کامەرانی، کاکەی فەلاح، ئەبدولقادر بەرزنجی.
- هەولێر، گۆڤاری شارەوانی هەولێر، 1970، محەمەد مەولود مەم، سەعدی محەمەد ئەمین دزەیی.
- دەنگی مامۆستا، گۆڤاری مامۆستایانی کوردستان، سلێمانی، 1971.
- روانگە، گۆڤاری دەوری، نەجەف، 1971.
- چیا، بە کرمانجا ژووری، 1971، بەدرخان سندی.
- نووسەری کورد، گۆڤاری نووسەرانی کورد، د. مارف خەزنەدار، بەغداد، 1971.
- پەروەردەو زانست، گۆڤاری زانیاری، وێژەیی، بەغداد، 1971.
- رۆژی کورد، گۆڤاری رۆشنبیری گشتی، مانگانە، ئارەبیو کوردی.
- کۆمەڵی زانستی کوردی، سەیدا ساڵح یوسفی.

## رۆژنامەنووسیو، پێگەیاندنی هوشیاری نەتەوەیو بزاڤی رزگاریخوازی کورد

❁ **1513**، جەنگی چالدێران – ڤالدێران – چالدەران، جەنگی نێوانی شای سەفەوی ئیسماعیل، سوڵتانی ئوسمانی یاوزو سەلیم، سەرکەوت.

جەنگی دابڕان، بەشکردنو پەرتکردنی خاکی کوردستان، هۆکاری نایەنزایی، خاڵی وەرچەخان، لە مێژووی میللەتی ستەمدیدەی بێبەش و بەشخوراو.

کاریگەریو هۆکاری بەشبوون، براکوژی، خۆکوژی، دووبەرەکی، نایەنزایی، ئاڵۆزی باری نەتەوەیی.

جـەنگی قـەڵای دمـدم، 1608/2/5، نێـوانی میرخـان یەکدەسـت – لەپزێڕین، شا ئەباس سەفەوی، نیشانەو نموونەی بەرجەستەیی.

❁ **1639**، پـەیمانی زەهـاو، پـەرتکردنی کوردسـتان، چـەرخی مـرادی 4، شا ئیسماعیل سەفەوی تاکو 1917، جەنگی یەکەمی جیهان، 1914-1918.

پەیمانی سایکس بیکۆ، 1916، بڕیاری بەشـکردنی وڵاتـانی ئوسمـانی، پیاوە نەخۆشـەکە – Sick man، ئـاگربڕی، مـۆدروس، 1918/10/30، نێـوانی هاوپەیمانانو تورکە خۆبەدەستدانەوەی ئوسمانی.

پەیمانی مارس، 1921، بریست لیۆتیسک، خۆراوای کاپکاس، گەڕایەوە بۆ تورکیا.

سەدەی 16، 17، گەرتکردنی کوردستان، لە نێوانی تورکیاو ئێران.

❁ **1918**، بڕیـاری کۆمـەڵی گـەلان – Nations league، ژمـارە 77، رۆژی 1925/12/16، هـەرێمی کوردسـتانی باشـوور، کـەرتی باشـوور، لکـا بـە ئیراقەوە.

## بزاڤی رزگاریخوازی کورد:

**سووڕی یەکەم:**

سەدەی 19، جەنگی یەکەمی جیهانی، ئامانجی رزگاری خاکی کوردستان بوو، لەدەست داگیرکەران، شەقڵی نەتەوەیی دروست، بەڵام سەرکردایەتی تاکەکەسی.

1- شۆڕشی ئەبدوڕەحما پاشای بابان، 1806 – 1808.. میرنشینی بابان لە نێوانی بەرداشی ئێرانو ئوسمانیدا.. جاڕی سەربەخۆیی، بەرەنگاری دوژمن پەیدەرپەی نەگەیشتن بە ئاواتی دامەزراندنی دەوڵەتی بەهێز.

2- شۆڕشی ئەحمەد پاشا بابان، 1812.

3- شۆڕشی کوردی زازا لە سیواس، 1820.

4- شۆڕشی میر بەدرخان، لە جزیرە، 1821 – 1847.. بنکەی میرنشینی بۆتان، بانگەوازی یەکیەتی، گشتی کوردستان، لە نێوانی میرنشینەکاندا، یەک سوپایی، دەرکردنی دراو – پووڵ، سەربەخۆییبوون، فراوانی دەستەڵات تاکو دیاربەکرو گۆمی ورمێو کەناری مووسڵ، جەنگی لەتەك لەشکری ئوسمانیداو شکستی دوای 8 مانگ.

5- شۆڕشی کوێر محەمەد پاشا، میری گەورە، رەواندز، 1826 – 1833، ئامانجی رزگاری، خۆییبوون، جودایی، جیابوونەوە، لە ئوسمانی، 1830، فەرمانڕەوایی هەولێرو بادینانو هەکاری.

6- شۆڕشی کوردی شەنگار 1830 – 1833.

7- شۆڕشی میر شەرەفخانی بتلیسی 1834.

8- شۆڕشی عیزەدین شێر، 1853.

9- شۆڕشی کەنعان پاشا و ئوسمان پاشا 1879.

10- شۆڕشی شێخ ئوبێدیلا شەمزینی 1880 – 1881.

11- شۆڕشی کوردی مووسڵ، ئەرزوروم – بتلیس 1907.

12- شۆڕشی مەلا سەلیم و شەهابەدین لە بتلیس 1907.

**سووڕی دووەم:**

نێوانی دوو جەنگە مەزنەکە 1914 – 1918 - 1939 – 1945.

شۆڕشی حەفید مەحمودی نەمر، بڕانەوەی جەنگی جیهانی بڕیاری بەریتانیا و ناگربڕی مۆندرۆس و پەیمانی سیڤەر، گۆڕکردنیو گۆڕینی بە پەیمانی لۆزان و کێشەی مووسڵ و چۆکدانی تورکیاو میری ئێراقو دانانی شا فەیسەڵی یەکەم و شکستی کوردو کێشەی ئاسووری.

1- شۆڕشی کوردی خاوەر بە سەرکردایەتی سمکۆ شکاك 1920 – 1930، کوشتنی بە پیلانێکی گڵاو، رۆژنامەی سەردەمی.

2- شۆڕشی کوردی باکور، بە سەرکردایەتی شێخ سەعید پیران، کۆمەڵەی بەرزی کوردستان و داوای مافی چارەنووسی 1925.

3- شۆڕشی ئاگری، رووداوانی ئارارات، 1926 – 1930، کۆی هێزی کوردو جاری شۆڕش و سەرکردایەتی کۆمەڵەی خۆیبوون و فەرماندەیی ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا و نیسکۆ و شکستی و دەستبەسەری ئەو فارەمانە لە تەهران و کوشتنی لە 1976.

4- شۆڕشی بارزان، لە 2 سووڕدا، سەرهەڵدانی لە شێخ تاجەدین، راگری شێخانی بارزان، دەفەری زێبارو کۆتایی بە لەسێدارەدانی شێخ ئەبدوسەلامی دووەم لە لایەن دەستەڵاتی ئوسمانییەوە 1914 لە مووسڵ.

خێڵەکانی بارزان: شێروانی، مزوری، بەرۆژی، دۆڵەمەری، سەختی دەفەری بارزان.

5- شۆڕشی کوردی خاوەر بە سەرۆکایەتی جافرسان سوڵتان 1931 – 1932، بەرگری گەلی کورد لە ئێراق 1930، رۆژی رەشی شەشی ئەیلول 1930.

6- شۆڕشەکانی کەرتی باکور، لە دیاربەکرو دەرسیم 1934 – 1937.

**سووڕی سێیەم:**

دوای جەنگی 2 ی جیهانی 1939 – 1945، شەقڵو مۆرگی رزگاریخوازی دیموکراتیو نەتەوەیو مرۆڤایەتی سەرکردایەتی بارزانی نەمر مستەفا، 1943، تەواوکەری زنجیرە شۆڕشەکانی کورد و کشانەوەی بۆ کەرتی خاوەر 1945، دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد 1946، رۆڵی پێشەوا، قازی محەممەدی نەمر.

**پوختە:**

چاوگی ئاگری شۆڕشەکان، سەراپا، پەرەی رۆژنامەکان هەر لە بنەڕەتدا و کەرەستەی رۆژنامەکانە.

خۆی لە شریخەی جەکی سەرشانی شۆڕشگێڕاندا، لە بریسکانەوەیەکدا دەبینی، هێزو وزەو گوڕ وەردەگری.. لە دەرفەتی رەخساو و دەرفەتی سەنراودا، لە پانۆرامای گردو کۆی کۆششو خەباتو تێکۆشانی بابو باپیرانەوە بۆماوە بۆ نەوەی نوێ و وەرگرتنی ئاڵای تێکۆشانو شۆڕش لەوانەوە، دەنو وەرگرتن بە بارنتەیی بۆ ئەوەو نیژە.

ئەم ئەرکە مەزنە بە دەستەڵاتی چوارەم، رۆژنامەکان سپێردراوە، ئەوە دوای ئەوە هەر لە 1898ەوە لە یەکەم رۆژنامەنووسی کوردەوە، میر مەدحەت بەگ بەدرخان، لە میسر، قاهیرەوە، رەنگدانەوەی بۆ هەموو کەرتەکانی کوردستان، درێژەی بۆ سەردەمی نوێ.

رۆژنامە، رۆشنبیرییە، هوشیاری نەتەوەییە، پیرۆزە، زمانی پاکو خاوێنو بێگەردی گەرمکە.

هەموو رۆژنامەیەك، شۆڕشێکی بەرپا کردووەو هەموو شۆڕشێکیش، رۆژنامەیەکی لە پاڵدا بووەو پاڵپشتی بووە، هەردووکیان تەواوکەری یەکترن.

دراو و پولێکە دوو رووی هەیە.

**چاوگ:**


- سجادی ئهلائهدین، مێژووی ئهدهبی کوردی.
- د. خهزنهدار مارف، مێژووی ئهدهبی کوردی.
- زهند کهریم، بزاڤی کوردستانو ئازربیجانی رزگاریخواز – حركة كوردستان و آذربيجان التحررية، مطبعة كامراني 1959، السليمانية.

# مافی چارەنووسی کورد
# پێش مافی مرۆڤە

سیناتۆر کلیبۆرن پێل
سەرۆکی لیژنەی دەرەکی کۆمای پیرانی ئەمریکا
و. کەریم زەند

ئەو جیهانەی کە ئێمە تێیدا دەژین، لە تەک کێشەکانی مافی مرۆڤدا، جۆشی خواردووە، لە کاپیتۆڵ واشنتۆنەوە، کە شوێنگەی کۆنگرێسو رێبەرێتی ئەمریکی گرتبێتەوەو بایەخی پێدابێت، بەڵکو لە هەموو هەڵوێستێکی ئاسایی ئەمریکیدا بەدیدەکرێت.

لە کەمبۆدیاوە تاکو سەلفادۆر، لە باشوری ئەفریکاوە تا وڵاتی تیبەت، لە نووسینو وتووێژو ئامۆژگاری دامێندەکانیاندا بۆ گەلاڵەی کاری چالاکی میری لە بواری مافی مرۆدا و رەنگدانەوەی دەستێوەردان لە کاری کۆمەڵە و رێکخراوەکاندا، وەکو رێکخراوی لێبوردنی دەوڵەتی، یا لە کاردانەوەی وێنەکاری تەلەفزیۆنو رۆژنامەکاندا، کە ئەگاتە ناو هەموو خێزانو خانەوادەکانی ئەمریکی.

کاردانەوەی هاوچەشن لە کوشتنی سەدان خوێندکار لە گۆڕەپانی تیانانمین و دەڤەری لە لایەن سوپای چینی میللییەوە.

کەمبایەخدان بە چارەنووسی 27 ملیۆن کورد، لەلایەنی ئەمریکاو خۆرئاوایەکانەوە.

مافی مرۆڤ بە گوێرەی کوردەوە مەترسی کەمترە لەوەی تایبەتە بە گەلانیتر لە هەندێ وڵات، کورد بەشخوراو و بێبەشە، لە مافی ئاخاوتن بە زمانی زگماکی و قەدەغەی خوێندن بە زمانی دایک، چەوسانەوەو راونانو کوشتن، پەلی هاوێژتووە بۆ ئەوروپا.

تیرۆر له‌ ئێراق، ئازارو ئه‌شکه‌نجه‌و کاولکاری، وێرانکاری گونده‌کان، کوشتنی به‌کۆمه‌ڵو کۆکوژیو قڕان به‌ چه‌کی کیمیاوی قه‌ده‌غه‌کراوی نه‌ته‌وانی، ده‌وڵه‌تی 60 ساڵ له‌مه‌وبه‌ر.

کێشه‌و دۆزی کورد، گه‌رمکه‌ بخرێته‌ پێشه‌وه‌.. هۆکاری دواخستنی ئه‌م دۆزه‌، که‌مته‌رخه‌میو سه‌رقاڵی ده‌وڵه‌تانه‌، به‌ تاڵانکردنی سامانی وڵاتانی خاوه‌ن نه‌وتو سامان.

گه‌لی کوردیش، له‌و بازنه‌یه‌دایه‌.

ئه‌م کۆنگره‌یه‌ به‌رجه‌سته‌ی کۆششی مێژووییه‌ بۆ بایه‌خدان به‌ کورد...

منیش به‌ شانازییه‌وه‌ به‌شداریم، وێرای رابووردووم و گشت ئه‌مریکیو ئه‌وانه‌ی پابه‌ندی پۆلیتیکی ده‌رموه‌ی ئه‌مریکان.

ئه‌وه‌ی کاسیکردووم، پێش ساڵێک لیژنه‌یه‌ک پێکهاتووه‌ بۆ لێکۆڵینه‌وه‌ی جه‌نگی که‌نداو، ئێران – ئێراق، دوای کاره‌ساتی راگوێزانی کتوپڕی، تاڵانی، ئه‌نفال، ده‌یان هه‌زاران کوردی ئێراق، هه‌واڵی به‌کارهێنانی چه‌کی کیمیاوی بوو، که‌ بێگومانم له‌ راستی ئه‌مه‌.

یه‌کێ له‌ ئه‌ندامانی ئه‌و لیژنه‌یه‌، خۆراوایی‌بوو، دیدهنی کوردستانی ئێراقی نه‌کردووه‌.

ئاماژه‌ی وێرانکاری سه‌دان گوندی کورد به‌ چه‌کی کیمیاوی رژێمی دژی کورد، دوور له‌ مرۆڤایه‌تی له‌ 7 سێپتێمبه‌ر، کاری کۆمای پیرانی ئه‌مریکی، دوای خولی ناوه‌ندی، وه‌رزی هاوین، رۆژی دوایی بڕیاری S2 763، دژی قڕانی کورد و سزای توندی ئێراق.

له‌ 9ی سێپتێمبه‌ر، کۆمای پیران، به‌ گشتی ده‌نگیدا، کێ له‌ ئێوه‌ ئاگاداری میکانیزمی یاساییمانه‌؟

گوڕی ئه‌م بڕیاره‌ هه‌روا ئاسایی نه‌بووه‌ به‌ گوێره‌ی کۆماوه‌.. ئه‌م ده‌نگدانه‌، ره‌نگدانه‌وه‌ی بێزاری هاوڕێکانمه‌ و گرنگیدان به‌ سستی جیهانییه‌وه‌ به‌رانبه‌ر به‌

چەكی كیمیاویو بڕیاری سزادانی ئێراق، دوو جار هاتووچوو لە كۆمای پیرانو كۆنگرێسدا، هەرچەندە سووڕەكەی كۆتایی هاتو پەسەندیش نەكرا بەداخەوە.

نوێنەران نائومێدبوون، ڕێسای یاسایمان، ئاڵۆزە بۆ وەرگرتنی ئەنجام وێرای پەسەندكردنی كێشەكە، تەقەلای ساڵی پار، ئیمساڵ دەخرێتە بەرچاو، بڕیاری S. 195 ، قەدەغەی چەكی كیمیاوی 1989، دابڕینی گشت پەیوەندییە ئابوورییەكانی ئەمریكا و ئەو دەوڵەتەی كە چەكی كیمیاوی بایۆلۆژی بەكاربهێنێت، یاسای دەوڵەتی پێشێل بكرێت.

10 ڕۆژ دوای بڕیارەكە، كۆششمان بۆ بنیادنانی تەقەلای پار، نامەیەك بنێرێت بۆ ڕژێمی ئێراق، ئەمریكا هێزێكی ئابووری مەزنە و یەكەم هێزیش نییە، گەرەكە مەترسی لەو هێزانە بكەین كە چەكی كیمیاوی بەكاردێنن.

بەبێ ئەمە كارەكە بێسوودە.

لەبەر ئەوە ئامۆژگاری هاوڕێیانی ئەوروپیو ژاپۆنی دەكەم، كە ئەمە ڕەچاو بكرن.

كێشەی چەكی كیمیاوی، گەرەسە ئامادەیە بۆ تیشكخستنەسەر سەوداو مامەڵەی نامرۆییەوە دەربارەی كورد.

ئەمە نە تەنها قورسایی لەسەر ئەم كێشەیە هەیە، بەڵكو تەبایی بەردەوامی و وروژاندنی دۆزی كوردە.. ئیمساڵ پرۆژەی داواكردن لە سەرۆك كە مامەڵەی كوردی ئێراق، كە نموونەی ئاشكرای پێشێلكردنی مافی مرۆڤە، كە كۆمەڵگەی دەوڵەتی بڕیاری لەسەر داوە.. ئێراق، گەرەكە ملكەچی هەموو جۆرە سزاكان بێت، بە گوێرەی یاسا.

وروژاندنی دۆزی كورد، سەراپایی جیهانی بێت، بە ئومێدی دانانی لە خشتەی كاری لیژنەی مافی مرۆ لە نەتەوە یەكگرتووەكاندا، پێش هەمووان بێت.. ئیمساڵ دووەم یادی سەدساڵەی شۆڕشی فەرەنسییە بەهای سەركەوتنی هەردوو شۆڕشی فەرەنسیو ئەمریكیو دیموكراتیزەكردنی مافی مرۆڤ لە ئەوروپای خاوەر بە تایبەتی.

فراوانکردنی دیموکراسی بە سەردەمی نوێ لە هاریکاری دەوڵەتیدا لەبری بەرەنگاری ئەم دەرفەتە گەرمکە بقۆزرێتەوە بۆ تێشکخستنەسەر کێشەی قورسی جیهانی..

تکام وایە، لەم ئاکامەدا باروەۆخی دۆزی کورد، رەچاو بگیرێت و یەکەم برگەی خشتەی کارەکەمان بێت.

چاوگ:

Studia Kurdica

دراسات کوردیه، الکورد و حقوق الانسان و الهویه الثقافیه،

العدد 4 (8) السنه التاسعه 1993.

# نیگابانی بوونی کورد

لۆرد ئێڤیری

و. کەریم زەند

## پارێزگاری بوونی کورد:

ناسنامەی رۆشنبیریو مافی مرۆڤ باسی سەرەکی ئەم کۆنگرەیەیە، بەڵام بارودۆخی پۆلیتیکی، تەنها رەنگرێـژیو سنووردانەری ناسنامەی رۆشنبیری نەتەوەییەکە، بەبێ مافی چارەنووس، ئەو گەلە لە ئازادیو رۆشنبیری بێبەشە، بەڵکو پێشێلکردنی ئاشکراو زەقی هەر هەموو مافی مرۆیە، ئەوەی کە پەیمانەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان UN پەسەندو یەگەنیکردووە، بە تایبەتی مافی شارستانیو زیاریو پۆلیتیکی، وڵاتانی بەڵتیک، کە یەکێتی سۆڤیەت باڵی بەسەردا کێشابوو، نموونەی ئەم راستییەیە.

بە تەواوی، ئەریتریا، هەرێمی داگیرکراوی پێشو، نەتەوە یەکگرتووەکان، دایانە دەست کۆلۆنیالیە نوێیەکان لە یەکگرتووەکان دابڕکرا، چووە ژێر رکێفی ئەدیس ئەبەبا، هەروەکو تیبەت، کە کۆماری چینی میللی خستییە ژێر چنگی خۆیەوە، ماوەی 30 ساڵە یاخود تەیموری خاوەر کەوتە ژێر پۆستاڵی سەربازانی جاکارتە – ئەندەنووسیاوە.

فەلەستین، داوای سەربەخۆیی دەکا، هێشتا ئیسرائیل نەیتوانیوە خامۆشو سەرکوتی بکات.

بیابانی خۆراوا، باتیر، بایوازیای خۆراوا، 2 نموونەی بەرجەستەیی، پێشێلی ئامۆژگارییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانە، کە خۆی بڕیاری لەسەر داوە، دەربارەی رزگاری داگیرکراوانە.

وڵاتانی داگیرکراو بە ئاشکراو زەقی، بە زۆری لە کوردستاندا، سەرەک ودرو ویڵسن بەر لە 70 ساڵ، مەبەستەکانی مافی مرۆی لە 14 خاڵدا کە خاڵی 12 بۆ

گەلانی ژێر چنگی ئوسمانی دیاردەکرابوو، کە ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی یەکگرتووی سەربەخۆی تێدا هەبوو، بەپێی پەیمانی سیڤەر.

دەوڵەتانی خۆراوا ئەم پلانەیان بۆ ئەوە دانا کە ئیمپراتۆریەتی ئوسمانی پێهەڵوەشێنن.. تەنها بایەخیان بەملایەنەدا، نەك بەهاو نرخاندن بۆ مافی چارەنووسی نەتەوەی کوردو ئەرمەن بێت.

ئەم راستییەی کە هەرماوە، کە ئەم دەوڵەتانە لە بەڵێنەکەیان پاشگەزن.

ئەو کارانەی، هەنوکە، لە دەقەکانی UN، تەنها پابەندە بە داگیرکراوەی هێزە پێشوەکانی ئەوروپاوە، ئایە دەبێ تەنها مافی چارەنووس هەر بۆ ئەو وڵاتە داگیرکراوانە بێتو هیچیتر؟

گەرەکە فراوانکردنی بڕیاری 1514، 1541، کۆمەڵەی گشتی لە 1960، کە پایەگاو بنەمای دیاریکراوی مافی مرۆو چارەنووسییە.

بێگومان، ئافەروزیو بێبەشی گەلێك، کە هەموو بنەماو پایەگاکانی لە، زمان، رۆشنبیری، رەگەزی، ئایینی، جیاوازی هەیە، لەم مافە رەوایەوە لە یەکەی رامیاریدا گردوکۆ نەبۆتەوە، خۆبیبوونێکی ئەوتۆیان نەبووە، بە رێژەی کوردو باری میرنشینەکانی لە سەدەی 14-19، ئەو پایەگایەیان هەبووە.

بەڵام نەگەیشتبووە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بە فاکتەری پێوەندی خێڵەکیو فیوداڵی لەتەك ئوسمانیدا.. ئەو پەیوەندییەی، نیکو بەد – چاکو بەد، لە داگیرکاری ئەوروپی، یاخود پەیوەندی، شوێون Cho-yon نێوانی مەگۆلو، تیبەت، کە پەیوەندییەکان تەنها بە دەستەڵاتی گەلێکەوە گرێدراوە.. زاڵبوونی گەلێك بەسەر گەلێکی تردا.

ئەمە بە گشتی پەسەند نییە، رەتدەکرێتەوە بەو ئاستەی کە لە سەدەی یەکسانیدا هەیە.

گەلی کورد، ناتوانێ چاوەڕوانی دوورو درێژخایان بکات، چونکە میکانیزمی ریفۆرمی دەوڵەتی زۆر هێورە..

کورد لە هەموو خاوەری میانەدا، لە بارێکی ناهەمواردایە.. چەوساوەو ستەمدیدەو بەشخوراوە.

رژێمی ئێراق، بەرنامەی راگوێزانو داگرتنو گواستنی زۆرەکی، کاولکاریو وێرانکاری شارو شارۆچکەو گوند.. دوورخستنەوەی بۆ سەدەها کیلومەتر بە بیانووی هێرشی ئێرانەوە، تالانی، جینۆساید.. ئەمە نەخشەی قڕانو هەڵوەشاندنی پێکهاتەی گەلی کوردە.

ئەوەی کە لیوکوریر، بە قڕانی رەگەزایەتی، جینۆساید، کە بەشێکە ، لە بەرنامەو نەخشەی لە ناوبردنی کورد.. هێرشی کیمیاوی بۆ سەر هەڵەبجە 1988/3/18، کە رژێمی ئێراق ئەنجامیدا، بە هەموو بێئابڕوییەکەوە، بێشەرمانە، دزێوترین تاوانە لە چێوەی رەفتاری فاشی رژێمی سەدام حسێندا.

لە ئێران، کورد، زیانی زۆرکردووە، تیرۆر، تۆقاندن، چەوسانەوە، بۆمبارانی شارەکانی سنە بە خەستی، دوای کۆچی ئایەتوڵا خومێنی، رێکەوتنی سەرانی کوردو ئێران، کوشتنو تیرۆری سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، خاوەر، د. ئەورەحمان قاسملۆ، لە ڤیانا، بە دەستی دەزگای ساڤاک، بەڵگەی پێشێلکردنی مافی گەلی کوردە، کە هەر لە بەردەوامیدایە..

لە تورکیا، هەروەکو ئێراق، رژێمی دەستەڵاتدار تەقەلای سڕینەوەی ناسنامەی گەلی کوردە.. راگوێزانی هەرێمی قەهرەمان مەراش، دەقەرانی سوپا، بە بیانوی راونانی پاخیگەران، گوندەکان رادەگوێزن، لێدانو گرتنی لاوانی کورد، ئازارو ئەشکەنجە، لە کاتێکدا کە تورکیا، داوای وەرگرتنی دەکات بۆ چوونە ناو بازاڕی هاوبەشی ئەورووپاوە.

بەڵام تورکیا بەم کارە دڕندانەو توندو تیژییەی هەرگیز وەرناگیرێت، هەتا بەم شێوە دڕندەییە لەتەک کەمینەی بێچەکدا هەڵسووکەوت بکات، کە تاوانیان تەنها ئەوەیە کە کوردن، لەو نەتەوەیە نین.

لە هەفتەی رابووردوودا، کوردێکی پەنابەر، لە بەریتانیا خۆی سووتان، بۆ ئەوەی نەدرێتەوە بە تورکیاو یەکێکیتریش، لە خەستەخانە مایەوە لە مەترسیدا.

هەر لەسەر مافی مرۆ و ناسنامەی رۆشنبیری کورد دەدوێین، 2 رۆژیتریش بە ئومێدی بڕیاردانی گشتی بە گەرم کە کورد بمێنێتەوە وەکو ئەمە کە لە مەترسیدایە.

هەندێ کاروبار هەیە، پێداویستی بە یەکخستن هەیە بە وردی کە باسێك بخرێتە بەردەم لیژنەیەکی رشتەیی – لکێ مافی مرۆ لە UN، لە جنیف، سویسرە، بەڵکو پیلانێکی ترسناکو سامناك هەیە لە نێوانی سەرانی چەند وڵاتێك، بۆ قڕانی گەلی کورد بە بیانووی ئەوەی کە داوای خۆیبوونو سەربەستی دەکەن، ئەوەی پێیان دەدرێتو لێیان دەسەندرێتەوە و وەریدەگرنەوە.

**چاوگە:**

Studia Kurdica – دراسات کوردیە

# هۆزی بەربەر، لە نەوەی میدە

## بانگێشتێ بۆ دانیشتنی نائاسایی نەتەوە یەکگرتووەکان UN کوردو مافی مرۆڤ و پێناسەی رۆشنبیری.

نووسینی:

حسێن ئایەت ئەحمەد

و. کەریم زەند

کەسێتی ناودار، شۆڕشگێڕ و نیشتمانپارێز و نەتەوەیی جەزائیر، حسێن ئایەت ئەحمە، ئەڵێ:

ئامادەبوونم، لەم کۆنگرەیەدا، بە مەبەستی دەربڕینی هەستو سۆزم بۆ گەلی کورد و مافی چارەنووسی وەکو کەسێك لە هۆزی بەربەری باکوری ئەفریکا بە مافێکی رەوا، لەو جیاوازیەی کە هەیە، چونکە وتاربێژێك دوێنێ وتی: ﴿ گەلی کورد نەوەی میدە ﴾.

وەکو بە کورد کراوێن هاتووم، Iurdo ite، بەڵام باوەڕم پێیەن وەکو جەزائیرییەکی دیموکراتخواز، ئاواتو ئامانجم ئەوەیە کە جەزائیرو هەموو وڵاتانی خۆراوا کانگەو لانکەی دیموکراتیو لێبوردن بێت، هەموو شتێك وتراوە لەبەر ئەوە درێژەی نادەمێ.

جەورو سزاو کارەساتی راگوێزانو هێرشی چەکی کیمیاوی زۆرداریو ستەمدیدەیی میللەتی کوردی چەوساوە ناتوانین بێدەنگی لێبکەین و پێی نەزانین، وەکو لە جەنگی 2 ی جیهانیدا روویدا و ئەوەش کە لە رۆژگاری نیستەو

هەنوکـە روو دەدات بــە ئاشــکرا لەبــەر چــاو و دەروونــی میلـلـەتان و نەتــەوە یەکگرتووەکاندا بۆردمان، کوشتن، برین، ئـەوەی پێشکەشی ملیۆنـەها لاوو جـەوانو منداڵی کورد دەکرێت، ئایندەی نادیار لەسەر هەموو بارستاییەك، بێگومان، گەرەکە دەردەکەی بزانین، چارەسەرەکەشی بۆ دیاردە بکەین.

بیرتان دەخەمەوە کە نووسراوی تاعهون، هی کامۆ، بەر لـە هـەموو کارێك، گەرەکە کۆمەکی ئەو گەلو کەسانەی کە دەکەونە بازنەی مەترسییەوە و تێیدان بـە کولەمەرگی ژیان بەسەردەبەن.

ئەرکە لە سەرم سڵاو لەو کەسانە بکەم کە چاوەڕێی گوشاری رای گشتی نــین و بــەهێی توانــا و ســنووری دەســتەڵاتی خۆیــان، بــەو کەرەســەو شــێوازی راگەیاندنەی کە هەیانــە، کۆمــەکو باربووی کوردنشینەکانیان کـردووە بێبەرانبـەر، بـە بـڕوای مـن 2 هۆکـاری سـەرەکی هەیـە بـۆ ئـەم کارەسـاتانە لـەم چـەرخەدا کـە دووچاری گەلی کورد بووە.

یەکەمیان، رێکخراوە دەوڵەتییەکان،

دووەم، شێوازی دوای نەمانی قۆناخی داگیرکەری وەکو کارەساتی نـازی دژی نەتەوەیی.

وتاربێــژێکیتر دوێنــی وتــی: « لــەوەتی، یــا لەوەتــەی ئــەبوت غریفــوار، زۆرداریيەك کە لە وڵاتێکدا، ناشێ دووبارە بکرێتەوە وەکو دەربارەی هەموو جیهان ئەو تاوانە کرابێت.»

پێشـێلکردنی مــافی مــرۆڤ لــە وڵاتێکــدا، پێشـێلییە لەسـەراپای جیهانــدا، ئەگەرچـی مـادەی 2، برگـەی 7 مـاوە نـادات بـە دەسـتێوەردانی کاروبـاری نـاوخۆ، لەلایەن کۆمەڵگەی دەوڵەتانەوە.

کار بەستراوە بە رێکخراوە دەوڵەتییـەکان، هێـزە مەزنـەکان، گەمـەوباری بـە باری بەدیو خراپە بە ئەنجام دەگەیەنن، لە خـاوەری میانـەدا، تـەنها بـەهاو بایـەخ بۆ نەتـەوەو شوێنگەی سـتراتیجییە، وەکـو لـە دوای جـەنگی 2ی جیهـانی، سـەوداو مامەڵـە لەتـەك فرانکـۆ لـە ئیسـپانیا و سـالازاری پورتگـال، پـۆرتکیز، بـە بیـانوی

ڕووداوی ڕامیارییەوە، کە کاردانەوەی سامناکو کاریگەری ئەمڕۆن هەنوکەیی، زەقو ئاشکرایە لە پرۆسەی ئەمانی قۆناخی داگیرکەری بە ناوی مافی مرۆڤەوە، بە سەرفرازییەوە، دەبینەی وڵاتەکەم بووم لە کۆنگرەی باندونگدا، کە دەرفەتی مێژوویی مرۆڤایەتی بوو بە گشتی بۆ ڕێزلێگرتنو پەیرەویکردنی مافی مرۆڤ لەسەر ئاستی جیهانی.

ئەم بەرپرسییە، بەرجەستەبوو، لە ماوەی دامەزراندنی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکانی وڵاتانی جیهانی 3، ئەم کارە ترسناکە وەکو وتراوە، ئاماژەی ئەو جۆنیەتییە سەودا و مامەڵەیە بکەن کە لەتەک کەمینەدا دەکرێت بەو جۆرە بێت دەڵێم لەتەک زۆرینەشدا، ئەو هەڵسوکەوتە دەکەن.

نازی ڕەفتار دژی کەمایەتی، قڕانی نەتەوەیی، شادبوونیان بەو کارە، لە کاتێکدا زۆرینە هیچ بایەخێکی پێنەداوە، ئەمانە ئەنجامیان ناپەسەندە، زۆرینەش بەر ئەو هێرشو شاڵاوە کەوتووە لە چەرخی ڕژێمی نازیو فاشیەکاندا.

ئەوەی چاوەڕوانکراوە لە وڵاتانی جیهانی 3 شتێکی نوێ پێشکەشبکات لە ڕووی بەهای گیانییەوە.

ڕەسەنێتی کاتێک دەردەکەوێت کە گرێبدرێت بە نوێخوازییەوە.. هەموو ئایینو باوەڕێک، بایەخی زۆریداوە بە چارەنووسی مرۆڤایەتی زۆرلێکراو، چەوساوە، بێوەژن، نامۆ، ئاوارە، کەساس..

پێغەمبەر (د.خ) زۆر بایەخی داوە بە چارەنووسی مرۆڤایەتی، دەفەرموێ: ﴿ باشترین خەبات، وشەی ڕەواو دروستە، لای زۆردار﴾ ، دەفەرموێ: ﴿ دوای زانست بکەون ئەگەر لە وڵاتی چینیش بێت ﴾.

کورد نزیکە لێمان، سامانی ڕۆشنبیرییان هەیە و فرەیە.. قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ خانووەکانیان بە دەستی خۆیان کاولدەکەن ﴾.. ئەمە پیشەو کاری دیکتاتۆرانە، بەرانبەر گەلانی خۆیان، هەر بوونو ڕێکەوتنییە، بەڵام زەمانی سەرکوتکردنو تۆقاندنو تیرۆری ڕامیاری ڕووداو کە ئەم کۆنگرە دروستو ڕەوایە، کە دەربارەی کورد گیراوە، ڕێمپێبدەن، بە ئەوازشەوە، پێشنیاز دەکەم، کە دەوڵەتەکان

داواى دانيشتنێكى تايبەتى بكەن لە كۆمەڵەى نەتەوە يەكگرتووەكان، بەمەبەستى ئامادەكردنى راى گشتى لە پەيرەويكردنى بەڵگەو رێكەوتننامە دەوڵەتييەكان بۆ كارى چارەنووسى.

بەڵێ دادگەى نۆرەنبورگ دەرفەتێكى مێژوويىبوو بۆ دادكۆشى لە بيرو باوەڕ، لەبەر ئەوە ناشێ، ئەم كۆمايە بكرێت بە دادگە، راى گشتى ئامادەبكرێت وەكو پێويست بۆ تەواوكردنى گفتوگۆ بە شێوەيەكى رەوا، بۆ ئەوەى لەم جۆرە كارەساتانە قورتاربين.. حەزە دەكەم لە شارى ڤيانا، كە رابەرى ديموكراتى خاوەرى كوردستان، گەشمردە، ئەورەحما قاسملۆى تێدا كوژرا لەتەك 2 جێداريدا، والە بووە بەبيانوو، ياساى كارى ناياسايى تێكەڵ بە رووكارى گرى ميونخ Syndrom.

## چاوگە:

دراسات كوردية،

العدد 4-8 السنة 1993،

الكورد، حقوق الإنسان و الهوية الثقافية.

# کوردی فەیلی

## وشەی فەیلی:

فیلی – پیلی – هێمای نەبەردیو دلاوەریو جەنگاوەرییە.

لە دەستنووسەکانی سۆمەریدا وشەی پەیلی – جەنگاوەر، قارەمان، ئازا، دلێر، نەبەز، خۆگر، ناوی هاتووە..

زمانناسان دەڵێن: تیپی پ لە جیاتی ف ، بەکارهاتووە.

خاوەرناسی ئینگلیزی کر زۆن، ل 1892، بەرگی 2 لە نووسراوەکەیدا دەڵێ: وشەی فەیلی – قارەمان، شۆڕشگێر، خەباتگێڕ ، یاخی – الثائر – المتمرد، دژی زۆرداری، دژی چەوسانەوە.

هێنری فیلدی، خاوەرناس، ل 98، نووسراوە زانستییەکەی ناسینی رەگەزە ئێرانییەکان، پالپشتی راو بۆچوونی کر زۆنە.

## بەشەکانی:

4 بەشن: لوڕ، کەڵهوڕ، لەک، گۆران.

لوڕی گەورەو گچکە، لوڕی مەزن 3 لکە: بەختیاری، مامسێنی، کۆمگلۆیی. ئەمانەش دەبن بە لکی بچوکترەوە.

لوڕی گچکە: پێشکۆ، پشتکۆ، 2 بەشن: گەورەکۆ، لەیەکیان جودا دەکاتەوە.

پێشکۆ، ئەودیوی سنوور، خورەماوا، درووڕ، ئەرنا، گازارون، بروجرد، کۆدەشت.

پشتکۆ، 2 بەشە، لە هەرێمی خاوەرا کوردستان لە شاری ئیسلامئاباد، گەیلانی باختەر، قەسری شیرین، سەرپێلی زەهاو، دەهلەران، ئێلام، مەهران، چەندین شاریتر.

دووەم بەش، لەمەدیوی سنوور، لە کەلار، کفری، کەرەخان، خانەکین، شارەبان، شاری بانو، بەدرە، بەدرێ، جەسان، مەندەلی، بەندنیژین، زرباتییە، ئەلی شەرقی، ئەلی غەربی، شێخ سەعد، کمیت، 40٪ لە ناو شاری کوت — واست، دەڤەری حەی غەراف، قەلعەسوکەر، شەترە، هێلی غەراف، لکی رۆباری دەجلە، لە بەرابیەوە تاکو کۆتایی، بڵاوبوونەتەوە.

کەلهوڕ، خێڵو تیرەکانی: شازادە، مەنسووری تاکو دەڤەری هەزارە لە ئەفغانستان و بلوجستان و شاری کوێتەی پاکستان...

بەم پێیە لە خانەکین و مەندەلی.

## گۆران:

سەر بە هەورامانین، بە راوبۆچوونی مێژووناسان، بەڵام لە کوردی باشور، نزیکترن، بە تایبەتی لە فەیلی گۆران، 4 بەشن: زەنگنە، سنجابی، باجەلان، گۆرانی گچکە، لە خانەکین و مەندەلی و دەڤەری مووسڵ.

زەنگنە، بە پەرشو بڵاوی لە دەڤەرانی کفریو نزیکی کەرکوك..

باجەلان، لە دەڤەری خانەکین ، نزیکی مووسڵ کە بە شەبەك ناسراون

## دیالێکتی کوردی فەیلی:

کرمانجی ژێروو، لە هەموو دیالێکتەکانی تری زمانی کوردی، کۆنترو رەسەنترە.. ئاینزا لە 75٪ کوردی فەیلی جەعفەرین — شیعەن، 17٪ سونین، ئەهلی هەق و ئەوانیتر، زەردەشتی، ئیزیدی، مەسیحی، کریستیانی، جووە.

## تۆماری مێـــژوو:

کێوی زاگرۆز، دەشتی سۆزیان و جۆمی کارون، فرە ئاوی فەرو پیتی زەوی، شوشی ئیستەو کەنارەکانی جۆمی سیمرە، کە دەرژێتە جۆمی ئارەبەوە.

ئەم فاکتەرو هۆکارانە، کوردی فەیلی گردوکۆ کردۆتەوە، بەر لە 4-6 هەزار ساڵ پ.ز.

لە دەربەند نامروودەوە هاتوون بەپێی نووسراوی مێژوویی.

نیستەخر دەڵێ: بە ناوی شاری لوڕەوە، دیزپول ناونراوە، ئەم زەوییە بەپێتە لانکەی ژیاریو کەڵچەر و شارستانێتی ئێلام بووە لە چەند سەدەیەکدا.

شوێنەوارو پاشەواری شاری شوش پایتەختی ئێلام، پارسوس، مزگەوتی سلێمان هەنوکە و مهرجانقدق، دەرە شاری ئیستەو شاری سەرمەکیتر، نیشانەو هێمای بڵندو بەرزی تۆماری مێژووە، سەراپای چەرخەکان، شاری شوش، جەمسەری رێ و گەیاندنی نێوانی دووچۆمان، میزۆپۆتامیا و ئاسیای گچکەو شوێنە دوورەکان. جیهانی ژیاریو پێشکەوتوو بووە، لەو سەردەمەدا، لەتەک هیندستانو هاوسێکانو دەوڵەتی سۆمەرو ئەکەدو هیتر.

سنووری شاهەنشاهێتی ئێلام، وڵاتی پارس لە باکوورەوە، لە هەمەدان، ئەکباتان تاکو بابل.

لە خۆرنشینەوە، رۆباری دەجلە، تیگرە.

لە باشوورەوە، کەنداو تاکو ئەسکەلە – دەربەند – بەندەر بوشەهر، کە بریتیبووە لە، خۆزستان، لورستان، پشتکۆ، بەختیاری.. ئەمانە، هەرهەموو دەڤەری فەیلی بوون، تەنها جگە لە خۆزستان.

ئەڵێن هیندۆئەوروپین، یانی ئێرانین، گاپکاسین، یا خەزەرین، نیشتەجێی ئەم هەرێمەبوون بەر لە هەزاران ساڵ.

## مێژووی ئێلام:

1- چەرخی پێش مێژوو، لە 8 هەزارەی پ.ز، 3335 پ.ز، هاوچەرخو پەیوەستی سۆمەرو مێژووی ئەکەدییە، تا کۆتاییهاتنی ئەم 2 دەوڵەتە بە دەستی ئێلام.

تەوراتی پیرۆز، بەستی 4، لە سفر بیدایش، التکوین الآیات، 1، 5، 9، 17، ناوی شاری ئێلام، کدرکر هاتووە.

2- خولی پەیوەستی ئێلام، بابل، لە 3335 – 745 پ.ز.

3- خولی هاوچەرخی ئاشور لە 745 – 645 پ.ز.

لێرەدا دەوڵەتی ئێلام کۆتایی دێت بە دەستی ئاشوربانیبال، 645 پ.ز.

دوای ئێلام، رەچەڵەکی ئەخمینی پارس – فارس، دێتە ئاراوە، لەتەك میدی کوردا، یەکئەگرن، دەوڵەتی ئێران دادەمەزرێنن، بە سەرۆکایەتی کۆرش.

ئەسکەندەری مەکدۆنی، کۆتایی پێهێنا، 331، دوا پادشایان کیسرابوو.

ئەمە سەردەمی سلوقی بوو.

شاپوری ساسانی، شکستی پێهێنا تاکو چەرخی شا یەزد گورد – ئیزدکرد – خوداکرد، دوا پادشای ساسانی، کەوتە بەر شاڵاوی ئیسلام و کۆتاییهات 636 – 640 ز.. هاتەژێر رکێفی ئیسلامەوە.

**چەرخی ئیسلام:**

لە چەرخی ئیسلامیدا، دەڤەرەکانی فەیلی، کەوتنە ژێر رکێفی فەرمانڕەوایی ئیسلامەوە، بە ناوچەو دەڤەری چیا، کۆهستان، ناوبراوە، شاری سیمرە و شیروان، بەشێکبوون لە میری بەغداد و شاری دەرشەهر، سەر بە ئوستانی بەسرە بووە، لە چەرخی ئەباسیو جێنشین ئەبدوڵا سەفاح.

کوردی فەیلی، لە دەڤەری ئێراقی ئەجەم و ئێراقی عەرەب – ئارەب، جێگیربوون.

لە شاری بەغداد، لە بازاڕو بازرگانیدا زۆر کۆکبوون، دەشتەکانی لەوەڕگەی هاوینی و زستانییان بوو، دەڤەرانی چەند میرییەکی تێدا سەقامگیربوو.

یەکەم: میری ئەتابگی لوڕستان 545 ك – 1154 ز، 3 سەدە پایەدار بووە، تەیمور لەنگی مەگۆل، لە ناوی بردوون.

دووهم: دهوڵهتی ئال خورشید، له لوڕی کچکه 580 ك – 1185 ز تاکو 695ك – 1395 ز.

سێیهم: دهوڵهتی ئهتابگی لوڕی کچکه، 631 ك – 1334 ز.. له چهرخی مهگۆلدا، ناوی لوڕستان بووه به لوڕی بزورگو لوڕی کچکه.

له چهرخی دهوڵهتی سهفهویدا، لوڕی بزورگ بووه به بهختیاری و گوهگیلویی، ئهمه چهرخی سهفهوی و ئوسمانی، له فهرمانڕموایی شا ئهباسی سهفهوی – تههماسب، سوورنێوی ئهتا بگ بووه به ئوستاندار – والی، یهکهم ئوستانداری- فهرمانڕموا، حسێن خان بوو. بارهگاکهی شاری خورهماباد، قهڵا، دوژی فهلهکئهفلاك بوو.

میر زولفهقار، ماوهیکیتر، فهرمانڕموایی دهقهرانی لوڕستان بوو، له خێڵی کهڵهوربوو، که فهیلییه.. شا ئهباسی سهفهوی، فهرمانیدا که بهغداد بگرن.. 3 مانگ گهمارۆیدا و گرتی، 1633ز .. 6 ساڵ له ژێر رکێفیدا مایهوه، تاکو به دهستی شائهباسی سهفهوی کۆتایی به فهرمانڕموایی هێنا، له چهرخی سهربهخۆییدا سهرپێچی کرد 1639.

کێشهی سنوور:

1555ز، کێشهی نێوانی سهفهویو ئوسمانی سهریههڵدا، ئێراق بهشێکبوو لهو کێشهیه.

خێڵه کورد نشینهکان دابهشبوون بهپێی نیشتهجێبوونیان، بهشێکی لهو دیو، بهشهکهیتری لهم دیوی سنوور.. برا، ئاموزا، خزمو خوێش، بهپێی رهگهزنامه.. وڵاتنامهی ههردوولا، لهیهکتر دابڕان، بهپێی پهیمانهکانی نێوان سوڵتانی ئوسمانی، مرادی 4، شا تههماسبی یهکهم، 1639، پهیمانی زههاب، یهکهم بهشکردنی خاکی کوردستان، کوردستانی پهرتکراو، نێودهوڵهتی، الکوردستان المجزاة. Partition – Divison – Kurdistan.

بڕیاردرا، دەڤەری نێوانی بەغـداد – ئازەربیجـان، جەسـان – بـەدرە، بـەر نوسمانی، ئێراق کەوت، لەتەك شاری مەندەلی، تـاکو دەرەتـەنگو سـەرمیل ببێـت بـە سنووری دەرەتەنگو دەشتەکانی نێوانیان، کەوتە ژێر چنگی نوسمانی..

چیای سنووری سەر بەم دەڤەرە کەوتە بندەستی لایەنەکەیتر.

سەرمیل، سنوور، دەرەتەنگ، دەرتابێلایەن، خێڵەکانی زیانەدین، هاروونی جـاف، کەوتـە بندەسـتی دەروازەی بـاڵا - البـاب العـالی ، ئەسـتانبوڵ – ئەسـتانە، پەروەزەدۆڵی، مایەوە لە بندەستی ئەولادا.

دۆزی زنجیرەی سەرچیا، رمانیان و هەموو پاسگەکان نزیکی شاری زورکوهی لەولا بۆ قەڵا، دۆزی زەڵم، هەموو تەواوکرا، لە لایەن سوڵتانەوە.

دووزی هەورامان و دێهاتەکانی، خاوەنداریتیەکەی بـۆ ئـەولا، کـەوك جنـان، هێڵـی سـنووری شـارەزوور و قزڵجـە و دەڤـەرانی، کێشـرا و تـەواوکران لـە لایـەن سوڵتانی ئوسمانییەوە.

مەریوان – میهرەبان، دەڤەرانی کەوتنە بەر ئەولا.

پەیمانانی 1639، زەهاو ، 1737 لـە هەمـەدان، 1736 لـە ئەسـتانە، سـاڵی 1746 لـە مغـان، 1832 لـە ئـەرزوروم، دانوسـتانی سـنوور تـاکو 1849، کـەوتنی ئیمپراتۆریەتی نوسمانی، نەگەیشتنە هیچ رێکەوتننامەیەك.

لە چەرخی والی – ئەستاندار، مەحەمەد حەسەن خان، هاتە پشتکۆ، کردی بە بارەگای سەربازی خۆی، بۆ بەربەستکردنی هێرشی ئوسمانی.

1905، هێرش هێنرا بەسەر مەهرانی کورد، سەر بە پشتکۆ.

ئـەلی غـولام رەزا خـان، دوا ئوسـتانداری کـوردی فـەیلی، لەشـکرێکی بـە سەرکردەیی مامی، سەید جەواد فەیلی، پێکەوەنا بۆ شاڵاوبردنە سەر ئوسمانی، دوا دەسـتدرێژییان تـاکو سـنوور کێشـانی نێودەوڵەتی لـە جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا، 1914 – 1918..

ئێلام، کەوتە بندەستی رەزاشای ئێران.

راپەڕینی فەیلی بەرپابوو دژی دەستەڵاتی مەڵبەندی بە سەرکردەیی شازنی شۆڕشگێڕ، قەدەمخێر، دوای کوشتنی براکەی، لەلایەن رەزاشای ئێرانەوە.. 3 ساڵ شۆڕشی کورد و کپبوونەوەی لەبەر بێئازوخەیی و بێچەکو چۆڵیو نەبوونی کۆمەکەوە... ئەمە جەنگی خورەماباد بوو، 1919.

راپەڕینێتر، دژی میری تەهران بە سەرکردەیی ئوستانداری پشتکۆ، غولام رەزاخان.. یاخیبوونیو باجنەدانی، داوای سەربەخۆیی لە تەهران دەکرد.. رەزا شا، لەشکری ناردەسەر، بە ناچاری غولام رەزا خان، کشایەوە بەرەو ئەمدیو..

ئەوەکانی خەباتگێڕبوون، تاکو شکستی و نیسکۆی 1938، روویانکردە ئەمدیو، بۆ ئێراق، ئەخشەو پێکهاتەی دیمۆگرافی گۆڕدراو تێکچوو بەم رووداوە.

زرباتیەو مەندەلی، چەرخی ناسرەدین شا لەسەر ئێران بوو.

## شارەکان:

ئیلام، مەندەلی، بەدرە – بەدرا، جەسان، زرباتییە، ئەلی غەربی، ئەلی شەرقی، کمیت، عبدە، شارەبان، زهیران، قەلعە، تعان، ورمزیار، قەلاچە، شوشە، حیان، کردی.

## لوڕستان:

هەرێمی لوڕستان، خۆراوای ئێران، شاری خورەمابادی بنکەو قەڵا، دوژی فەلەك ئەفلاك لە ناوەندا.

## دوژی فەلەك ئەفلاك:

قەڵا، دوژێکی پتەو و قایم لە خۆراوای شاری خورەمابادە، لەسەر گردێکی بەرز، رۆبار لەملاولەولایەوە، ساختمانێکی کۆنە، سەدان ساڵ لەمەوبەر.. نیستەکە کراوە بە زیندانی – گرتووخانەیەکی سامناکو سامدار، ژووری ئەشکەنجەو ئازاردان، تەڕو شێدار، ژێرزەمین، سردابی فراوان، هەواو بای پاکی

بۆ ناچێت، تاریکو نووتەک، ڕووناکی تێدا نییە، چاو چاونابینێ، ترسناک تەنها چەند کاتێك ڕۆشنایی تێدەکەوێت.

لە ئەنجامی هەڵکەندنو پشکنینیدا، پاشەواری چەرخی میدی تێدا دۆزراوەتەوە.

## خێلەکانی:

شێوازو دیالێکتی ئاخاوتنی لوڕی ئاری کۆنە، گرووپی بانی ئێرانی، هیندۆئەورووپی، ئاخافتنی لوڕی – لەك، فەیلی، لوڕی گچکە، لە پشتکۆوە تاکو بەدرەو جەسان و زرباتییە، ئەم خێڵانە نیشتەجێن:

1- ئەلی شیروانی، 4 تیرەن: دارەوەنی، سەفەرەوەنی، میرەوەنی، چراخوەنی.
2- چاردەاور.
3- مەلکشاهی.
4- شوهان – شوان.
5- دووسان.
6- قەیتول.
7- لەك.
8- کلاولی.
9- کورد.
10- کوردلی.
11- تەرگەواری.
12- لوڕ.
13- خزل.
14- هیمینی.
15- ڕووسایی.
16- رەنگنە.
17- پیریایی.

**چۆمی سیمرە – سەد مەرە:**

دەڤـەری فـەیلی دەکـات بـە 2 کەرتـەوە: پێشـکۆ – پێشـیکێو، پشـتکۆ – پاشیکێو.

شـاری ئـێلام – عـیلام، گەورەشـاری دەڤەرەکەیـە، ئەمـە بـە گوێرەی مـیری ئێلام، خانو قەڵاو دوژ.

هەنووکە، شاری خورەماباد، بنکەیە، 3 کات لە کرمانشاوە دوورە.

**شۆڕشەکان:**

شۆڕشـی شـاوێردیخان، بـاپیری خانـەکانی پشـتکۆ، لـە دەڤـەری سـیمرەوە – سەدمەرە، بالورستان، مەزنی، سلۆز نـاو، سـەرۆکی هـۆزێکی کـورد لـە دیرکونـد، داوای کچەکەی شاوێردیکرد بۆ مەنسوری کوڕی... شاوێردی رەزامەنـدی نیشـاندا، کوڕێکی لێبوو، ناونرا حسێن خان.

شاوێردی، پردێکی گەڕۆکی دروسـتکرد، پـرد تـەنگ، پـول دوختـەر – پـردی کچ، ئەمـە نهێنـی سـەرکەوتنەکانیبوو، بۆ بەربەسـتی هێرشـو شـاڵاوی شانەباسـی سـەفەوی، هێرشـی ناکـاو، شـەبەیخون، شـا ئـەباس زۆر بـە خێرایـی بـۆ سـەر خورەماباد، بەڵام ئەو سەرکەوتووە نەبوو.. هەرچەندە بە فێڵ تـوانی بچێتـە نـاو شـاری خورەمابـادەوە، نـاکۆکیو دووبـەرەکی خسـتە نـاو کوردانـەوە، لـە ئـەنجامی ناپاکیدا، نهێنی پردەکە، دەرفـەتی رەخساند حسێن خـانی کوڕی سلۆز، دانـرا بـە ئوسـتاندار، نەخشـەی هاوبەشـی دژی خـاڵی خـۆی کێشـا، کـە شـاوێردیبوو، پایـەو پلەیەکی شیاوی پێبەخشی، پردێکی لەسـەر چۆمی سیمرە دروسـتکرد، شاوێردی راونرا، پەنای بردە بـەر قـەڵای چنگڵە، پاسگەی تـورک بـوو، ڕوویکـردە تـورک بـە هیوای پاراستنی، بەڵام نەپارێزرا.

حسـێن خـان خـاڵی خـۆی کوشـت و سـەربڕی.. سـەلکو کەللـە سـەرەکەی بـە دیاری نارد بۆ شانەباس، خستییە ژێر هەردوو پێیەوە لە خورەمابادو خێزانەکەی بە دیلی هێنرا بۆ سیمرە.

بەمجۆرە، حسێن خان خاڵی خۆی کردە قوربانی پلەوپایەو کرا بە والی – ئوستانداری لوڕستان.

یەکەم ئوستاندارە کچی ناودارێکی خوڕەمابادی هێناو کوڕێکی لێبوو، ناونرا بە منوچەهر..

کوڕەکەی بوو بە والی، کچی خاڵی خۆی هێناو کوڕێکی بوو بە ناوی شاوێردی2، کرا بە والی، دوا کۆچی منوچەهر، دوای حسێن خانی 2، ئەلی مرادخان، ئوستانداری پشتکۆ.. بە شمشێرزەن ناسرا.. توانی بە شمشێری برنەوشترێك بکات بە 2 نیمەوە لە بەردەمی شانەباسی سەفەویدا.

دواجار کرا بە دامێندەو بالیۆزی ئێران لە لای ئوسمانییەکان، هەر لەوێ کۆچیکرد.

دوای ئەو ئیسمایل خان لە سەرکورسیو تەختی میرنشینی دانیشت و یاخیبوو، پەنای هێنا بۆ ئەمدیو، ئێراق، حەسەن خانی کوڕی ئەسەدخان دانرا بە ئوستاندار لە چەرخی شاهەنشانی، دەوڵەتی زەند، کەریم خان بانگێشتکرا، بەڵام نەچوو، بەداخەوە سەرینایەوە، حەسەن خان لە جێگەی باپیری دانرا.

ئەمە چیرۆکی سمایل خان.

حەسەن خان کوڕی ئەسەدخانە، کچی مامی خۆی هێنا، کوڕەکانی: ئەحمەد خان، هەیدەرخان، ئەلیخان، محەمەد حسێن خان.

دەفەری پشتکۆ و پێشکۆ کرا بە 3 مەڵبەندەوە:

1- دەفەری ژێر رکێفی ئەلیخان، خێڵە کوردەکانو شوهان.

2- دەفەری مەحەك، 2 کەرتبوو:

یەکەمیان، لەژێر فەرمانڕەوایی ئەحمەدخان.

دووەمیان، لەژێر دەستەڵاتی دەشە، لە دواجاردا هاتەوە ژێر رکێفی هەیدەرخان.

رەچەڵەکی ئەلیخانو نەوەکانی، ئەحمەدخانو کوڕانی هەیدەرخان، ئەمانەن: حسین قولیخان، ئەبوقەدارە، گەیشتە پایەی والی.. لە نەوەکانی: غولام رەزاخان، دوا ئوستانداری پشتکۆ و پێشکۆ.. لە چەرخی رەزاخانی پەهلەویدا، پەنای هێنا بۆ ئەمدیو، لە سەردەمی شا فەیسەڵی یەکەمدا، لە شاری بەغداد کۆچیکرد و لە شاری نەجەفی پیرۆز نێژراوە.

**ئوستانداران – ڕچە:**

غــولام ڕەزاخــان، کــوڕی حســێن قولیخــان، کــوڕی هەیــدەرخان کــوڕی ئــەلیمرادخان کوڕی حسێن خـان کوڕی شـاوێردیخانی 2 کـوڕی منوچـەهر کـوڕی حسێن خان، کوڕی مەنسور کوڕی سلۆز.

هەرهەموویان، نەوەی شاوێردیخانی یەکەمن.

**داستانی سەرەگاو فیل:**

لـە چەرخی سـەفەویدا، تیرەیـەکی خێڵی رەبیعـەی ئـارەب، کۆچـدەکەن، لـە دەڤەرە خێڵە کوردنشینەکانی دێرگونـد نیشتەجێ دەبـن.. کۆنـە گونـد – دێکـۆن.. پێشوازییەکی بـە گـەرمیان لێدەکرێت، سـەرەگای کوڵاویـان لـە تەشـتێکی گـەورەدا پێشکەشدەکەن.. هێمای هێژاییو ڕووانەتی میوانپەروەری و خانەخوێیی..

لەم میانەو میوانداریەتیەدا، سـەرۆکی خێڵی ڕەبیعـەی ئـارەب ئـەڵێ: دەبـێ بـە مـەزنی ئـەم هـۆزە، چـونکە سـەرەگای هێمـای مـەزنییان پێشکەشـکردین، کـە نیشانەی سەرۆکایەتیو مەزنایەتییە.

بەم ئەندازە و بەم پێیە، چیرۆکی کـەرتکردنی گا.. گوایا حسێن قولیخان، ئـەبو قـەدارە، گایـەکی گـەورەی 2 نیمـە کـردووە بـە شمشـێر بـە یـەك کـەرەت، لـە گرەودا لەتەك شێخ خەزعەل سەرۆکی خێڵی ڕەبیعە.

هەروەها دەڵێن:

پاڵەوانێکی زۆرانباز لە پشتکۆ باوەش دەکات بە فیلێکداو بەرزی دەکاتـەوەو هەڵیدەگرێت.

رایـەکیتر، گوایـا، زۆرانـی لەتەکـدا دەگـرێ، بـە سـەریدا سـەردەکەوێ، لـە تەماشێکدا، لە پێش دەمی شاهەنشایەکی ئێراندا.

ئەمەیە وشەی **فیلی**، لەم چیرۆکەوە هاتووە.. بووە بە **فەیلی**.

## فەیلی ئەمدیو – ئێراق:

مێژووی هاتنی فەیلی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی هێرشی نادرشای ئەفشاریو کشانی بۆ دەڤەرو هەرێمی لوڕستان، ئەو ناوچەیەی کە زەرنیخی فرەی هەیە.. فەیلی، لە چەرخی والی پشتکۆوە کۆچیانکردووە بۆ ئەمدیو.. پتر لە نیو ملیۆن کەس.

لە 1947، 30 هەزارکەس بوون، 6٪ ی مۆناتی ئێراق.

لە بەغداد، گەڕەکی کورد، گۆڕەپانی کورد، شەقامی کیفاح، غازی، فەزوەی ئارەب، لە بازاڕ و بازرگانیدا و بەشداریان، بازاڕی شۆرجە و سابوونی، بابوشێخ.

حسێن قولیخان، سەرکردەیەکی شۆڕشی بیستەکان بووە، ناودارو رامیارو نووسەرو هۆزانڤانیان فرەیە، لە ناو ئەم هۆزە ڤارەمانەدا، وەکو:

سەی یاقو، مەلایاقوب، یوسف باسکو، شاکە، خان مەنسور، شەفی، مەلا نامدار، محەمەد هەسەن، برزوو، ئەرکەوازی، داری ساری ، محەمەد بەدری.

40٪ ی دانیشتوانی شاری کوت – واسیتە کە حەجاج کوڕی یوسف سەقەفی لە 702ز لە کەناری دەجلە – تیگرە، بە 3 ساڵ تەواویکرد، ناوەندی کوفەو بەسرەو ئەهوازە.

حەی واسیت، لەسەر لکی غەراف، لە بەندەوی کوتەوە لە رووی رۆباری دەجلە، 1816 ئال ئەلیخانی برای هەیدەرخانی کوڕانی هەسەنخان، لە 1840، کۆچیکردووە، دوا فەرمانڕەوای پشتکۆ لە خێزانو فامیلیای خورشید 4 سەدەی خایاندووە.

لە شارۆچکەی حەی، بەپێی ئاماری 1947، مۆناتی 68537 کەس بووە.

2 جار راگوێزراون لە 1973، 1973، 1980، 1983.

**خێڵەکانی:**

باپیرەوەند، قەیسی وەند، هەماوەند، کاوریزادە، بیاجیسە، جاروەند، کاکە وەلی، شوهان – شوان، خەتاوی، خەزل، خەرزدان، ماسپی، زرگوش، دوزلون، مەلەکشاهی، سوورمێری، سەگەوەند، یاوات.

**کوردی باشووری چیای هەمرین - هامرین:**

مێژووی هەبوونی کوردی باشووری کێوی هەمرین، کۆنەو دێروکیان دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی ئەو گەلو هۆزانەی کە 3 هەزار ساڵ بەر لە زایین، گرێدراون بە سۆمەرییەوە کە باپیرە گەورەی کوردن.

لە دەڤەرانی گۆتی و کاشیو میدیو گەلانی ئارامی 5 سەدە دوای سۆمەری، لە باشوری هەمرین و باکوری وڵاتی سۆمەر، نیشتەجێبوون، شاری بابل پایتەختیان بووە.. دوای شکستی ساسانی، رەوینو ئاودیوی چیای زاگرۆز بوونەوە، تەنها کوردە هەژارو نەداران، مانەوە لە شوێنی خۆیان.

دوای هاتنی ئیسلام، ئارەب بە خاووخێزانەوە کۆچیانکردووە بۆ ئەم دەڤەرانە، بە فەرمانی جێدار ئومەر کوڕی خەتاب.

**کوردی باشوری هەمرین 3 بەشن:**

1- هەرهەموو دەڤەری خاوەری دەجلە – تیگرس، تاکو 1900 بە پێی ئامار، ژمارەی ئارەب زۆرتربووە.

2- کوردی باشوری دەجلە.

3- لە شارەبانەوە تاکو هاو.

نوستانی دیالە – دێیەلە، لەم کاڤارانە پێکهاتووە: مەندەلی، شارە، دێلّاوا، خالیس.

دیالە، واتە گوندی لالە، لە پەیڤی دێلەمەوە هاتووە، دەیلەم – دێی لم – گوندی لم.

به ئاشووری ، میترنات، می، واته، ئاو.

ئەباسی، وتوویانە، خۆراسان – خرسان، ئامراشیان، بنکەی شاز قوبادی پێوتراوە، لە باشوری دیالەوە، تاکو ڕۆباری رداتو – عزیم، شازهورمز.

دیالە لە هەمرینەوە تاکو نوستانی کووت، هەزاران ساڵ پ.ز. بنکەی سەربازیو زۆزانی فەرمانڕەوایانی کورد بووە.

لەوبەری دەجلەشەوە، شاریان دروستکردووە، وەکو کوفە، ئاگرگف، عوقر، عەقەرگوف سۆمەری، گۆتی، کاشی، مید، ساسانی، ئیسلامی، ئەباسی، رەی، مازندەران، خۆراسان، سەمەرقەند، بەسترابوو بە پایتەختی ئیسلامەوە.

باقووبە، نەهروان، سیمسرە، ماهرود، شارەبان، کاروانسەرای فرەی لێدروستکراوە، ڕێگەی بازرگانیو حەج بووە.

نوسمانی بایەخی پێنەداوە، بەڵکو بە کەلاوەیی و مەکۆی ڕێگرو یاخی ماوەتەوە.

دیالە، 1920، لەتەک کەرکوکو هەولێرو سلێمانی بە پارچەکانی تری کوردستانەوە، بیرو هزری پێکهاتنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆی لێکراوە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە... بەڵام ئەمە پێکنەهاتووە.

بەریتانیان ل 25 نیسان، 1920، ئێراقی خستە ژێر چنگی خۆیەوە بەپێی پەیمانی سانریمو، بەدوای پەیمانی سایکس بیکۆدا.

دیالە کرا بە پارێزگە – نوستان، باقوبە بوو بە بنکە، بایەخی پێدراوە، بەهۆی شوێنی ستراتیژیو نزیکی لە بەغداد و سنوورەوە.. وێڕای پیتوفەڕی زەوی و بوونی پاشەوارو کەڵچەر، لە مەهرود و کەنعان.

پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، 60٪ کوردبووە، 30٪ ئارەبو تورکی ئازەریو ئەرمەن بووە، وێڕای تورکمانو فارو چیچانو چەرکەس.

کورد لە کۆنەوە جێواربوون لە ناو شاری باقووبەو بەروپشتی، بەم خێڵانە، زەنگنە، شەروان، جاف، مەلەکشاهی، لەك، بیروەندی، قەرەئولوس، ئەرکەوازی، گۆران و دەیان تیرەو بنەماڵەیتر، زمانیان، ئارەبی بەسەردا زاڵبووە، بە ئارەب دادەنرێن.

مینا، ئەرکی، هەرکی، دلفان، دلفیە، بجواری، چوارکی، گۆران، خێڵانی، زکوك، سیرملیە، دهلکیە، سوامرە، هۆزی بەرازی.

لێرەوە کۆچیانکردووە بۆ دوورگە، لە چەرخی ساسانیدا..

م. وردی، کوردی فەیلی لە مێژوودا ل. 24، دەڵێ: کوردی فەیلی لە ئێراق، 250 هەزار جێوارن، لە نێوانی مەندەلی، دیزفول، بەرانبەر بە شاری ئیمارە، بریتین لەم هۆزو تیرانە:

قەیتول، ئەلیشەروانی، موسا، باویجادر، دووسان، مالیمان، خزل، ریزەوەنی، قیاسوەنی، مارین، سەگەوەنی، سوێرەمیری، شوان، کورد، مەلەکشاهی، هۆزی جاوان – گاوان، لە کۆتایی چاخی 4 ك، لە دەڤەری فەرمانڕەوایی بەنیعمناز، جێواربوون، وەکو هەڵوان، سەرپێلی زەهاو، گوت، حیللە، رێگەی خۆراسان – باقوبە.

## لــــوڕ:

لڕ – لە وشەی لۆلۆوە نزیکە، بەپێی وتەی سپایزەر، ئەشێ ناوی یەکێك لە لکەکانی کاسای بووبێت، کە لە نووسراوی پیرۆزدا بە کۆشی ناوبراون.

مۆنانی، بەپێی وتەی خاوەرناس نامدار، کرزۆن سالی 1881 بەمجۆرەیە، ژمارەی لوڕی مەزن و کچکە – پشتکۆ، پێشکۆ، 421 هەزار کەس... 170 هەزاری بەختیاری، 14 هەزاری کۆگلویی، 210 هەزاری فەیلی ساڵی 1904، رابیتو، بەشی پێشکۆی بە 130 هەزارو بەشی پشتکۆ بە 50 هەزار داناوە.

لوڕستان، بەپێی زمانو زارو دیالیك، 2 بەشە، لوڕی مەزن، بریتیە لە مامە سانی، کۆگلۆیی، بەختیاری.

لوڕی کچکە، واتە فەیلی.

فەرمنولوس، بریتیە لە: کش، کایتون، چارماندی، کاکەوەند، نەفەتچی، گاوسولری.

سوورەمیری، بریتیە لە: کەڵهوڕ، توتیك، مامیحان، ئینە، ئەنتاری.

باجەلان، بریتیە لە: جۆمور، قازانلو.

زەند، بریتیە لە: موحەمەد ساڵح ئاغا، عەلیان، تاهیرخان، غەنی.

## زولفەقارخان:

زولفەقارخان کەڵوڕ 934 ك – 1538 ز، دژی ئیبراهیم خانی مامی راپەڕی کە لە لایەن سەفەوییەکانەوە، دانرابوو بە ئوستاندار – والی بەغداد، مامەکەی خۆی کوشت، جاری ئوستانداریێتی – بەوالیبوونی بەغداد، ئاشکراکرد، بە ناوی ئوسمانییەوە، تەهماسپ پەلاماریداو کوشتی و بەغدادیگرتەوە، لەو چەرخەدا، شارەزوور لەسەر هەردەلان بوو – ئەردەلان، چەرخی مەئمونخان.

زولفەقارخان، 1530، شا تەهماسپ، لەرێی کرمانشاوە، بەرەو بەغداد هات، کەسێ بەرگری لێنەکرد، تەنها زولفەقارخان نەبێت کە ئەویش بەرەو گرتنی بەغدادبوو.

بەڵام ناکۆکیو ناپاکی، چەکوچۆڵی سەفەوی، شکستکرد، دوا چەرخی داگیرکردن کە بە چاکی نووسرابێت، چاخی شا زولفەقار بووە کە بە باشی بەرایی‌و پێشەکی جڵەوی فەرمانڕەوایی نازانرێت و چۆنیەتی رووداوەکە.

تەنها ئەوەیە، کە ئەم شایە لە فامیلیاو خێزانی لوڕە، بە کۆمەکی جەماوەریو هێزی مەزنی هۆزەکانی کەڵهوڕی بە توانا، توانی بە گورزێکی ناگاو بەغداد بگرێتو ببێت بە تەنها مەزنی ئێراقی ناوەند... کەسێك نەیتوانیوە دژایەتی بکات.

شا تەهماسپ، تەمەنی 16 ساڵبووە.

## پوختە:

لوڕستان، کەوتۆتە هەرێمی خاوەری کوردستان، لە باشووری کێو – کۆهی گەورە، کردویەتی بە 2 بەشەوە، پشتکۆ، پێشکۆ.

مۆناتی 3 ملیۆن کەسە، هەرهەموو هۆزەکانی لوڕ.

## چاوگە:


1- زەند کەریم، جوگرافیای کوردستان، 1958.
2- رۆژنامەی ئیتحاد، ژمارە 94، 27ی ئاب 1994.
3- م. وردی، الكورد الفيلي في التاريخ.
4- مێژووی کوردو کوردستان، زەکی ئەمین، ل 435، و. محەممەد ئەلی ئەونی.

## دەوڵەتی ئەشکانی کوردی

## 225 پ.ز.

دوای دامەزرانــدنی دەوڵـەتی میــد لــە ناوەنــدی کوردســتاندا، 255 پ.ز. رزگاربوون لە دەستەڵاتی سلوکس، فەرماندەی یۆنانی – گریك، دوای ئەسکەندەری مەکدۆنی کوڕی فلیپ.

شائەشـەك – ئارشـاك – Ashek – Arshek، یەکێکـە لـە کوڕەکـانی دارای3 – شای مید.. بە هاوکاری کوردی هاوسییەکانی – کاشی، لۆلۆ، ئـەمیردی، میـد، کیمـری، پـارس – پـارت، سیتی، گۆتی، هـەر هـەموو بەشـداری هەڵمـەتی دامەزراندنیبوون بە خوێن، قوربانی، جانبازی لە پێناوی سەربەستی کوردا.

پێکهـاتنی سـوپای بـزورگ بــە سـەرگردەیی ئارشـاك، بەگژاچـوونی سـلوکی، بەرەو شاری داماگان Damagan ، کرا بـە پایتـەخت، دواجار مەدایـەن بـوو بـە پێتـەختی دەوڵـەتی ئەشـکانی مـەزن.. 451 سـاڵ فـەرمانڕەوابوون، لـە هینـدەوە تاوەکو دەریای رەش.

ئـەو پارزەمینـەی کـە شـا کەهنەخسار فـەرمانڕەوایی دەکـرد، زمـانی مـیری کوردی بووە.

رێژەی کورد، 80٪، ئەویتری 20٪ پارس، سەخدی، ئەرمەن، جۆرجی بـووە، کە هەر هەموویان توخمو رەگەزی هیندوئەورووپین.

پارس، ئەگەر برای کورد نەبێ، بێگومان ئامۆزان.. پاشکۆی دەوڵەتی کـورد بوون، سەرانەو باجیان دەدا بە کورد..

ئەوانەی فەرمانڕەوابوون، خاوەنی دروستی کورد بوون.

پارسەكان، سەرقاڵی كشتیاریو ئاژەڵداریبوون.

كورد، دەچوون بە گز سۆمەریو ئەكەدیو ئیلامیو ئاشووریو هیتیو میسریو لیدیدا.

پارسەكان، لە دەڤەری شیراز لەسەر دەریای پارس – فارس، كەنداوی پارس، مەملەكەتەكەش، ئەو پارچە زەوییەبوو كە پێی دەگوترا وڵاتی پارس، هەنوكەشو ئەو هەر ئەو ناوەیە، پێشدادی كەیانی، ئەشكانی، ساسانی هەر هەموو كوردن، فارمانێتیو فەرهەنگو ژیارییان هی كوردە. كورد خاوەنیەتی، خێڵی مازنەدران كوردن، پەهلەوی گێلی زمانی كوردییە.. دارای مەزنی ئەشكانی، پارسو بیانی لە ناو دەوڵەتدا دایمەزراندن.

ئەو ئیمپراتۆرییەتەی كە قوباد دایمەزراندبوو، بوو بە قوربانی هێرشی ئەسكەندەر و كارەساتی هەولێر، جەنگی گوگمیلا 33 پ.ز. دوای كۆچەیدوایی ئەسكەندەر، دەوڵەتی سلۆكی دامەزرا، 225 پ.ز.. ئارشاك ئاڵای سەربەخۆیی هەلكرد.

میری سلۆكی لەسەر زەمینی كوردستان سڕییەوە، دەوڵەتی ئەشكانی لە شوێنی سلۆكی دامەزرا.

ئەورووپی پێیدەڵێن، دەوڵەتی پارت، لەبری ئەشكانی عەرەب، ئەجەم، تورك، پێیدەڵێن، فارسی كۆن – Ancien perse.

هەروەها فەرهەنگەكەشیان بە فارسی كۆن دادەنێن.

فەرهەنگی كاردۆنیاش و كاشی كە 700 ساڵ فەرمانڕەوابوون بەسەر بابلدا، فەرهەنگی لولو و میتانیو میدە.

شای ئاشووری ڕێزیان لە هونەرمەندو سەنگتەراشو وێنەكێشو نەخشەرو ئەندازیاری لولو گرتووە، بە مەبەستی ڕازاندنەوەی شاری ئەینەوا – نین ئاڤا – نینئاوا.

شوێنەوارەکانیش هی گۆتیو لولو و کاسیو هۆریو میتانیو میدو گوتیو ئەمردییە.

کورد لە فارس کۆنترە، ئەشکانی 451 ساڵ فەرمانڕەوابوون.. 37 شا فەرمانڕەوایەتی کردووە، لەسەر تەختی کوردستان.. ناوەکانیان:

ئەرشەك، تیردادی، ئەردەوانی، فریا، پانتۆس، فەرهادی، میهردادی، فەرهادی2، منوچهر، فەرهادی 3، خوردی2 ، ڤالۆنی، ئەردەوانی 3 ، تیردادی 2، سپنای، ڤاردان، گودەرز، میهردادی 4، پالاش، ڤانونی 2، پالاشی 2، ئەدەوانی4، پاکوری / خەسرەو، ئەکسیدار، پالاشی 3، پالاشی 4، باکوری2، پالاشی 5، 6، ئەردەوانی 5.

شا ناودارەکانیان، ئەرشاکی دامەزرێنەر، شای شەشەم میهرداد، شای حەوتەم فەرهاد 2، شای دەیەم، خوردی یەکەم.

پەهلەوی ناوی زمانە، زمانی مەملەکەتی پەهلەو، واتە مەملەکەتی مید و کورد، مید لە ناوەندو کورد لە کاروکاری و فارس لە پەراسوو کەنارەوە هاتووە، بەپێی هەڵکەوتی جوگرافی..

زمانی پەهلەوی کوردییە، زاراوەی کوردییە، مازندەران دەڤەرێکی میدی کۆنە.

خێڵی مازندەران Mazindaran ، خێڵی jishli + iri ، فەرهەنگی شەمسەدین سامی کورد، لە ماوەی 200 ساڵدا لە شەڕو جەنگدابوون لەتەك شای ئاشووریدا، لە خاوەرو باشوور، کە گوتیو لولو و کاشیو مید، منائی، پارتاسین، پارت، ئەمیردی، تێیدا ئاکنجی بوون.

ئەوەکانی کەیقوباد، لە گۆڕەپانی جەنگدابوون، هەروەها ئەوەی فریبرز، کەینەخسار، کەیبەهمەن، کەیکاوس، مەنفیسو ئەینەواو بابلیانگرت، هەروەها شیفەش، سوز، لەکش.

ئیمپراتۆرییەتی کوردستان، لە خاوەرەوە، هیند، لە خۆراواوە، دەریای ناوەند، میدیتێرینا و مەرمەڕە، لە باکوورەوە، رۆباری جەیهون - جەیهانە و چیای کاپکاس و دەریای رەش، لە باشوورەوە، میسر، لیبیا، دەریای ئەممان، عەمان، بەهەشتی جیهان.

**چاوگە:**

- مختصر تاريخ كوردستان. و. حازم عبدالقادر حسين، مجلة لالش، ل: 110-117-121.
- القاموس العام، لشمس الدين سامي.
- تۆماری تەمەن زەند کەریم.

**لا تشكو للناس جرحا و أنت صاحبه**
**لا يعرف المرءُ جرحاً إلاّ من به ألمُ**

# ئاشووری

## Ashur:

ئاسورا – ئاشور – سۆبار – سۆران – ئاسار – ئاشوری – ئاسوری – ئاتوری – ئوسار Usar.. ئەم گەلە بە چەند ناوێکەوە ناسراوە، بە رادەیەك، کە زانیارییەکی تەوتۆ دەربارەی رەچەڵەکو بوومیان نییە.. بەو هۆکارەی کە بوونیان لەم هەرێمەدا لە 5 هەزارەی پ.ز. کە ئەمانیش دەچنەوە سەر سۆمەری.. ژیاریو شارستانییان بنیاد ناوە، لە دەقەرانی ئاکادو ئورو کلدو بابلدا.

کەڵچەریان تاکو 612 پ.ز. هەر راوەستاو بووە.. سنووری شاهەنشاهێتییان، گەیشتۆتە کاپکاس و ئێران لە خاوەرەوە، دەریای سوور، فەلەستین، لوبنان، ئوردون، سورییە، بیابانی میسر، لە باشوورەوە، ئەنەدۆڵو قەیسەری، لە خۆراواوە، تاکو بەشێکی دوورگەی ئەرەب.

شاهەنشاهێتیەکی تۆکمەو پتەو، فەرمانڕەوا بەسەر هەرێمەکەدا، ئەو سەردەمە.

ئاشووری بنیادنەرو دامەزرێنەری بناخەی شارستانیو مرۆڤایەتییە، نووسینەکەیان، کە ئەلفبای سریانی بوو، بەرنامەی ئەلفبای یۆنانی و عەرەبی و هیندی و کاریگەریشی هەبووە بۆ سەر ئەلفبای چینی.. کە 4 تیپە، یەکەمەکەی تیپەکانی ئاشوری، لەلایەنی یۆنانییەکانەوە، بەکار هاتووە، تاکو ئێستەکەش، کە ئەمانەیە: ئولف، بیت، گومل، دولت.

نووسینی تەورات، بۆ یەکەمجار، بە تیپی سریانیو ئارامیبووە.

پێغەمبەری مەزن محەممەد (د.خ.) و یارانی بە تیپی سریانیو ئارامی خوێندکاریان فێرکردووە.

باخچەی هەڵواسراو، دوژی بابل، گەواهیدەری ئەم راستییەن.

زانکۆی نسیبین و ئورفەی پ.ز. ناسراو بە قەنتشرین، واتە، هێلانەی دڵ... ناوی هەمەجۆرە، تاکو 612 پ.ز.

لە زەوی میزۆپۆتامیاو دەرەوەیدا و دوای ئەو چەرخەش میدو پارتی، فەرمانڕەوابوون، تاکو هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی 330 – 320 پ.ز.

مید، لە چیای زاگرۆز، جودی، گودی، پارتیش لە شوێنی خۆیدا، ئاشوری لە سوریەو لوبنان، بەشێك لە فەلەستین و ئوردونو دەشتەکانی 2 چۆمان و ئەوەی پەیوەستە بە ناوی ئاشوورییەوە، سریانی، کلدانی، کە ئیمرۆ کێشەیە.

سریانی، هەر ئاشوورییە، تیپی ش لە زمانی یۆنانیدا، بووە بە ئاسووری، ئەسیرین، سورییە، لەمەوە هاتووە.

لە زمانی ئاشووریدا، سوریو، سریوبو، ئاشوری، سریانی هەمووی یەکەو نەتەوەیەکە، بە شارستانی کلدانی ناسراوە.. بەر لەوە سۆمەری بووە، لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر، ژیاریو شارستانێتی، راگوێزراوە.. کلدانیو ئاشووریو سریانی، زمانێکو نەتەوەیەکە، لە رووی نووسینو ناوەوە.

ناسنامەی نەتەوەیەك، زمانو رۆشنبیریو جوگرافیایە.. ئەمانە هەرهەموو لە ژێر رکێفی ساسانیدا بوون، ماوەی 2500 ساڵ، دوای ئەوان، ئیسلامیو ئوسمانیو مەگۆلیو خۆراوایی، گۆڕەپانی جەنگو پێکدادانی بێوچان، کە بەشی ئاشووری ئازار و لاوازیو بێبەشیو تەنگەناسەیی.

هەرچەندە، ئایینی کریستیانیان وەرگرتووە، بەڵام هەر قورتار نەبوون، لەو ستەمدیدەییەو ستەمی بێزەنتیو رۆم و چەوسانەوەی شۆڤێنزمی ئارەبو تورکو فارسو رۆمان، بە هۆکاری ناکۆکی ئایینو ئایینزاییەوە.. رۆما، کڵێسەی سریانی بە زۆرەملی خستە پاڵخۆی، کە لە ئەنتاکییەبوو، خستیە پاڵ کڵێسەی رۆما لە ئەستانبوڵ – قوستەنتەنییە.

کەنیسەی ئەنتاکییە، یارانی عیسا، شەمعون، پەترۆس، یەکەم بەتریرکی ئەنتاکییە، بایەخدار لای ئاشووری، ئەو رۆڵەی نەما، دوای راونانی لە لایەن رۆماوە،

340 ساڵ زۆربەی کادەری ئایدیۆلۆژی کریستیانی فڕێدرانە ناو ئاگرەوە و سووتان، هەندێکیان کران بە نێچیری دڕندەکانو لاکی ناو دەمی شێرە برسییەکان... تەنها تاوانیان ئەوەبوو کە کریستیانین و دژی کۆیلایەتین.

رەوشی کریستیانی، کە بڵاوکرایەوە، لە ئەورووپاو رۆما، پۆڵس و هاوکاری سیلاس بەنێی راسپێری شەمعون پەترۆس بوو لە چەرخی قوستەنتینی گەورە لە 325. کۆنگرەی کریستیانی لە شاری ئەزنیك، بە چاقاری رۆما.

نمایندەی ئاشووری، مار یەعقوب نسیبین و بریکارەکەی، مۆر – مار ئەفریم سیروس و مەترانی دیاربەکر، شەمعون، نەیانویست کە کەنیسەکەیان ، لە ژێر چنگی رۆمادا بێت و ناکۆکی تاکو بەستنی کۆنگرەی 2 لە ئەستانبوڵ 451، لە گەرەکی خەلفەدۆنا، راوناو ئازارو ستەمی دژی ئاشووری، تەنانەت، لە ناشتنی مردوودا.

بنکەی کەنیسەی ئەنتاکییەو راوانیو داخستنی و سوکایەتیو رسوایی پەتریرکی سریانی... ئەمە نیشانەی دەستەڵاتی رۆمابوو بەسەر کەنیسەی خاوەردا.

لەم ماوەیەدا، ئایینزایی و دابەشبوونی ئایینزایی سەریهەڵدا لە چەرخی 5 بە سەرۆکایەتی مەتران ناستریۆس و کوریلۆسی یۆنانی.

تێڕوانینی ناستریۆس، هۆکاری دابەشبوونبوو لە ناو کەنیسەی سریانیدا.

سریانی بۆتانو هەکاریو ئورمێ بوون بە نەستووری و تاکو هەنوکە، لە باکورو بەهدینانو هەولێر – ئەربل، بەغداد، هیندو کاریگەری لەسەر چین و مەگۆل و بۆ یەکەم جار لە مێژوودا بە کەنیسەی خاوەر ناسراوە، لە ناو ئاشووریدا، هەروەها بە خۆراوایش ناو براوە.

بەم پێیە، ئایینزای کاتۆلیکی خۆی سەپاند، لە ئەنجامی ئەم دوژمنکارییەداو بەشێك لە ئاشووری گرێدران بەم ئایینزایەوە.

بەڵام، برێك لە ئاسووری لە سووریيە ناسراوبوون بە مالیکی – مالکریو – مالیکری – مالیلکری.. پەیوەستی شاو پەیوەستی رۆما بە مەبەستی دابەشبوون.

لە سەدەی 7، مەتران مارون، لە کەنیسەی سریانی – یاقوبی، پچڕاو چووە پاڵ ڕۆما، ئاییینزایی مارۆنی، سەربەهەڵدا، بە زۆری لە لوبنان.
تاکو هەنوکە، مالیکی و مارۆنی، نوێژ بە زمانی سریانی دەکەن، لە کڵێسەدا.
چەرخی 18 – 19، دابەشکردنێکیتر ڕوویدا لە ڕێگەی میسیۆلیر، لە سوریەو تورئایدین.. بەشێکیان بوون بە پرۆتستان و بەشێکیان بوون بە کاتۆلیک.

## پوختەکەی:

سریانی ، کلدانی، مارۆنی ، کاتۆلیک.. هەرهەموو یەک نەتەوەو یەک زمانو، رۆشنبیرییەکیان بووە دوژمن، بۆ پەرتکاریو مەبەستی دابەشبوون هەمیشە لە بۆسە و سەنگەردا، خۆی مەڵاسکردووە بۆ سەقامگیربوونی ئەم جودایەو جیاوازییەو پەرتکردنو دابەشبوونە نارەوایە.

## دیرۆک:

لە دێرەوە تاکو ئێستەکە ئەم گەلە بە کێشەی ئازارو ئەشکەنجەو پەرتبوونەوە، دەتلێتەوە، لە ئەنجامی پێڕەوی ئەم پۆلاتیکی پەرتکردنەوە.
بیر لە دەستەڵات دەکاتەوە، دوای روخاندنی شاهەنشاهێتی ئاشووری بە دەستی میدو پارتیو کۆمەکی کلدانی 612 پ.ز..
هەرچەندە هاوبەشی دەستەڵاتبوون لەتەک میدو پارتدا لە بابل تاکو 539 پ.ز.

مێژووناس، جورجردی و پرۆفیسۆر ماتییف، سوورن لەسەر پەیوەندی نێوانی کەیخساری میدو نەبوبیلایسر، شای بابل، پتەوبوو، توانییان شاهەنشاهێتی ئاشووری، کۆتایی پێبهێنن، بە سوپای هاوبەش، ئومیت شازادە کچی کیخسار، خێزانی کوری نەبوبلاسەر نەبوخوزنەسر، ئەم پەیوەندییە، مایەوە تاکو 550 پ.ز.، ماوەی فەرمانڕەوایی مید.

ئاپاکی پارتی هۆی کەوتنی میدبوو، 550 پ.ز. بە سەرکردەیی داریۆسی یەکەم.

گەلی مید کەوتە بەر راونانو کوشتنو برین، پاکۆی زاناکانیو سەپاندنی رۆشنبیری خۆیان بەسەر میددا.

شالاوی گەورەی پارتی بۆ سەر بابل بوو بەهۆی کەوتنیان 539 پ.ز.. بەسەر هەرێمەکەدا فەرمانڕەوابوون تاکو هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی 330 پ.ز.، هاتنی رۆمان 260 پ.ز.، بە هێزێکی گەورەوە، میزۆپۆتامیا کەوتە ژێر رکێفیانەوە.

ملانێی ساسانیو رۆمانی لەسەر دەڤەرەکە تاکو 640 پ.ز.، دەستەلاتی ئیسلام، شاری نوسەیبین بوو بە سنووری نێوانی ساسانیو شاهەنشاهێتی رۆمان – بیزەنتی – بیزەنس.

بەری خاوەری بۆ ساسانی و رۆخی خۆراوای لەژێر چنگی رۆماندابوو.

جەنگو پێکادان لە نێوانیاندا بەرپابوو ماوە 8 سەدە، زانکۆو خوێندنگە، هەرهەموو داخرا.

ساسانیو کورد، ئایینی زەردەشتییان وەرگرت و کورد پەنایبردە بەر چیاکان، ئەگەرچی ساسانیش کوردبوون، رۆمانیش بوون بە کریستیانی، لە چەرخی 14 ز، بەکاریان هێنا بۆ مەبەستی رامیاری خۆیان.

کریستیانی، بلاوبۆوە، لە ناو گەلانی شاهەنشاهێتی رۆمانو جەنگی رۆمانو ئارمەبە بەرپابوو لە سەدەی 6-5 تاکو چەرخی 18.. زۆر لە کریستیانی گۆڕران، بە تایبەتی ئارتۆدۆکسی بەلگان.

رۆمان، گەلی ئاشوری راونا، لەبەر ئەوەی نەهاتنە ژێر ئالای کەنیسە و دێری سریانی – یاقوبی، بەو هۆکارە کەنیسەی ئەنتاکییە داخراو پەتریرکی سریانی دەستبەسەر کرا، 969ز، پەتریرک یوحەنا 8، پەتریرکیەکەی گواستەوە بۆ مەلاتییە تاکو 1058، لە ئەنجامی گوشاردا، گواستییەوە بۆ شاری دیاربەکر.

لە چاخی پەتریرك یونیسیوس یەحیا، یوحەنای 6، پەتریرکی لە نێوانی دیاربەکرو ماردینو دێرزەعتەرانو دێرەکاندا دەگوێزرایەوە، لە کێوە سەختەکاندا، دوور لە دەستەڵاتی رۆمان.

رۆمان، کزبوون 1293 چەرخی پەتریرکی 86 ئەغتیۆس کوڕی وەهیبی 5 تاکو 1932، بنەی پەتریرکی سریانی، دێر زعفەران ماردین بووە، دوای پەتریرك ئەلیاس شاکیر، چۆتە موسڵو هیند، لەوێ کۆچیکردووە.

دوای کۆچی، لە شاری حومس، کۆبوونەتەوە، پەتریرکی هاتۆتە شام، دیمەشق، لەتاو راونان.

ئاشوری، رازەی ئارەبو رۆشنبیریکردووە، وەرگێران لە دەربارەی یارانی پیغەمبەر (د.خ.) ئیسحاق کوڕی حەنین لە چەرخی ئەباسیدا، تەنانەت جێوار مەئمون بە ستوونی زانستی، ناویبردووە، کوڕەکانی وێژەی ئەرستۆو ئیفلاتون لە رامیاریو یاساییو دەستووریو هەتا داستانی هۆمیرۆس و ئەلیادە و ئۆدیسە، کە تیافلو نورفەلی وەریگێراوە.

ئیسلام، باجی خستونەتە سەر وەکو کۆیلە بەکاریهێناون.. بۆیە پێیانوتراوە، فەڵە، لە وشەی فەللاحەوە هاتووە.. پیغەمبەر (د.خ) ستەمی لەسەر لابردن، بەڵێنی داوە بە پەتریرك ئیشوباشید، لە چەرخی خۆیدا.

بەڵام ئوسمانی، ئازاری نەك هەر تەنها ئاشووری، بەڵکو راونانو ئازارو ستەمو زۆرداری بۆ ئەرمەنو کوردو هەرهەموو کریستیانی بووە، بە درێژایی دەستەڵاتی بە شێوەی درندەیی، دوای بنیادنانی شورەی چین، بە مەبەستی بەربەستی هێرشی تورك، بە تایبەتی چەرخی سەلجووقی لە ئەنادۆڵو دەستەڵاتی ئوسمانی 400 ساڵ لە چەرخی 16، تەقەلای تواندنەوەی گەلان، سەربڕین، کوشتارکاری بە ناوی ئاینەوە.

سوخرەو بێگاری هی کوردو نەتەوەکان، بۆ پێکهاتنی ئامانجی خۆیان.

ئەرمەنی لە مێژوو دەرهێنراو ئاوارەکراو لەتەك ئاشووریدا بەهەر چوار لای جیهاندا.. کوردیان دواخست سەدان ساڵ لە چەرخو چاخ، پەیوەندی گەلانیان شێواند و زەهراویکرا، بوو بە پەیوەندییەکی کوشندە لە نێو گەلە چەوساوەکاندا.. بە تایبەتی سەردەمی رژێمی کەمالیزم و کەمالی.

## کورد و شانشینی ئاشوور – ئاسوور:

لە چەرخی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییەتی ئاشوورەوە، تەقەلادراوە کە ناسنامەو پێناسەی نەتەوەیی کوردایەتی پابەندیو پەیوەستەگیو ریشەو ڕنچەڵەکی رەسەنێتی کوردیو کوردەواری لە شاهەنیشاهێتی ئاشور بسڕنەوە، ئەو راستیو دروستییەی کە هیچ کێشەیەکی لەسەر نییە، بەپێی ئەم بەڵگەو بۆچوونو سەرنجانە:

1- شوێنگە: شوێنگەی دەوڵەتی ئاشوور، بنکەو بنەی سەرهەڵدانیان، لە ناو ئاخو خاکو زەوی کوردستاندا، ئوستانی نەینەوا، مووسڵ، هەولێر، ئەربل، دیاردەکراوە.. دواجار گەیشتۆتە هەرێمی ئیلامو وڵاتی شامو میسر، کە لەتەك ئەخشەی خاکی کوردستاندا، هاوچوونیەکەو هاوجووتە، تەنانەت لەتەك ئەخشەی هاوچەرخی کوردستان.

2- نێو – ناو – Name:

دەوڵەتی ئاسوور، لە وڵاتو خاکی سوبارتودا، دامەزراوە، ناحەزانی ئاسۆریو دوژمنانی، بە فەرمانڕەوایانی سۆبارتۆیان دادەنێن، کە رەگو ریشەی پێکهاتەی میللەتی کوردە.

سۆبارتۆ – سۆباری – زێباری

زۆر رەوایە کە بڵێن، ناوی سۆبارتۆ ، دابڕێت بەسەر دەوڵەتی ئاسوریدا، واتە، ئاسور، سۆبارتۆ بووە.

ناوی سۆبارتۆ، بنەڕەتی وشەکە، لە سەرهەڵدانی چەرخی سۆمەرییەوە، لە سەرەتاوە وشەی ئوسار Usar، لە زمانی سۆمەریدا تەمەنی وشەکە 2500 پ.ز.

لـه زمـانی کوردۆنیـدا – کیشـی، ناوهکـه بـه شـێوهی؛ سـوار – ئاسـورا،
تهمهنی ئهم ناونانه، دهگهڕێتهوه بۆ 1500 پ.ز.

زاراوی ئاسورا، ههر وشهی ئاساره، تیپی ئا بووه به واو.

ئاسورا، له زمانی کیشیدا، ههمیشه لهتهك وشهی پاش به شێوهی سورپاش، بهکارهاتووه، مهبهست له زهویو خاکو وڵاتیبووه که پوختهکهی واتای ناوگهی، وڵاتی خوداوهندی خۆر، وڵاتی خۆر بووه.

تهمهنی بهکارهێنانی ئهم شێوهیه ههزار ساڵ پ.ز. بووه.

له چهرخی پارسدا، 500 پ.ز. ئهم ناوه بهسهر ناوهندو باشورو، له دواییدا باکوری دوورگهی وڵاتی شامدا دابڕاوه.

وشهکه، گۆڕانکاری بهسهردا هاتووه، بووه به سورستان، بووه به وشهی سریان، ناوی هۆزو بهرهیهکی ئایینی کریستیانییه.

له رووی جوگرافییهوه، تهنها بهسهر بهشێکی وڵاتی شامدا، دابڕاوه، که سورییه – سوورییه.

ئهسوار – ئههوار، واته، پهروهردگار، دروستکهر، لهتهك وشهی مزدا، ئاهورامزدا، هورمز، خودانی پژوه، المولی الحکیم، ناوی ناسراو، له زمانی کوردی هاوچهرخدا.

ئاسوار، سورییه – سوریا – سورهیا، ناوی کچه کوردو رهنگی سووره.

خێڵهکانی لولو، رۆڵی مهزنیان ههبووه، لهمهڕ دامهزراندنی دهوڵهتی ئاسورو فهرمانڕهواکانیاندا.

پێشینهی ئهم خێڵانه، نیشتهنیانی دهوڵهتی سۆبارتۆ، خۆری – هۆری ، سیروان، به ههرێمی کوردی فهیلی گوتراوه.

له سهدهی ئیسلامیدا، دواجار، ناوهکهی به شێوهی سۆران - سۆرانی میرنشین، بنکهکهی رهواندز بێت.

ئاسووری، ئاسوریان – ئاسوریها – ئاشوری، تیرەیەکی کریستیانی نەژاد سامی، زمانی سریانی پەیڕەوی نەستور و ئەسقەفی مەزن لە قوستەنتەنییە، بەشی زۆرینەی لە تورکیاو ئێراق، لە سەلماسو ئورمیەن.

فەرهەنگی عەمید حەسەن عەمید، بەرگی 1.

## کورد و ئاشوور:

سەنحاریب 705 – 682 پ.ز. لە 699 پ.ز. جەنگی کوردۆنین – داستانە لە دەڤەری کێوی جودی – گودی – گۆتی – گۆد – God – خوداوەند، ماوەیەکە لە تۆمارگەکانی ئاشوردا بە ناوی جەنگی 5 لە جەنگەکانی سەنحاریبدابووە.

خاوەرناس، مێجەرسۆن، ئەڵێ: ئابپری، کوردۆنیین، باکوری زاب.. شاتجلا تبلیسەر، ئاشوریو ئەوەکانی بە دانیشتووی دەڤەری دەجلە و فوراتو باکوری نیفانس، کێوی تۆرئابدین، واتە، ئوستانی دیاربەکرو خەرپوتو دێرسیمو چیای یونس – تۆرۆس، گەل کوردۆئیین ساڵی 401 پ.ز. تێدا ژیاوە.. ناوەندی چەرخی ئەخمینی، دوای شکستی مید و کوردۆئینانە، باپیری کوردن.

دوای روخاندنی مید، لە چیاکاندا خۆیان قایموەلاس کردووە، بە کورد ناسراون، ناوو مێژوو لەو کاتەوە هێرشی یۆنانو رۆمانو پرسی، شکستیان هێناوە، بەهۆی چیا بڵندەکانەوە.

تەنها ئاشوری چۆتە ناو ئەو وڵاتەوە، کە کوردستانە.

## کریستیانی – مەسیحی:

کریستیانی لە ئورشلیم – ئورشلایم، قودس، بیت لەحمەوە سەریهەڵدا، بەرەو ئەنتاکییە، لەوێوە بۆ دوورگەی قوبرس و رۆما، لە خۆراوا بۆ شاری رەها – ئورفە، هەرێمی باکوری کوردستان، لە باکورەوە.

شاری ئورفە – رەھا، بنکەی سەرھەڵدانبوو، بەرەوە خاوەرو روویکردە شاری دیاربەکر، بەرەو ھەدیاب – ئەربل، بۆ بیت گەرمای – گەرمیان – کەرکوك – ئارابخا، واتە کوردستانی باشوور، بوو بەھۆی بڵاوبوونەوەی زمانی ئارامی... سریانی بوو بە زمانی ئاسایی و گفتوگۆ و بوو بە زمانی میری، لە رێساو دەستووری کەنیسەی کۆنی خاوەر بوو بە ھاوتای زمانی یۆنانیو لاتینی.

کێونشینانی ئەو چەرخە، لەتەك گەلێ رەگەز تێکەڵبوو، ئەتنی، رۆم، فارس – پارس – پەراسو، مید، ئاوەند، کورد – کار، دوای ئەوانیش، ئارامی، سریانیو پاشماوەی ئاشووریو گلدانیو ھیتر.

کار سەقامگیر بوو بۆ مید، دوای کەوتنی ئاشوور و بوون بە زۆرینە و ناوەکەیان گۆردرا بە تێپەربوونی چەرخو چاخ و ناوی ھەرێمەکەش بە ناوی وڵاتی قردو بوو بە کوردستان، لە سەرەتای سەدەی 11 ز، زۆر لە گەلانی ھەرێمەکە، ئایینی کریستیانییان وەرگرت، کە بەر لەوە لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون، یاخود زروانی، بەر لە زەردەشتی، وەتەنی، بێباوەڕی بە ھەموویان، مێژوویەکو کەڵچەرێکیان پێکھێناوە لە دەڤەرەکەدا.

## چاوگ:


- رۆژنامەی وگن الشمس، ژمارە 16 – 17، نووسینی نوعمان نەشرۆ.
- ئایین و باوەڕ لە کوردستاندا ، کەریم زەند.
- فەرھەنگی عەمید حەسەن عەمید، بەرگی 1.
- تاریخ الآشوریین، الجزء الأول، م.س. لازیرف ، ترجمة أسامة نعمان، مطبعة دار الجاحظ ، بغداد 1970.

# تورکمان

## دێرکو نێولێنان

**نێولێنان:**

تورکمان، تورك + مان – ئوغوز – ئاغوز – رووسپی – ئازاد – ئوغوزمان، باپیرە گەورەی تورك.

گەلی تورکزمانی، ناوەندی ئاسیا، رەگو ریشەو نەژادیان، دەگەڕێتەوە بۆ خێڵانی ئوغوز – غز، لە چاوگی مێژووی ئیسلامیدا، لەتەك خێڵی تردا، لە زەویو خاکی مەنگۆلیا – غز – ئوغوز، گەلی دەشتەکی جەربەزەو دڕ – راووڕوتو تاڵانیو بڕۆو هێرشو هەڵمەتبەریو شاڵاوبردن بە مەڕوماڵاتەوە، رووبانکردۆتە نێوانی کێوەکانی ئۆراڵو گەزبین، لە نێوانی سەدەی 10، بەرەو خۆراوا، تێکەڵ بە کەلچەرو فەرهەنگی ئیسلامی بوون و پابەندی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوون.

چەکدارانی تورکمان، بە مەبەستی کاروباری خۆیی تورکمانی جێگیربوو لە باشووری ئێراق، لەتەك سەرهەڵدانی سەلجوقی تورك، لە خاوەرداو دەستبەسەراگرتنی پێتەختی ئەباسی لە بەغدادو داگیرکردنی چەند بەشێکی خاکی ئەنادۆڵی ئیستەکە، کە پێی دەگوترا، شانشینی بیزەنتی کریستیانی.

گەرتێکی ئەم تورکمانە، بوون بە پاشکۆی سەلجوقی، رووبانکردە ئێرانو ئازربیجان، دڕیان بە چیاکانی کوردستاندا بە ئەرمەنستانیشەوە.

ئوغوز، تێکەڵ بە کورد بوون.

ئەم وشەیە، ئەم نێوە، ئوغوز، لە زمانی کوردیدا وەکو ناوێکی ناسراو، تایبەتمەند بە مرۆڤی کورد، لەمەوە، وشەی تورکمان، بڵاوبۆوە، بوو بە ناوی سەردەم، بەسەر پاشماوەی ئوغوزدا دابڕا.. ئەوانەی ناوەندی ئاسیاو خێڵانی ئوغوز

بە گشتی لە چەرخی میرنشینی زەنگی، ئەتابیگی، لە دوورگەو شام و هەولێرو – ئەربل، لە چاخی سەلاحەدینی ئەیوبیدا..

تورکمان بوو بە هێزێکی سەربازی، بەشداری جەنگی خاچەکانبوون، شانبەشانی کوردو ئارەب.. کەرتو تیپێکی تورکمان، ئاق قوینلو، مەڕەسپی، ئالآو ئارمو دروشمی مەڕەسپیو مەڕە رەشیان قەرەقوینلو، بڵندو بەرز کردەوە.

ئاق قوینلو، قەرە قوینلو.. لە کوردستانو ئێرانو ئێراقدا، فەرمانڕەوایەتی شارە کوردنشینەکانیانکردووە، وەکو تەورێز و ئامەد و دیاربەکر.

کاتێ کە فەرمانڕەوایەتی کەوتە دەستی بەری توغرول، دەوڵەتی ئوسمانی، بەرپابوو، هاتەکایەوە. مرۆڤی خێڵانی تورکمان رێژەیەکی مەزنیان پێکهێنا، لە دەوڵەتی ئوسمانیدا، واتە لەو دەوڵەتەدا.

تورکمان، بە یەك زمان گفتوگۆو وتووێژ دەکەن، بە زاراو و شێوەی جۆراوجۆر، پەیوەستی ئەریتو رەوشی خێڵەکی رەسەن، جیاوازییان هەیە لەتەك تورك نشینانی تورکیا، لە رووی رووالەتو روخسارو تایبەتمەندێتی کۆمەلآیەتی نێو کۆمەلگاییەوە.

تورکمانی ئازربیجان، ئایینزای جەعفەری – شیعە گەریان پەسەند و بەگەنکرد، پابەندی بوون، دوای سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران..

بەلآم، تورکمانی باشووری کوردستانو ئێراق، زۆرینەیان موسڵمانی سونین.

ئوستاندارانی ئوسمانی، نیشتەجێیکردن، لە ناو شارو کەنارەکانیاندا، بە مەبەستی دروستکردنی پشتێنەو هێڵی ئاسایش، پچر پچر بە هێڵێکی لارو چەماوەو کەوانەیی، لە تەلەعفەرەوە، خۆراوای مووسڵ، بە کەرکوکدا تێپەڕدەکات، لە شاری مەندەل کۆتایی دێت.. نیو ملیۆن کەس پترن.

هەروەها، تورکمان لە ئەنەدۆڵو حەلەبو سورییەو ئێرانو خۆراسانو ئاوەند و ئەفغانستان، هەیە.

كۆمارى توركمانستان 1924 دامەزراوە، پێتەختەكەى ئەشقاباد، مۆناتى لە 6 مليۆن كەس پترە، توركمانى سونەى 65٪ ، كۆى گشتييە، لە دۆلى رۆبارى ئامودارىا و مرغاب، نيشتەجێو جێگيربوون.

چۆلى قەرەقوم، زەوى كۆمارى گرتۆتەخۆو داپۆشيوە.. دەكەويتە كەنارەكانى، دەرياى كەزبين، بيابانى كەركوم.

**وشەى توركمان**، تركمان – تركمن – توركمان – تەركەمان – تركماند – تورك ئيمان.

1- توركمانەندى فارسى – توركثاسا – نيمچە تورك، ئيسلامبوون، خێلى تورك ئيمان، خێلى ئوغوز، سەدەى 11ز ئەم ناوە، چەسپاوە، تورك ئيمان – ئيمانتورك – توركماند – ماند تورك.

بۆچوونيتر، تەرجمان – وەرگێر، تەرجمانى نێوانى ئارەبو توركى موسلمان.

تيرەيەكى ئێران، نيشتەجێ لە گورگانو توركمان سەحرا.

لە هۆزە ناودارەكانيان، يموت، گوكلانە.

توركمانستانى كاپكاس، پێرەوى ئايينزاى سونەو زمانى توركى، وەكو لە فەرهەنگى عەميد حەسەن عەميد بەگى، 1، ناويان هاتووە.

توركمان، لە وشەى خێلى قومانى سەلجوقييەوە هاتووە، بووە بە توركمان، بەپێى رێزمانى توركى، تورك + مان.. ياخود مەن.

ئەم پاشكرە لە زمانى توركيدا واتە؛ گەورەيى، مەنى، زۆربە، بێپايان، بەكاردێت... واتە، توركى گەورە، رەسەن، خوێنپاك، زۆرينە.

2- ڕێچەڵەك:

ئەو تیرەو خێڵە تورکمانەن کە لە ئاسیای ناوەندەوە، لە قۆناخی جیاجیادا، بە چەند هەنگاوێك لە خۆراسانو دەڤەرانی جێگیربوون، لە پاشدا بوون بە ئیسلام، بەرەو ئەنەدۆڵو ئێرانو خاوەری میانە کشاونو شۆڕبوونەتەوە، بەو بۆچوونە، کە تورکمان دەچنەوە سەر خێڵی ئوغوز، کە لە ئاسیای ناوەندەوە، کۆچیانکردووە، بوون بە 2 بەشەوە.

بەشێکیان، بە کۆچەری ماونەتەوە، بەشەکەیتری لە شارەکاندا، جێگیربوون.

ئەو تورکانانەی بوون بە ئیسلام، کەوتنە جەنگو شەڕەوە، لەتەك ئەو تورکمانانەی کە نەبوون بە ئیسلام.

لە دواییدا، ئوغزان بەرەو وڵاتی پەچەنەك pecenek نزیکی لێواری دەریای ڕەش، چوون، لەوێوە گواستیانەوە، بڵاوبوونەوە بە وڵاتە ئیسلامییەکاندا.

چەند دەوڵەتو میرنشینیان دامەزراندووە.

ئوغوز، ناوی ئیمپراتۆر، شانشینی تورك، ئوغوزخان، ئەو سوورناوەی پێبەخشراوە.

تیرەکانی ئەم خێڵە 24 ئەوەی ئوغوزخانی لێکەوتۆتەوە، ئوسمانی، سەر بە تیرەی قایی kayi، ئەم خێڵەن، سەلجوقی، سەر بە تیرەی کینك Kinik.

3- نیشتەجێبوون:

تورکمـان لـە ئێراقـدا چـەرخی سـوڵتان مـرادی 4، 1638، سـوپای سەفەوی، لە ئێراق شکاو شکستی هێنا.

بەشێکی ئەو هێزەی تورك، ماوەتەوە، نیشتەجێکراون، بە مەبەستی جوداکردنـەوەی هێڵـی پەیوەنـدی نێـوانی، ئوسـتانە تورکـەکانی بـاکورو ئوستانەکانی باشووری ئوسمانی بێت، بە مەبەستی پاراستنو ئاسایشی لە دەڤەرەکەداو پشتێنەی پارێزگاری بێت.

سەلجوقی، ویستوویەتی بەلای خۆیاندا رایانکێشن، کاتێ کە توغرول بەگ، هاتۆتە ئێراق.

سەلجوقی – قینك – کینك، Kinik بە ناوی سەردارو دەستەڵاتەوە، ئەگەرچی، لە تیرەی ئوغوزن.

ئەباس ئەزاوی، ئەڵێ: تورك، پێش مەگۆل هاتوونەتە ئێراق.

4- کـۆچ:

ئەرشەد هورمزی ئەڵێ:

بە قۆناغ هاتوون، ساڵی 54 ك – 673 ز.

ئەبـدوڵا زیـاد، 2 هـەزار تـورکی تورکمـانی هێنـاوە بـۆ بەسـرەو نیشتەجێبوون.

ئـەم تورکانـە، لـە سـوپای ئەمـەوییو ئەباسـیدا خزمـەتیانکردووە، بەشداربوون، چەندین جێنشینیان هێناوە و خزانویەتیانە نـاو سوپاکانەوە، ئەمە قۆناخی یەکەم.

قونـاخی دووەم، چـەرخی سـەلجوقی و نیشـتەجێکردنی تورکمـان 1505، کە توغرول بەگ پێی خستە ناو شاری بەغـدادەوە.. تـورکێکی زۆر، لەم شاڵاوەدا هاتوونو جێوار بوون.

چەرخی سەلجوقی لە ئێراق 1118 – 1194، ئەتابیگی مووسڵ، چەند دەوڵەتو میرنشینیەکی گرتۆتەخۆ، دوا دەوڵەتی ئاق قوینلو بایندەری 1508، لەسەر دەستی ئیسماعیل شا سەفەوی، کۆتایی پێهات.

سێیەم قۆناغ، ژمارە زۆرکردن، تورکمان سوپای سلێمان قانونی 1635 نیشتەجێکران.

تورکمانی مرادی 4، لە کوردستاندا جێگیرکران، مۆرکی نەتەوەیی بە زۆری داگیرکەر، گوڕدراوە، واتە مۆرکی کوردەواری بەپێی ئاماری 1957، 136,806 هەزار کەس بوون، لە کۆی ژمارەی هەموو ئێراق، 6,339,960 کەس بووە.. ئەم ئامارە سەرنجی تێدایەو لەم رێژەیە کەمترە 2٪ ی دانیشتوانە.

**پوختە:**

هەردوو وشەی تورکانو غز، یەك دەربڕینە لە چەرخی دەستەڵاتی سەلجوقیدا، لە مێژووی سیستاندا، بە هاتنی سەلجوقی بۆ ناو سجستان 428ك – 1036ز.

وشەکە لە مێژووی ئەبوفەزل بهیت 470ك – 1077ز، ئاماژەی بۆ سەلجووقی کردووە، هەروەها بۆ تورکانیش.

رەنگە، غزی تورکمان، بەر لە سەلجوقی هاتوون، دوای شاڵاویان.

زەین ئەخبار، ئەڵێ:

غز سەدەی 5 – 11 بە سەلجوقی وتووە، تورکمان.

مێژووناسان، تورکمانو غزیان جوداکردۆتەوە، وەکو مینۆرسکی، ئەڵێ:

سەلجوقی، بۆ ئەوەی خۆیان لە خێڵانی غز جودابکەنەوەو لەو خێڵانەش کە بەرهەڵستیانبوون، سوڵتان سەنجەریان بەدیلگرت 1153 – 1156، لە نووسراوی، تناول قبائل الترك، دانەری مروزی، 514ك – 1120 ز، بە تورکی ئیسلامی گوتووە، غز، کاتێ جەنگی نێوانیان، گروپی بەرەو خوارەزم، خوار زەمین، کۆچیـ...ـووە بۆ دەڤەری بچنك، لەمەوە بۆی چووە، مینۆرسکی هاوچونبوونی

ئیسلامبوونی غـزە، کۆنترین وشـەی تورکمانـە، نووسـراوەی، احسن التقاسـیم، هـی جوگرافناسی مـەزنی ئـارەب، مەقدیسی بشاری، 4 ك، باسـی شـاری بروکتـوبلاجی، کردووە، کە گوزەرگەی تورکمانی ئیسلام بووە...

لە ل 274، 5 275، ئەڵێ:

شای تورکمان، فەرمانڕەوای ئەودوا دیاری ناردووە بۆ خـاوەنی شـاری سـیرام، ئەسپیچاب.

تورکماننـد، وەکو تـورك، لـە نووسـراوی مـەحمود کاشغەری، دیوانی زمـانی تورك، سەدەی 5—11.

مێژوونووسی مەگۆل، بە گروپی غزی کۆچکردووی ناوبردووە.

تاجیکی، پێی وتوون، تورکمان.

دانەرێکیتر ئەڵێ: تورك — ئیمان — تورکی ئیسلام.

خاوەرنـاس، بریتسکـە ئـەڵێ: تـورك + مـان — Turk + man، وەکو لـە ئاسیای ناوەند.

چاوگی رووسی ئەڵێ: تورك، بێپاشگر.

شاهەنشاهێتی غز — پابغو بە 2 ناو، تورکمان — غز، ناوی بردوون.

E.Denison Ross، ئەڵێ، لە زاری فاسیرییەوە، ناو تورکمان، لـە تورکـو پاشگری مان — من، وەکو لە ئینگلیزیدا، ship یاخود dom.

وشەی من، بە تورکی واتە، سام، توند، مەزن دێت.

فەرهەنگی عەمید ئـەڵێ: تـرك Turk، تیرەیـەکی مـەزنی نـەژادی زەرد لـە کۆندا لە تورکستانو باکوری چین، نیشتەجێبوون.

مـەگۆل، ریشـتەیەکە لـەوان، سـەدەی 6 کۆچیانکردووە بـۆ ئێرانـو ئاسـیای گچکەو دەفەری ئەورووپاو کیشوەری جودا، هەنوکە ژیندەگی دەکەن، وەکو ئوسمانیو تورکمانو ئوزبەکو، قرغیز، شێوەی ئاخاوتنی جودا، تـورکی ئـازەری لـە ئازربیجـانو خمسو کەزبین.

زمانی تورکی، لە دەستەڵاتی غزو تاتارەوە لە ئێراندا هاتۆتە ئاراوە.

## کێشەی تورکمان:

ئەم کێشەیە، بەستراوە بە کێشەی بزافی رزگاریخوازی گەل کوردەوە، لێی‌دانابڕێت.. لەو رەوتەدا، هاوجووتە، لە ناو ئەو هاوکێشەدایە.. ئەمە نیشانەو هێمای چارەنووسی هاوبەشی گەلی کوردو تورکمانە، لەسەر زەویو خاکی پیرۆزمان.. هاوکاریو هاوبەشیو هاریکاری هەر بوونی مێژووییەو تەبایە، کە چەرخو رۆزگار سەپاندوویەتی.

گەرەکە هاوکاری یەکتربین، لەم قۆناخی رزگاری نەتەوەییەدا، لە کوردستاندا، لەم بارودۆخە ناسکەدا، لە ناو گێژاوی نێودەوڵەتیو نەتەوانیدا و هەرێمی و ناوخۆییدا.

ئەگەرچی، مافی رۆشنبیری 1970، بەهانی ئاداری مێژوویی زیادە تێپەرکاری تێدابوو، کە 90٪، خوێنندنگەی میری لە کەرکوکو چەند شارۆچکەیەك، کە رێژەیەك تورکمانی تێدایە، گوایا، ئارەزووی خوێندن بە تورکی دەکەن.

ئەمە لە رووی راستییەوە، کێشو سەنگێکی ئەوتۆی نییە.

## چاوگە:


- هورمزی ئەرشەد، و. کاروان ئەبدولا... گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی.
- رۆژنامە کوردییەکان، نووسینەکانی م. جەمیل رۆژبەیانی.
- زەند کەریم، جوگرافیای کوردستان، دەستنووس 1958.
- مجلة الأدب التركماني، د.س أحسن، ترجمة د. حسين علي داقوقي.
- فەرهەنگی عەمید حەسن، بەرگی 1.
- شجرة الترك، امير خيوة.
- گلشن خلفا، تورك تأريخى.

# گەلی جوو

## *Jew - Jewish*

**گەلی جوو:**

شانشینی یەهودا، مەملەکەتی یەهودا، لە فەلەستین – فەلەستان، لە هەزارەی یەکەمی پ.ز. فەرمانڕەوابوون، تەختی سلێمانو داود، لە مێژوودا، شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، چەرخی نەبوخوزنەسری بابلی 597 – 586 پ.ز. بە 2 جار بە دیل هێناونی بۆ شاری بابل، ئەمەیە سەبی بابل.

ئاشووری، 300 ساڵ درێژەی بووە، 911 – 636 پ.ز.، 15 شا، فەرمانڕەوایی کردووە.

دەستەڵاتی ئاشووری، ئەوانیش، تیرەو بەرەکانی گەل جووی بە دیل هێناوە بۆ ناو چیاکانی کوردستانو بڵاوبوونەتەوە، 280 ساڵ بە دوورخراوەیی، خۆیان ژیاندووە، بە کشتو چاندنەوە، خەریکبوون.

گەڕیدەی ئیسپانی، بنیامین نەتیلی، جوولەکەبووە، لە سەدەی 12ز هاتۆتە ئامێدی - ئاڤاهی مید، لە باشوورا کوردستان، ئەو سەردەمە 25 هەزار جوو، لەو دەڤەرەدا بوون، لە 100 ناوچە، لە چیای خەفیتان - خەفەتیان – حەیتون – هەفتون، چەرخی جێنشینی ئەباسی، موقتەفی بیلا، 530 – 555 ك، 1160 ز، موستەنجید بیلا، هاتۆتە کوردستان و وڵاتی فارس، لە ئیتالیا و یۆنانەوە، واتە ئەو گەڕیدەیە د. گرانت، ئەمریکی، هاتۆتە کوردستان، ئەڵێ:

جوو، ئەوەی ئەوانەن کە ئاشووری بە دیلی هێناونی..

بە ناو نەستوریدا، گەڕاوە، مزگێنیدەر، مژدەدەر بووە، هاتۆتە شاری ئورومیە، ئۆرۆمایە، 5 خوێندنگەی کردۆتەوە، فێری زمانی کوردی بووە، چۆتە باکورا کوردستان، 6 ساڵ گەڕاوە بە کوردستاندا.

ئەحمەد سووسە، ئەڵێ:

بوون بە جووی هەدیاب – هەولێر، کە دەستەڵاتیان گرتۆتە دەست.

نەزانی، دایکی هێلانە، جووبووە... نراجان، ئیمپراتۆری رۆمان لە ناویبردن.

یەکەم کۆنگرەی جوو، لە شاری پال Pall ی سویسرە 1807 بەستراوە بە سەرۆکایەتی، تیۆدۆر هرتزل.. نەخشەی ئایندەی دەوڵەتی جوو – عیبری کێشاوە بۆ گەلی جوو، لە فەلەستین.

پەیمانی بەلفۆر، بەڵێنی بەلفۆر، شایاری دەرەکی بەریتانی، ئەو بەڵێنەی گرتە ئەستۆ لە 1917، ئەو ناوتە هاتەدی لە 1948.

هەرچەندە دەربەدەریو رەهەندەیی هەندەرانو کاری هولۆکوست – شواح – فڕنی سووتاندنی نازیو فاشیست، کوانووی سووتاندنی 5 ملیۆن جوو، مەرگی زۆرو قوربانی فرە، ناوی ئیسرائیلی ئەسرپیەوە..

هولۆکوست، وشەیەکی یۆنانییە، شواح، وشەیەکی عیبرییە، واتە فڕنی سووتاندن – محرقة.

گەلی جوو Jew ، لە کوردستاندا، کەمینە، کەمایەتییەکی ئایینی بوون. 30-25 هەزار پتر بەر لە کۆچیان 1919 – 1951... گەورەترین کەمایەتی بوون، پاشماوەو جێماوی دیلی ئاشووری بوون، لە مەملەکەتی ئیسرائیلو یەهوداوە، هێنابوویان و نیشتەجێی کردبوون، لە دەڤەرو ناوچە چیا کەنارەگیرەکانو دوورەکان، لە ساڵانی 723 – 722 – 701 پ.ز.

لە کوردستان جێگیربوون، گوندو دێهاتیان تێدا دروستکردوو بڵاوبوونەوە بە ناو کوردنشینەکاندا و بە درێژایی چاخوچەرخ، بوون بە رەگەزی پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردەواری، لە کوردستاندا.

زمانیان، تێکەڵبوو بە زمانی کوردی و وشەی تێکەڵیو جۆری ژیانو پۆشاکو خۆراکو کاری رۆژانەو پەروەردەی ئاژەڵو، کاری کێڵگەو کشتو چاندنو رستنو خۆدانەپاڵ خێڵو کەسێتی کۆمەڵگەی کورد، بە مەبەستی خۆپاراستنو مانەوە، بە تایبەتی کەسێتی بەهێزو ناودار وەکو شێخی نەمر، مەحمود حەفید، کە بە باشی نیگابانی کردوون، لە چەرخو سەردەمی دژوارو تەنگژەدا.

گەڕیدەی جوو، بنیامین تەحلیلی، ئەمە دەسەلمێنێ کە 25 هەزار جوو، لە چیاکانی خەفتیان، سنووری وڵاتی مید، کە پاشماوەی دیلەکانی شەلمانەسری شای ئاشووریە بوون.

پێش کۆچیان بۆ ئیسرائیل، لە شارەکانی کوردستاندا بە بڵاوی دەژیان، لە هەولێرو کەرکوکو سلێمانیو دهۆکو ئامیدیو ئاکرێو زاخۆو زێبارو هەڵەبجەو پێنجوینو قەراخ، تەنانەت 2 گوندیان هەبوو لە نزیکی دهۆك، سندۆری باکوری دهۆك بە چەند کم ڕێگەی کۆنی ئامێدی.. هەنووکە بەنداوە، کەوتۆتە ناو بەنداوی دهۆکەوە.. هەروەها گوندی بیت تەنور لە بەرواری باڵا، باکوری ئامێدی، بە زۆری لە گوندی براش، لە بەرواری ژێرچەند کەنیشتەیان هەبوو، لە دهۆکو ئامێدی، 2 کەنیشتە، لە سندۆرو بیت تەنور، گۆڕستانیان هەیە بە ناوی بنخڕان.

داود کوڕی یوسف، لەوێ کۆچیکردووە، 1620ز، گۆڕی خێزانەکەی، خاتو نەجات، نزیکی کەنیشتەی جووە لە ئامێدی.

لە شارەکانی کوردستاندا، گەڕەکی تایبەتییان هەبووە..

توێژەرەوەی کۆمەڵایەتی، هەنری فیلد، لە نووسراوەکەیدا، ئەنترۆپۆلۆژی ئێراقدا، ئەڵێ:

شێخەکانی گوندی سندۆری کوردی جوو، لە بنەڕەتدا بە ڕێچەڵەك، جووی فەلەستین، پاشماوەی دیلی ئاشوورین، کە لە چەرخی سەنحاریبدا، 701 پ.ز. لە چیاکانی کوردستان، جێگیربوون.

بزاڤی سەهیۆنی جیهانی، سوورە لەسەر بردنیانو کۆچبارییان، پتر لە جووی ئێراق، واتە، بایەخو بەها پتر دراوە بە گواستنەوەی جووی کوردستان، بە هۆکاری گەلی چیانشین، تەندروستو بەهێز، کاروپیشەی جووتیاریو ئاژەڵداریو باخو کێڵگەو بێستان، بە مەبەستی بەکارهێنانیان لە کیبوتزاندا، کامپ نشین و ئۆردوگانشینی جەلیلی شاخاویو خاوەن شەقڵو مۆرکی چیا نشین، دوای کۆچیان 1919 – 1951.

لە ڕووداوی ڕێکخراوی، هشوارەی جوو، دژی دامەزراوە جووەکانی بەغداد 1950 – 1951 بە مەبەستی گوشار خستنە سەر بەرەی جوو، لە بارەی کۆچکردنیان بۆ ئیسرائیل.

مۆسادی ئیسرائیلی، درێخی نەکردووە لە کوردستاندا بۆ سەقامگیربو جێگیربوونی ئیسرائیل و پەیوەستی بە شۆڕشی کوردەوە.

دێید کمحی، کارگێڕو ڕێبەری گشتی وەزارەتی دەرەوە، لە سەرەتای دروستبوونی هاوکاریو کۆمەکدا، ئەوەی کە ژەنراڵ ڕۆفائیل ئیتان، سەرۆکی سوپای ئیسرائیل، سوپاپود، لە نووسراوەکەیدا داستانی سەرباز، لە دیداری کوردوستاندا و کۆمەکی بە کورد.

سەرۆکی مۆسادی ئیسرائیلی ژەنراڵ نسفی زامیر 1971، پەیمەندیکرد بە سەرانی شۆڕشی کوردەوە، پەیوەندی توندوتۆڵ لەتەک ئارییەلشاروون، کۆلۆنێل موردەخای هودا.

## گەڕانەوە – جووی کورد:

دەرفەرتی دوای جەنگی کەنداو، ڕەخسا بۆ سەردانی کوردستان، لە ڕێی تورکیاوە بە تایبەتی، جووی کورد لە ئیسرائیل بە مەبەستی شادبوونەوە بە تاموبۆی ژیانی کوردەواری و چاو ڕەشکردنەوە بە دیدەنی کوردستان و ئاواز و سرووودی ژیانی.. بەو مەبەستە 2 دەستە جووی کورد هاتوونەتەوە بە ناوی تۆریستەوە – گەشتیاری، لە وەرزی هاویندا، بە ژمارەی زۆر، ئەوانەی کە تێیدا لەدایکبوون، سەروماڵی خۆیان هەرهەمووی دادەنێن تەنها بۆ سەردانێك.

1988، دەستەیەك لە جەوانانی ئیسرائیل بە سەردان چوون بۆ ئەڵمانیاو ئیتالیا.. لاوانی کۆتەنیم – کەتەمۆنیم، نزیکی ئورشلایم، قودس، هەڵپەرکێی کوردییان هەڵبژارد، ئەمانە یەکەمین نەوەی جووی کوردستانن.

نعوز زیون – کاستەڵ، نزیکی قودسە، کۆمۆنێکە زۆربەی جووی کوردستانە، سەرۆکیان، ناسائیل کابای پابەندی زێدەن، زاینکە.

ئەم 2 کۆمۆنە، گیانو هەستی کوردایەتییان زەقو ئاشکرایە، هەتاکو هەنوکە پێکەوە دەژین، زمانی خانەوادەییان زۆربەی کوردییە، ئاوازو مۆسیقاو هەڵپەڕکێی کوردی باوە لە ناویاندا.

جووی کوردستانی باشور لە 1950 – 1951، سەرەتای دامەزراندنی میری ئیسرائیل، گەڕاونەتەوە.

جووی خۆراواو خاوەر بە سیفارادیم و ئەشکەنازیم ناسراون.

جووی کوردستان، لە نیوەی دووەمی سەدەی 18، دەستیانکرد بە گەڕانەوە، زۆربەیان روویانکردە قودس.

جووی کوردی، رەنجدەر، شاخاوی، وەرچەرخانی، ئابووری رووبدا، سەرچاوەی ژیانی چاکتریان بۆ رەخسا، پلەی دارایی، کۆمەڵایەتییان پارێزرا، لە کوردستان بێمایە و سەرمایە، سەختی ژیان جیڕبوونەوە، فرۆشیاری دەستگێڕی پیشەیانبوو... لە ئیسرائیل ژیانیان، لە بارترو تێروتەسەلتر بوو.

دانی رۆنیشتاین، رۆژنامەنووسی قودسی خۆی تەرخانکرد بۆ فێرکردنی زمانی عیبری بۆ جووی کوردستانی.

گۆڵدامایر، سەرەك شاپارانی ئیسرائیل، میوانی شکۆمەندی دامەزراندنی کۆمەڵەی جووی کوردستانی بوو 1973.

کۆمەڵە 1970، کەوتە جموجووڵ، لەسەر کیسەی پارتی کارگەرانی ئیسرائیل، کەلەپەرو فۆلکلۆری نەتەوەیی کوردییان بوژاندەوە، بە تایبەتی، سەهرانە، جەژنی بەهار.

لە پارکە گەورەکاندا، هەڵپەڕکێو سترانو گۆرانیو رەشبەڵەك، سەهرانەی 1988، سەرانی 2 پارتە سەرەکییەکەی ئیسرائیل، بەشداربوون.

گۆڤاری، هیتاداشوت، لە ماوەی 17 ساڵدا، 5 ژمارەی دەرچوو، گۆشەی تایبەتی تێدا تەرخانبوو بۆ بایەخدان بە مێژوو، فەرهەنگی جووی کوردستان.

حەبیب شەمعون، کێشەی کوێرەوەری کوردی گەیاندە بەرنامەی کاری پەرلەمانی ئیسرائیل.

﴿ گۆڤاری، ئەمرۆی رووناکبیری ژمارە 1 ت 1997 ﴾

**مۆساد:**

ڕۆڵی دەزگای پاراستنو ئاسایشی ئیسرائیل لە ماوەی 1961، کورد – ئیسرائیل، لە زاری د. مەحمود ئەلی ئوسمانەوە:

کوردستانی نوێ، ژمارە 1522، 1524، 1525، 1526، 1527، ڕۆژی 21، 23، 24، 25، 1997/12/28.. دۆسیەو پەروەندەی کورد – جوو.

شلۆمۆنکیمۆن، لە نووسراوەکەیدا ( الموساد في العراق و دول الجوار )، د. مەحمود ئەلی ئوسمان بە 2 زنجیرە لە گۆڤاری ( ئەلوسەت – لەندەن ) 1968 – 1973، بە هاوڕێیەتی سەرۆك بارزانی ئەمر چۆتە ئیسرائیل، دروستبوونی سێگۆشەی ئیسرائیل – ئەمریکا – ئێران.

شای ئێران، کۆڵەکەو ستوونی بووە..

سەرۆك بارزانی ئەمر، بە نیازی گەیشتن بە ئەمریکا ئیسرائیلی بە چاکترین ڕێگە زانیوە.

ئەم نهێنیە دوای شکستی شۆڕشی کورد 1975، ئاشکرابوو، هەر لە شەستەکانەوە، لە ڕێی، د. کامەران بەدرخانو عیسەمەت شەریف ڤانلی و ڕۆژنامەنووسانەوە، لە 1963، دەرکەوتووە، ئێران ڤۆزتیەو بۆ بەرژەوەندی خۆی، ڕازگری بیر و دەفتەری سیاسی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح بووە.

1967، ئیسرائیل داوای کۆمەکی لە کورد کردووە بۆ وەشاندنی گورزێ لە سوپای ئێراق.

بارزانی ئەمر، ئامۆژگاری ئێراقی کردووە کە ئەجەنگێن لە تەك ئیسرائیلداو پێی گوتوون، ئەیدۆڕێنن.

تاهیر یەحیا، دماینده بووە، داوای وەستانی شەڕیکردووە لە سەرۆك بارزانی ئەمر، ئەویش قبوڵیکردووە... داواکەی ئیسرائیلی ڕەتکردۆتەوە،

نەخۆشخانەی مەیدانی ئیسرائیل لە کوردستاندا، بە ئامانجی کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئێراق، کراوەتەوە.

ئێراق، هەمیشە جێی مەترسی ئیسرائیلە، لە پلەی دووەمدا میسر.

دوای مۆرکردنی پەیمانی رووسیا و ئێراق، 2 پزیشکی ئیسرائیل لە کوردستان کاریاندەکرد و بوون بە 3 دکتۆر، وێڕای کۆمەکی سەربازیو داریی مەمرمو مەڤژی، ئەوەندەی کە کار نەکاتە سەر تەنینەوەی بزاڤی کورد.

لە تورکیاو ئێران، چەکی کۆنو ئەوانەی لە جەنگی ئارەبدا دەستیانکەوتبوون.

تەوەری پەیوەندی ئیسرائیل – کوردستان – تەهران کەناڵی پاریس هەبوو.

د. کامەران بەدرخان لە چلەکانەوە پەیوەندی هەبووە.. نووسراویان لەسەر کوردستان نووسیوە.

سەرۆکی مۆساد، مائیر عمیس، دواتر، زلفیزامیر، کارگێڕی گشتی شاپاری دەرەکی، دیفید کیمحی، مێجەری پاراشوت تسوری حاجی، یەکێ لە داینەدەکان کە هاتۆتە کوردستان، حاییم لیکوب، پلەی تاج، پاراشوت بۆ مۆساد کاریکردووە، ناوی ئیسحاق عیادی بووە.. لە باڵیۆزخانەی تەهران کاریکردووە، بە ناوی ئەفسەری مەشقەوە، دەهاتن.

لە ئیسرائیل، سەرۆك بارزانی نەمر، بەر لەوەی چاوی بە سەرەك وەزیران بکەوێ، داوای حاجی خانو داودی کردووە، کە بیبینێ، لەوێ، ناوی دیفید جیا بووە.. لە ئیسرائیل بارودۆخی باشنەبووە... داوایکردووە، کە خانوویەکی چاکی بدەنێ.

ئیسحاق مۆردەخای، ئاکرێیبووە، لە تەمەنی 6 ساڵیدا گەڕاوەتەوە بۆ ئیسرائیل، وەزیری بەرگرییە..

لە ئیسرائیل 2 هەزار جووی کوردستانی هەیە، مەڵبەندی رووناکبیریان هەیە، لە تەلئەڤیف – تەل ئەبیب، مۆردەخای 1965، دیفید کیمحی، هاتۆتە کوردستان، بەرپرسی گەورەی وەزارەتی دەرەکی بووە، لە چەرخی لیڤی ئەشکولدا.. کیمحی، جووی ئینگلیزە، رۆشنبیرێو بیروڕای باشی بووە دەربارەی کورد، بۆ ئێراق، فانلی- ( وانلی عیسمەت )، کاریکردووە و زانیاری داوەو ئەو نهێنیەی گواستۆتەوە بۆ ئێراق، لە بەڵگەنامەکانی ئێراقدا، دەرکەوتووە.

دوای 1991، ئەمە دەرکەوتووە، بۆ لیژنەی مافی مرۆڤ لە U.N.

## پرۆژەی ئاسایش:

ئەم پرۆژەیە رەگوڕیشالی مێژوویو برێک پێودانگی رامیاریو جیۆپۆلیتیکی هەیە، بە ئارمانجی پرۆژە ئاسایشییە تایبەتمەندییەکەی، بە درێژایی ژیانی سیاسی جوو، کە چارەنووسی کۆی کردونەتەوە، توانییان لە 1948دا دەوڵەتێ دابمەزرێنن، کە لە سەرەتای 721 پ.ز.، هێڵە سەرەتاییەکانی ئەم پرۆژەیە داڕێژراوە، لە چەرخی هێرشی ئاشوورییەوە بۆ سەر دەوڵەتی یەهوزا لە ئورشەلیم، هەڵتەکاندنو دارمانو روخاندنی لە 582 پ.ز... جا لەو کاتەوە، نەوەی ئیسرائیل پەیمانی تۆڵەسەندنەوەیان داوە، بیریان لە بنیادنانەوەی دەوڵەتی یەهوزا – ئیسرائیل، کردۆتەوە، لە دیواری گریانەوە – الحائط المبکي، نوێژیانکردووە، نزاو داوایانکردووە، کە بگەڕێنەوە بۆ زەوی جێژوان – ارض المیعاد – ئیسرائیل.. هەستیان بە پێویستی ئاسایشیو ئارامیو هێوری کردووە، لە بواری ئابووریو بازرگانیدا، لەو هەموو وڵاتانەی کە تێدا دەژیان، بەر لە کۆبوونەوە، زەمینە خۆشبوو بۆ بانگەوازی مانفیستۆ بیلۆ، کە رێگەی خۆشکرد بۆ بەستنی یەکەم کۆنگرەی 1897 لە شاری بازل سویسرە، بە سەرۆکایەتی جووی مەجەڕی تیۆدۆر هرتزل.

حاخامەکان، لەم روانگەیەوە، نەخشەی تیۆری ئاسایش بە بابەخەوە سازکرا، لە بواری پەیوەندییەکاندا.

# ئیسرائیل ISRAEL

**تأريخ بني اسرائيل من أسفارهم**

**محمد عزة دروزه**

**1389هـ – 1969م – المكتبة العصرية**

**صيدا – بيروت.**

**ئیسرائیل، وشەیەکی ئاوێتەیە، ئیسرا + ئیل = هێز + ئیلاه = هێزی خوداوەند، خوداوەند هێزە ، الله قوی.**

**ئیسرائیل، سووڕناوە Surname، نازناوی یاقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمە... دوای زۆرانگرتنو زۆرانبازی لەتەك فریشتەدا ئەم سووڕناوەی پێبەخشراوە.**

**المنجد في الأعلام، چاپی 26.**

**یاقوبو ئیسو، جووتە – دووانەبوون، لە منداڵدانی دایکیاندا، زۆرانی لەتەك ئیسوی برا گرتووە، پێشبڕکێی کردووە، بۆ ئەوەی زووتر بێتە ناو جیهانەوە، لە ژیانیشدا، ڕێزی لێگرتووەو سەرپێچی نەکردووە و ڕێزی برا گەورەیی ڕەچاوکردووە.**

**ئیسرائیل، واتە، خوداوەند بەهێزە.. لە تەوراتدا، ئەم ناوەو لە دواتردا بە هەموو گەلی عیبری وتراوە Hebrow.**

**عیبرانی، زمانی گەلی جووە، یەهودی، گەڕانەوە بۆ ڕەواو هەق.**

**ناوی ئیسرائیل، لە هەڵبەستێکی نەخشێنراو، هێڵکاریدا لەسەر دیواری کارنەك، نووسراوە، لە سەرکەوتنی مۆینتاخ، شای خێزانی 19، لە 1225 –**

1215 پ.ز.، خێڵێکی ئیسرائیلی ڕەویون، بە ستەمکاری، بەر لە فەرمانڕەوایی ئەم شاهەنشایە.

ئیسرائیل، نووسراوی پێکهاتە، سیفری تەکوین - سفر التکوین.

ئەوەی یاقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمن.

ئیسرائیل، دووەم ناوە، خوداوەند شا، ئەم ناوەی پێبەخشیون، سفر التکوین، چیرۆکی بوونەوەر، لافاوی نوح، سەرهەڵدانی ئیبراهیم، هاتنی بۆ زەوی کەنعانو کینانە، فەلەستین، میسر، تا کۆتایی ژیانی یوسف.

چیرۆکی سەرهەڵدانی پەیامبەر موسا، (د.خ.)، سەرسامییەکانی، دیلی جوو، سەبی بابل، لە سێیەکی یەکەمی سەدەی 6 پ.ز.

ناوی فەلەستین – فەلەستان ، لە شیرازەی ڕەوشی ئیسحاقدا.

ڕووداوی ئیسرائیلی، هاتنیان بۆ زەوی کەنعان، کۆچی موسا و مردنیو ناشتنی لە زەوی موئاب.

گۆڕی نادیاری ل 5 سیفری پێکهاتەی تەوراتدا هەیە، تەورات، بە زاری هەورامی، تا – تو – هەتاو – ڕووناکی - ڕات – ڕێنمایی، وڵتە، نور و هدی.

هەندێك دەڵێن، هەموو نووسراوانی چاخی دێرین، العهد القدیم Antion times – Olden times، گوزارشتە لە تەورات.

بەرێز موسا (د.خ.) 40 شەو لە کێوی سینا، توور بەبێ خۆراك ماوەتەوە، وتەو پەیمانو چاخو 10 وشەکەی نووسیوە، لە تابوتی خوداوەندا.

دوای کۆچی موسا، لە ڕوونووسی پرۆتستانیو کاتۆلیکدا لە تابووتی چاخدا، سلێمان لە شاری داودەوە بردوویەتی بۆ پەرستگە.

چیرۆکی ئیبراهیم، برای هەمێ، هەموان، بە شێوەی کرمانجا زووری، خێڵو ئەوەو نیژە و مەنجەنیقو ئاگرو گفتوگۆی لەتەك شاهدا، ڕوونبۆتەوە.

بە ڕاو بۆچوونی نووسەرانی ئەم دێڕانە، ئیبراهیم – برای هەمێ – برای هەموو – هەموان، لە خێزانێکی کوردە، لە هۆزی جاف، تیرەی کەهروتایش، لە 1950 پ.ز.، کوڕی ئازەر سورناوی باوکی، پێش پەیامبەرێتی.

سارای خێزانی شازادەیەکی هەورامان بووە.. لە گوندی باریی، سەر سنوور، خوارووی تەوێڵە، خۆیو خێزانی نیشتەجێبوون.

هەر لەم گوندەوە، نزیکردووە 4 مەلەکە گیانیان کراوەتەوە بە بەردا. هەر پارچەیەکیان لەسەر کێوێکەوە.

چیرۆکی مەنجەنیقو مەلەکان، لە تەوێڵەی هەورامانو کێوەکانی، روویداوە. گرۆپێك باوەڕی پێدەهێنن، باوکی نەبێ..

هاتنی ئیبراهیم بۆ کەنعان، فەلەستین، لە ئوری سۆمەرەوە، ئورای – ئوراها – ئورفەی کوردستانی باکوور لەتەك، کوڕیو سارای خێزانیدا و کوڕەزا کۆچکردووە، هارون، هاتونەتە هەڕان، لەوێوە بە فەرمانی خوداوەند، خۆیو خێزانیو لووتی برازای هاتونەتە زەوی کەنعان.

ئەم کارە، پەیوەندی بە تاریخ، ئازەری باوکییەوە نییە، لە رۆبار دەپەڕنەوە، عبر – عیبر.

**عیبری Hebrow:**

عیبر – پەڕینەوە، بڕینو شەقکردنی ئاو، بێوچان بێوەستان، هەر لەوێ پەرەیانسەندو زۆربوون.. ئور – شار – پایتەختی سۆمەر، شاهەنشاهێتی ئارامی، 2جۆمان، میسوپۆتامیا Mezopotamya ، شەپۆلی ئارامی، بەو ناوەوە بووە.

عیبرانی، نەوەی ئیسرائیلن، ئیسرائیل نەوەی یاقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی کوڕی ئیبراهیمن.

ئیبراهیم، بە ئابرام – ئەبرەحیم – أب رحیم – عیبرانی ناوبراوە.

عیبریو، لە 2 پەڕەی بوردی سەدەی 13 پ.ز. چاخی رەعەمسیس 2 لە خێزانی 19، لە 1292 – 1225 پ.ز. لە مۆزەخانەی لایە Lide ، لە هۆڵەندە. زانا ساباش.. وەرگێری لە زمانی میسری کۆنەوە، 2 پەیامە، نامەی یەکەمیان، کۆسەر نووسیویەتی وەڵامی سەرۆك بکنقتاحە، دەرنەنجامدانی کارو خۆراکی داوە بە عیبری. ئەوانەی کە پەڕیونەتەوە، لە بەرد کێشانی ساختمانو بینای شارە عەمسیس مریمانان..

دووەم نامە، کینا نووسیویەتی بۆ سەرۆك کیچانا، فەرمانی بە ئەنجام گەیاندووە، لە ئاکاری عیبرییەکان.

بەردکێشان بۆ پەیکەری خۆر.. لە باشووری منف.. عیبریو، ئەوەی ئیسرائیلن لە میسر، پەرەیانسەندووە.. ئەمەیە ناوی عیبری.

نامەکەیتر، لە تەل ئەمارنە، پایتەختی فیرعەونەکان لە باشووری قاهیرە بە 500 کم، نامەیەکی خشتی سوورەوەکراوە بە زمانی کە ئەو شارە، ئەتون ، خێڵی دەشتەکی – رەوەند – خابیر – خبر – خەبەر – چاخی.

ئەخناتون، شاهی خێزانی 18 لە 1400 – 1380 پ.ز. نێوانی تەعبیر – خابیر – عابیر، لە مێژووی میسردا.

بزافی هیکسۆس – هەقسۆز – شوانکارە، شکستیان، ئەوەی ئسرائیل لە میسر، دەرچوون، بە رابەریو پێشەوایی پەیامبەر موسا د.خ.

ئەوانەش کە مانەوە لە میسر، پێیانوتراوە عیبرانی.. ئیبراهیم، خێڵەکەی لە رەچەڵەکی خابیر – عابیرە.. لە یەکەم خانەوە لە 2 چۆمانەوە – میزۆپۆتامیاوە بۆ فەلەستین.

هاتنی ئیبراهیم، لە شاری شەکیم، نابلس، گوزەرگەی بحبرون – شاری خەلیل، روونەو ئاشکرایە.

هۆری – هۆرییەکان، ئەوەی ئیسو کوری ئیسحاقن لە زەوی ئادوم، باشووری خۆراوای ئوردون.

کۆرەوی ئیسرائیل، لە میسرەوە، سەدەی 13 پ.ز.، دوای فەرمانرەوایی رەعەمسیس 2، بە سوخرەو بێگار گیراون بۆ پرۆژەکانیان.

لە پەرەی بوردی، بە قۆناخ، بۆ سینا، روونکراوەتەوە.

دەرچوونی لاوی بە پیتی روونووسی پرۆتستانیو سیفری کەحبار، بە ناونانی کاتۆلیکی 49 لاپەرە، 27 پەرەگراف، دەرکەوتووە.

## مەملەکەتو ژیارو شارستانیتی ئیسرائیل:

ئیسرئیلی لە خاکو زەوی کەنعانندا، مەملەکەتی یەهودا، جێگیربوون، تێکەڵی نیشتەجێیەکانیشان بوون، لە دێرەوە.

یەکەم شاهەنشا، شائوڵ بوو، پەیامبەر سمۆئیل، ئاماژەی بۆ کرد، کە بیکەن بە پادشا، بە سۆنگەی قارەمانێتیو دلاوەرییەوە، بە جەنگەکانندا، لەتەك عەمالیقەو دەشتەکییەکانی باشووردا.

لــە چــەرخی ئەمــدا، ئیســرائیلی ســەرکەوتووبوون، قارەمــانو دلاوەری دەستنیشاندەکرد، لە نێوانی ئەوانەدا، داود د.غ.، لە بەرەی سیبت – یەهودابوو.. ئەمیش خۆی بە شیاو دەزانی بۆ پایەی پادشاهێتی، چونکە شائۆل لە بەرەی بنیامین بوو.

داود، 1016 پ.ز. بوو بە پادشا، وڵاتی یەهوداو بیت لەحمو حەبرونی پایتەختی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە، سەرکەوت، لە باکوری بیوس – قودس، لە چەند جەنگێکدا، کە بە سەرکەوتنی ئیسرائیل کۆتایی هات، جالوتی تێدا کوژرا.

داود، بەرەی جووەکانی یەکخست، پایتەختی گواستەوە بۆ شاری بیوس، کە بەسەر دەریاچەی لووتدا دەیڕوانی، رۆباری ئەردەلان لە لایەکیەوە و جەمسەری رێگەکان بوو.. دوژ – قەڵای سەهیۆن، پارێزگاری‌بوو، کردی بە پایتەخت.. ئیسرائیلی پابەندکرد بە پایتەختی نوێوە، کە بە ئورشەلیم – ئورشلایم – شاری ئاشتی – قودس، ناو دەبرا.

هەروەها دەستبەرکاربوو لە دروستکردنی پەرستگەی پەیکەر – هەیکەل، بە ناوی خودلوەندەوە.. لە هەموو لایەکەوە بۆی دەهاتن.

دەستەڵاتیان پەری سەند، تاوەکو دەریای سوورو قەدپاڵەکانی چیای لوبنانو ئانتی لوبنان.

ئەبشالومی کوڕی – باوکی ئاشتی لێی هەڵگەڕایەوە.. لەشکری هەردوولا لە محتابەم، بەرەنگاری یەکتربوون، ئەبشالوم کوژرا و باوکی نیگەران بوو بۆی.

داودشــا، ســەرۆکی مەملەکــەتی ئیســرائیل، خۆشەویســتی گــەل، خــاوەنی دەستەڵاتی ئایینی و سەربازی، سوورناوی پادشاو پەیامبەری بۆ رەخسا، دوای

شائول شاو پەیامبەر سمۆئیل، خۆی قایمو پتەوکرد، لە پایتەختی ناوەندی ولاتدا.
فارەمانو سەرکردەو دۆستی بەئەمەکی وەکو یونابی، لەخۆ نزیک کردەوە، کە بوو بە ناووکی سوپای 24 هەزار جەنگاوەر.. بەم سوپا بەهێزە، هەموو دەڤەرەکانی کۆنترۆڵکرد، لە مووابیو ئادومیو عەمالیقە، سنووری مەملەکەتی فراوانکرد، گەیشتە دەریای سوورو سووریە.

## سلێمان:

دوای کۆچیدوایی هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی 975 پ.ز.، دوای کوشتنی ئەدونیای برای و کوشتنی سوپا سالار یوئاب و دەستبەسەری سەرۆکی کاهینەکان – پارسا. مەملەکەتی ناوەدانو فراوان لە چەرخی سلێماندا و ئاواتی لە پارێزگاری ولاتو یەکیەتی ئیسرائیلدا، لە ژێر ئالای شاهەنشاهێتی خۆیدا.
دوژی تەدمری دروستکرد، سیاسەتی ناوخۆی یەکسخت، ولاتی دابەشکرد بە 12 ئوستانەوە، هەر ئوستانەی فەرمانداریکی بۆ دانا، هاوبەشی ئەو فەرمانڕەوایەیانەکرد.
کەشتی دروستکرد لە تەک پەیکەری سلێمان، هەیکەلی مەزن، پەیمانی دۆستایەتی لەتەک شای سوور – حیرامدا بەست.. ئەسپی لە ولاتی میسرەوە هێنا و سوارەی، لە هێزی سوپادا دامەزراند، ناحەزانی سەرکوتکرد.
چەرخی سلێمان، چەرخی زێڕینی ئیسرائیل بوو.
بەریعامی سەرۆکی بەرەی ئەفرایمی لێیاخیبوو... شا سلێمان بە توندی سەرکوتیکردو پەنای بردە بەر فیرعەونی میسر.
شا سلێمان، 900 پ.ز. کۆچیدوایکرد.
مەملەکەتی داود و سلێمان دابەشبوو.
بەرەی باکوور بە سەرکردەیی بەریعام، مەملەکەتی ئسرائیلی باکوور..
مەملەکەتی یەهوداو بەرەی بنیامین کەوتە ژێر رکێفی رەحیعامی کوڕی سلێمان، لە باشووردا.
شکیم – نابلس، دوایی، سامرە، بوو بە پایتەختی ئیسرائیل.. ئورشەلیم، بوو بە پایتەختی مەملەکەتی یەهودا.

ئاشووری بە سەریاندا سەرکەوتن، لە پاشان کلدانی هێرشیان بردە سەریانو کۆتایی بە فەرمانڕەواییان هێنا.

مەملەکەتی ئیسرائیل لەلایەن شەلمانەسەری ئاشوورییەوە گەمارۆ درا، شا سەرجون، شاری سامرەی گرت، 27 هەزار لە نشینانی راگوێزکرد بۆ وڵاتی میدو ئاشوور.

ئەم مەملەکەتە 2 سەدە بەردەوام نەبوو، 930 – 722 پ.ز. مەملەکەتی یەهودا مایەوە، خۆیان قایمکرد لە پەناگەی هەیکەلدا، فیرعەونی میسر گەمارۆی قودسیدا لە چەرخی رەحبعامدا، هەروەها سەنحاریبیش.

گەمارۆکەیان هەڵنەگرت تاوەکو باجی زێڕو زیویان لە شا حەزقیا نەسەند، لە پەیکەرو کۆشکەکەیدا.

نبوخذراسەری کلدانی هێرشی هێنایە سەریان، گەمارۆی شاری قودسیاندا و کشانەوە و سەرنەکەوتن.

دووبارە هێرشیان بۆ بردەوە، 587 پ.ز.، داگیریانکرد، دوای گەمارۆی یەك ساڵی رەبەق.

نشینانیان بەدیل هێنا، ئەمەیە سەبی بابل و داستانی دیواری گریانو نوێژیان و داوای گەڕانەوەیان بۆ زەوی جیاژوان _ ارض الميعاد.

## شارستانێتی ئیسرائیل:

هزری یەکیەتی ئایینی، نووسراوەی چەرخی کۆن، 5 سفری یەکەم، بیری خوداوەندی تاکو تەنها، پێشەواو پەیامبەر، موسا، رابەری ئایینی گەلی جوو، یەکەم خاوەنی هزری تاکناسی.

## تەورات:

تیشکو رێنمایی ، نور و هدى، 5 سفری یەکەم، یەکەم نووسراوەی مێژوویی، دێروك، پاشەواری کۆن، تۆماری بنەمای ئایینی و کارەساتو رووداوی دێروکی پەسەند و بێوێنە و پڕهێز، لە بارەی پێکهاتەی جیهانو بوونەوەرو هۆکاری، بڕواو پەسڵان و رۆژی هەڵسانەوە و بنەمای سفرەکانی دەرچوونو لاوییەکانو دووانییەکانو یاسا و رێسا و سروتی کۆمەڵایەتیو رەوشی دەنامۆژگارییەکەی نێوانی

باوەڕو رەوش.. تاکناسی – خوداوەندی تاکو تەنها ناسینی – خوداناسی، سەرپێچی نەکردن، گوناهو سزای توند.

تۆمارکردنی کێشەی ماف و سەودلو مامەڵەو بۆماوەو ژنهێنانو دابڕانو خاوەندارێتی و کێشەی کۆمەڵگە.

یاسای موسا، بنەماو پایەگای نوێ، خاوەندارێتی بۆ هەمووان، گەڕانەوەی خاوەندارێتی دوای 49 ساڵ دەست بەسەراگرتن، بۆ خاوەنی پێشووی، ئازادکردنی کۆیلە دوای 6 ساڵ.. یاسی نەخۆشیو پەتا..

ئەمانە هەر هەمووی لە تەوراتدا، چەرخی کۆن، هەیە.

## پەیامبەرانی ئیسرائیل:

رۆڵیان لە چەسپاندنی هزری تاکناسیدا، ئەمانی بیرو هزری هاوبەشی، لە خوداناسیندا، لە نێوانی ئیسرائیلیدا، چەمکی باڵاو پیرۆزی ئایینی.

قوربانی پێشکەشکردن بۆ سڕینەوەی تاوان و پاکژبوونەوەی دڵو نیهاد و پابەندبوون بە فەرمانی خوداوەندەوە.

نوێژ و نزاو پەرستن، لەجیاتی قوربانیو پێشکەشکردنی سەربڕاو و وشەکۆیی، ورەی پتەو و وزەو راپەڕین و پەلاماردان.. یەکیەتی میللەت، یەك نەتەوەیو یەك میللەتی.. گەلی هەڵبژاردەی خوداوەند، هەربوونێتی گەڕانەوە determinism، بۆ خاکو زەوی و زێدو نیشتمانو وڵاتی خۆیان.. مانەوەی جاویدی هەتاهەتا تێدا.

هەوال تۆمارکراوی مێژوویی ئیسرائیلی و ئایینی جوو، دوای کۆچیدوایی پەیامبەر موسا د.خ. هەر هەمووی پەندو ئامۆژگاریو، ئاراستەییە لە ئاکاری گۆڕانکاری ئایینیدایە، لە لایەن رابەرو پێشەوا ئایینیەکانیانەوە.

## چاوگە:


- رۆژنامەی الشرق الأوسط، العدد 682، 1997/7/31.
- تاريخ بني اسرائيل من اسفارهم، محمد عزة دروزة، 1389 هـ – 1969 م. المكتبة العصرية، صيدا ، بيروت.

# زمانی بەراورد

## توێژینەوە - زمانناسی

زمان، ڕووداوێکی کۆمەڵایەتییە، لە درێژایی مێژوودا پەیدا بووە.

زمان، بۆشاییەکی فراوانی داگیرکردووە لە ژیانی گشتیدا..

زمان، دینەمۆیەکە، خاوەنی ڕووداوو سەلماندنە.. واتاکانی سەرکەوتووە، شێوەی پەیوەندە بە ڕاڤەی وشەکانەوە، وەکو ریشەی وەستاوی، قەوارەو بوونی میللەتە، دەگۆڕێت بەپێی نموونەی کەڵچەر و ڕۆشنبیریو بڵاوی هاتووچۆی نێوانی مرۆڤ گرنگیو بایەخی خۆی هەیە، دەرکەوتووە، بە پێو رادەی گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی، نەك لەلای میللەتە مەزنە سەربەخۆکان، بەڵکو لە نیشتمانە گچکەکانیشدا، ئەمە بەپێی پەسەندی ریچارد وڵف.

زمان، کۆگاو گەنجینەو دەفری بیروهزرو هۆشە، ڕووداوی ڕاستەوخۆی بیرۆکەیە، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بەکارهێنراوە... ناوەندو ئامێری هۆی پەیوەندی کەسانە، لە نێوانی خۆیاندا، لە گۆڕینەوەی بیروڕادا، لە سەوداو مامەڵەدا، لە دێرەوە، لە مێژەوە تاکو هەنوکە، یەك زمانە بۆ کۆمەڵگەیەکی بەشداریو هاوبەشی نێوانی ئەندامانی، یاسای زانستی رێزمان و لکەکانی، لە بنەڕەتدا بۆ وشەکان زەمینەو کرۆکو پایەگاو بنەمای پەسەندی چەشنەکانیەتی..

هیچ زمانێ لەسەر لەناوچوونی زمانێکیتر، پێشڕەوتی وەرناگرێت و زمانێکینوێ پەیدا ببێت.

بەڵکو لە رێگەی تەواوکردنی توخمە بنەڕەتیەکانی زمانە وەستاوەکەو بەربڵاوی گۆڕانکاری لە زمانە کۆنەکەدا بۆ زمانە نوێیەکە، لە بارودۆخی چۆنیەتی

هەردووکیانــدا، نــەك لــە ڕێــی لــەناوبردنی زمانــە کۆنەکــەوە.. بــەڵکو لــە پەسەندەکردنی توخمە چۆنیەتیەکان کە دێتە کایەوەو کەڵەکە دەبن لەسەریەك، بە شێنەییو لە دواییدا بەکاری کورتەو پەختەبوونی توخمە چۆنیەتیە کۆنەکان، جۆش دەخوات.

زمـان، پەســەندییەکی هاوبەشــی هــەموو رووالەتــە کۆمەلایەتییەکانــە، بــە ژێرخانو سەرخانەوە، لە ڕاژەکردنی تەواوی کۆمەڵگەدا.

بیرو هزرو هۆش، هەرگیز، لە زمـان جودا ناکرێتــەوە.. بوونیشـی نییـە بـەبێ ماتەری زمانو دوور لە ماتەری سروشتی زمان.

ئالوودەییو خولیا بە زمانێکەوە، لە بوونو بوومەوەیە.. وەکو توانـای بـەدەنیو جەستەیی وەکو ڕۆیشتن و جیاوازی لە زیندەوەریتر.

**وتـــە**، لە بەراییـدا، لـە پـەرەوەردگارەوە، بریتـی بـووە لـە ژیـانو زینـدەگیو زیندوویەتی.

ژیانیش تیشکی مرۆڤ بووە، جیهانی ڕۆشنکردۆتەوە، مـرۆڤیش ئـەو تیشکو ڕووناکییەی دیتەوو باوەڕی پێهێناوە و ئاگاهی بۆ داوە.

**وتــە**، بەرجەســتەبووە، بــە کـارو فاکتـەری تێگەیشـتن لەیـەك، لـە نێـوانی مرۆڤدا.

بەلام، لێکۆڵینەوە، ساوابووە تاکو چەرخی 19، سەردەمی گریك، بۆ یەکەم جار، سەرنجیانداوەتە بێخیو پاسای بنەڕەتو ڕژێمی بوومی، بـە زانیـاری نـوێ، ئـەم کەڵچـەرە گریکییـە، ڕەچاوکراوە، تەنانـەت هیرۆتـس، دەریخسـتووە کـە یـەکێ لـە شاهەکانی میسـر، بسامیتخۆس، ویسـتوویەتی بزانـێ، یەکـەم گـەلی ڕووی زەمـین، کامەیە؟

لەبــەر ئــەوە، 2 کۆرپــەی ســاوای نــوێزای، هێنــاوەو خســتویەتیە ژێــر چاودێرییەوە، تاکو گوێیان لە یەکەم وتەو دەربڕینیان بێت.. هـەردوکیان بـە یـەك وشـە زمانیـان پـژاوە، وتوویانـە بیکـۆس Becos ، بـە زاری فریجی، واتـە، هەبـەز

ئیفلاتۆن، لە 427 – 447 پ.ز. لە نامەی Dialogue، لە باسی بنەڕەتی وشەو تێڕوانینی ناو، بە ناونراوەکەوە، ئایە ئەمە بە پەیوەندی سروشتی رووداوەکەیە، کە ناتوانیێ ئەو لێکتراوەیە لە سروشتی رازەکە جودا بکاتەوە، یاخود پەیوەندییەکە کە کۆمەڵگە چەسپاندوویەتی.

ئەم نامەیەی ئیفلاتۆن پوختەی کێشەی چەرخێکی تەواو لە نێوانی باوەڕی Analogist، کە سوورن لەسەر ئەوەی زمان، بوونێکی سروشتییە، پێوەرو کێشە لە بێخو بنجی پەیدابوونیدا بڕوای Anomalist، ئەوانەی لاریان لەمە هەیە، وێنەیان هێناوەتەوە بۆ دارشتنو لادانو وەرگێڕان.

خاوەنی باوەڕی یەکەم، باسەکەیان بردۆتەوە بۆ هەڵگێڕانەوەو وەرگرتن بە وردکردنەوە کە رۆژگار گۆڕانی رێزمانی بەسەردا تێپەڕکردبێت، کە لێکۆڵینەوەی نوێ چاری ئەم وردەکارییەی لە گۆڕاندا کردووە، تاکو هەنوکە، کلیلە زۆر گرفتی پێشینیانی پێکراوەتەوە.

گریک، تەنها بایەخیان بە زمانی خۆیانداوە، بە ناوێنەی رژێمو یاسای جیهانی لە رازاوەترین شێوەدا، داناوە، لەم تێڕوانینەوە، رێزمانی فەلسەفەی گشتی پەیدا بوو، نەك لەسەر بنچینەی زمانێکی دیاردە کە گریکییە.

بەمجۆرە، پەیبراوە بە بەشەکانی وشەو دارشتنی پێوەری و گێڕانەوە بۆ نیهادو گوزارە، مسند و مسند الیه.. شیکردنەوە وکاریگەری لە تاکو رستەدا و جیاوازی لە نێوانی نێر مێ، تاکو کۆ، دووپات، فەرمانو خوازو لاری، ئەرێو نەرێ.

ئەمانەی لە فەلسەفەی دایۆنسیۆس تراکسدا Dionysusthrax، لە باسەکانی ئەپۆلۆنیس دایسکۆلسدا Apllonious Dayscolas، لە چیرۆکی ئەلیادەو ئۆدیسەدا، ناوبانگی سەند، بە جێژی زمانی کۆن، بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی دەقەکانی.. ئەمەش بە لێکۆڵینەوەی رەخنەیی ئەسترخس 216 – 144 پ.ز. خستییە روو، Aristrchus، بەراوردیو هاوتەرییو بەرانبەری لەسەر زاراوەکانیتری گریکیدا کراوە.

لە زماننا‌سانیان، هیرۆدیەن، ئەپۆلۆنیۆس، دیسکۆلس.. لە ئاکاری شیکردنەوەو ئەکسێنت Accent، لە زمانی گریکیدا، لە کۆندا، باسکراوە.

دوای گریك، خۆراوایییەکان، هیچیان نەخستەسەر شێوازو رێزمانی گریك، تاکو چەرخی 18 .. ئەوسا زانایان، کەوتنە گومانەوە، کە چۆن زمان پەیدا بووە؟

لە بووندا، بەخششێکی یەزدانیو خەڵاتی پەروەردگارە؟ لەمەوە بیرکرایەوە، تیۆری هەمەجۆرە پەیدا بووە..

رۆمان، شوێنی گریك کەوتن لە دانانی زمانی لاتینیدا، 2 نووسراویان دانا:

یەکەمیان: دۆناتس Donatus ، لە چەرخی 4 ز،

دووەمیان: بریسکیان Briscian لە چەرخی 6ز.

ئەم 2 نووسراوە، پایەگابوون تاکو چەرخەکانی ناوەند.. لاتینی، گۆڕانی بەسەرداهات.

زمانی فەرەنسیو ئیتالیو ئیسپانی، کەوتنە برەو.. پێیان دەوترا، زمانی رۆمانیان.

لاتینی کلاسیك Romace Languages ، سەردەمێك مایەوە، رێزمانی جیهانی گشتی برەوی سەند، لاتینیش، بە هەموو زمانەکانیەوە، دارێژرا، بە رێبازگەیەکی دیالیکتیکی سەردەم، لە نێوانی چەرخی 17 زانایان پەیرەوییانکردو لاتینی بوو بە زمانی پەتیو پاراو، زمانی سەردەمو هاوچەرخ، ستاندەرد Standerd، لە ئەوروپادا.

دوای ئەوە، عەرەبیو عیبری، پەیدابوو..

گەڕێدەکان، توخمو رەگەزەکانی زمانیان بەهۆی گەشتوگوزارەکانیانەوە، دەبرد بۆ هەموو لایەك.. مزگێنیدەران، نووسراوی ئاینییان وەردەگێڕا بۆ وڵاتە دۆزراوەکان.

مزدەدەرە ئیسپانییەکان، دەست پێشکەرییانکرد.. بەڵام کەم تێبینی و ئەشارەزایی لە زماندا، خامە لە نەنگیو کەموکووڕی لە وەرگێڕانەکانیاندا دەردەکەوت..

بازرگانیو هاتووچۆ، فراوانبوو، گواستنەوە ئاسانبوو.. پێداویستی بە نووسینو ڕێزمانو فەرهەنگ بایەخی سەند.. بە فەرمانی کاترینی 2، شاژنی ڕوسیای قەیسەری 1786، کۆمەڵە واژەیە دانرا، 285 وشەبوو، بۆ 200 زمانی ئەورووپاو ئاسیا، 80 زمانیتری خرایە سەر لە زمانانی ئەفریکاو ئەمریکا.

لە 1806 – 1817، نووسراوێك دەرچوو لە 4 بەرگدا بە 500 وەرگێڕان، دەربارەی نوێژانی مەسیح Lord pray .. ت.س. ئیدلۆنگ T.C. Adelong.

لە سەردەمی ڕاپەڕیندا لێکۆڵەرەوەکان، لە زمانەکەی خۆیان ورددەبوونەوە وەکو فرانسیسکۆس جنیۆس 1589 – 1677، تەلاشیکرد، لە دەقەکانی ئینگلیزی کۆندا.. Franciscus guneus ، هەندێك دەقی خێزانی زمانەکەی کە هۆڵەندیو جرمانیو کۆتکی Cothic، ئەسکەندیناڤی.

زمانی کۆتیکی مردوو، کە ئیمڕۆ نازانرێت، لە بەشەکانی ئینجیلدا لە چەرخی6، دەرکەوتووە کە بە ڕوونووسی سلڤرکۆداکس ناسراوە Silver Codax جۆنیۆس لەتەك دەقی ئەنگلۆسەکسۆنیدا، بڵاویکردەوە.. جۆرج هیکس لە 1842 – 1715، ئەم کۆششەی پەسەندکرد.

لەسەر ئەمە ڕێزمانی بۆ کۆتکیو ئەنلگۆسەکسۆنی دانا.

زانایانی ئارەب، وەك حافز جەلالەدین، ئەبدوڕەحمان سیوتی شافیعی، نووسراوی **بقية الوعاة في طبقات اللغويين و النحاة**، لە 1326 ك، لە چاپخانەی سەعادە لە میسر چاپکرا، هەروەها **معجم الأدباء و وفيات الأعيان و أبناه الرواة على أبناء النحلة** و هیتر... هەتەری لەسەر پوختی و پاراوی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، دوای ئیسلام.

ئەبو ئەسوەدی دوەلی، ڕێزمانی ئارەبی دانا، لە پەیکەری کرداروو ئیهادو گوزارە، دواوە.

زانایانی دوای ئەم، لەسەری ڕۆیشتن وەکو ئەنبەسە کوڕی میعدان ئەلمەهدی.. بەڵام کۆمەڵگە دژی عەنبەسە وەستان، وەکو میمونی ئەقرەت، لە

سالانی سەدەی کۆچیدا، دوای ئەم یەحیا کوڕی یەعموری بەسری و شاگردەکەی، ئەبدوللا کوڕی ئیسحاق حەزرەمی بەسری.

دەستەی 2 هاتنە گۆڕێ لە 117 ک، ئەبو ئومەر کوڕی ئەلای مازینی تەمیمی، سەرکردەیانبوو، کە لەسەر دەستی یەحیای کوڕی یەعمور و نەسری کوڕی عاسم، زانیارییان وەرگرت.

خەلیل ئەحمەد فەراهیدی و یونس کوڕی حەبیب بەسری، ئەمانە، لە ئەبی ئومەرەوە، بەهرەیان وەرگرت.

ئەبو محەمەد زیدی و مەعاز کوڕی موسلم هەراء و عیسا کوڕی ئومە سەقەفی... ئەمەی دواییان هاتە بەسرە، ڕێزمانی لە ئەبدوللا ئیسحاق وەرگرت، لەمەوە دەستەی 2 پەیدا بوو بە سەرۆکایەتی یونس حەبیبی بەسری و خەلیل ئەحمەد فەراهیدی کە دائیرەی – بازنەی، عەروزی داناوە.. لەوانیشەوە ئەحمەس و عەلی هەمزە کەسائی و ئەبی زەکریا فەراء، هەڵکەوتن.

یونس لە چەرخی هارونە ڕەشیدا کۆچیکردووە، 799 ز.. سیبەوەی، شاگردی خەلیلە، سەرکردەی دەستەی 4 نووسراوی لە ڕێزماندا هەیە.

بە ڕای نووسەری ئەمدێڕانە، سیبەوەی یەکەم کەسە ڕێزمانی عارەبی داناوە کە خۆشی عارەب نییە.

سەردەمی خەلیل، لە کوفە دەستەیەکیتر، پەیدابوون، وەکو، رواسی، لەمەوە کەسائی و شاگردەکانی، فەراء پەیدابوون.

کەسائی لە نوسراوەکانی سیبەوەی کۆڵیوەتەوەو بەرپێچی داوەتەوە.. ئەمە بوو بەهۆی جیاوازی نێوانی کوفیو بەسری.

ئەم 2 فێرگەیە، خوێندنگەیە، لە ڕێزماندا واتە، ئەم 2 خوێندنگەیە، هەندێ دەستیاوی لێکۆڵینەوەی کەڵچەری ئەوروپایی، بە سەرەوەیە، چونکە ئایینی برەهمی، کۆمەڵە سرووده ئایینیە کۆنە پیرۆزەکانی، ڕەچاوگرتووە.. کۆنەکەیان ریگڤیدایە Rig-vida... دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی 18 پ.ز.

زانا لایەنگرەکانی پتر بایەخیان بە هەرە کۆنەکانداوە، لە رووی راڤەی واژەو بێژەو تێگەیشتنو لێکدانەوە بە دروستترین شێوە.

زمانناسان، لە سنووری باسەکانەوە، چوونەتە ناو زمانی وتووێژو گفتوگۆی زیندووەوە، لە چینە باڵاکان کە زمانی سانسکریتییە، بەر لە دەرکەوتنی نامیلکەی بانینی، لە رێزمانی سانسکریتیدا 350 – 250 پ.ز... ئەمە شوێنەواری ئەمری چالاکی بیرو هزری مرۆڤە، لە سەرنجو شیکردنەوەو پەیداکردنی وشەو وردکردنەوەی وێرای تێبینی و شارەزایی نووسەر.

تەنانەت، هیچ زمانێکی مرۆڤیتر ئەو سامانەی نەبووە، لە باسی قووڵو وردیو وێنەگرتنیو رووداویدا.

لەمەوە سانسکریتی، بە درێژایی چەرخ، پیرۆزییەکی وەرگرت، بوو بە زمانی وێژەییو میری.

براهمای هیندییەکان وەکو لاتینی لە سەدەکانی ناوەندا، زمانی ئاینیو زانیارییوو.

ئەوروپا لە سەدەی 17- 18، زانیارییان لە سانسکریتیو هیندییەوە وەرگرتووە، بەهۆی مژدەدەرانەوە.. بە تایبەتی ئەو ئینگلیزانەی کە لە خاکی هیندا زۆرتر ئاگاهییانداوە، لەم رووەوە، تاکو سانسکریتی بوو بە بەشێك لە زانیاری زاناکانی سەدەی 19..

زانایانی ئەوروپا، سەرسامبوون، لە وردەکاری لێکۆڵینەوەی هیندییەکان، لە زمانەکەیاندا، لە رەچاوگیریو سەرنجدا، نەك لایەنی گشتیو دیدی – تیۆری.. وێرای ئەوەی سانسکریتی، رێژەی نێوانی زمانە دوورەکانو بەراوردکردنی گرووپی زمانەکانیتریشی دەرخست.

بێگومان، هیند، لە رووی دوورییەوە لە ئەوروپا، کەڵچەری کۆنی زمانی خۆی پاراستووە، هەرچەندە کە هیندی لە خێزانی زمانە ئەوروپاییەکانە، هیندۆئەوروپی، بۆ ئەم لەیەکچوونە، چەند وێنەیەك دەهێنینەوە..

لە ئینگلیزیدا: مادەر mother ، برادەر Brather ..

جەرمانی: مادەر mother ..

لاتینیو رومانی: ماتەر matar..

گریك : ماتەرام mataram ..

روسیو سلاڤی: ماتە mata - لە راکێشدا matari ..

لە ئینگلیزیدا: دوو – tow

لاتینی : دوو – duo ..

فەرەنسی: دوو – duo..

گریکی: دوو – duo ..

سانسکریتی: دوو – douu ..

روسیو خێزانی: دوو – dua ..

کوردی : دوو – dü ..

لە ئینگلیزیدا: سێ – three ، بە لاتینی: tris ، گریکی: tries ، سانسکریتی: traya ، رووسی: tri ، فەرەنسی: تروا.

لە ئینگلیزیدا، کرداری یارمەتدەر is ، لە جەرمانی: ist ، لە لاتینی est، لە گریکی esti ، لە سانسکریتی asti ، لە رووسی yest.

لە پێشدا وا دەزانرا، کە زمانە ئەوروپاییەکان، لە سانسکریتییەوە، وەرگیراوە، وەکو دەرکەوتووە، سانسکریتیو لاتینیو، ئەوروپایی، وێنەی هەمە چەشنەن لە زمانێکی تری پێش مێژوو.

یەکەم کەس ئەم راستییەی زانییوە، ولیم جۆنسە 1746 – 1794 ز. یەکەم زانای ئەوروپاییە، گەیشتۆتە ئەو ئەنجامو ئاکامە فراوانەی سانسکریتی لە وتارەکەیدا لە 1786 ز، پێشکەشکرد.. دەریبڕی کە سانسکریتیو لاتینیو گریکی، تەبایی توندو نزیکیان هەیە، لەتەك چاوگی کۆنی زمانە نەماوەکان کە کوتکی و کلیتییە Cothic – Celtic..

لێکۆڵینـەوەی مێـژوویی بـەراوردی زمانـە ئەوروپییـەکان، باسـێکی گرینگـو بایەخداری زانیارییە لە سەدەی 19 دەرکەوتووە، کە زمانـە ئارییـەکانو زاراوەکانی پەیوەستەگیو پابەندی توندوتۆڵی هەیە بە سانسکریتیەوە هەروەها زمانی باڵتیکی و سلاڤی لە لایەکەوە و زمانی سانسکریتی لە لایەکی ترەوە.

بـــە راســـتی، جـــۆنس، دەریخســـتووە کـــە زمـــانی جەرمـــانی – گرمـــانی پەیوەندییەکی تەواوی هەیە بە لاتینیو گریکیـو سانسکریتییەوە، هـەروەکو زمـانی ئەرمەنی و ئەلبانی 2 دوو لکن لە درەختی ئەورووپی، هەروەها زمانی کوردی ئـاری نەژاد.

**پوختە:**

زمان، بە بیروڕای هەموو هزرڤانان، یەکێکە لـە دەرکـەوتووترین و زەقتریـن رەگەزێ، کە نەتەوایەتی و میللەتی جیاوازی لێهەیدا دەبێت.

هەندێکیان دەڵێن:

ئەگەر یەکەم هۆکارو رەگەزی یەکـەم نـەبێت، رەگـەزی بنـەڕەتیو بناخـەییو بنچینەییە.

باوەر دەپرسێو دەڵێ، میللەت چییە؟

لە وەڵامدا، دەڵێ: هیچ میللەتێ بوونو بوومی نییە بەبێ زمانی هاوبەش.

شبرنچەر دەڵێ: میللەت، کۆمەڵە کەسانێکە، بیر دەکەنەوە هزرو گفتوگۆیـان، جۆرێکە.

ستالین، سوورە لەسەر ئەوە، کە کۆمـەڵێکی نەتـەوەیی بـە هـیچ رەنگـێ ئـەو بۆچوونەی نابێت، کە پێی بێتە ئاراوە، واتە مەیدانەوەو پێی بوترێ میللەتە، بەبێ زمانی هاوبەش.

بەم پێیـە کـە بەرهـەمی رێزگەیـەکی گشتی مێژوویی کۆمەڵگەیـەو بنیـادی ژێرخانی چەندەها سەدەیە، کۆششی سەدان نـەوەو نیژەیـە، بەرهـەمی زنجیرەیەکـە لـە چەرخو چاخو سـەردەم، لـەو ماوەیـەدا شـێوەو کـەسمی وەرگرتـووەو گـۆڕاوە و سواوە.

هەروەکو ستالین دەڵێ: نە بە بنیادی ژێرخانو سەرخانە هاوسەنگ دەکرێ و لە وانیش، زۆرتر دەژی.

زمانی کوردی، بەر لە ئیسلام، سوورێکی تایبەتی هەبووە لە پێکهاتەی شێوەو کەسمی نەتەوەیی، رەگەز و هۆکاری پاراستنی بووە.

جۆرو گروپەکانی مەردووم، ئادەمیزاد، لە سەدە دێرینەکاندا بە دابەشکردنی کۆمەڵگەی خەڵکەوە بۆ یۆنانیو رۆمانیو فارسیو هیندیو چینی و ئارەبو کوردو تورك .. هتد.. ئەم بەشکردنە بەپێی جیاوازی زمانی نێو ئەم کۆمەڵگایانە بووە، لە سنووری جوگرافیایی دیاردەکراودا.

کەواتە، پێیان دەگوترێ هەرێمو دەڤەری زمانی لە گشتییەوە بۆ تایبەتی.

سنووری زمانە سامییەکان، هیندۆ ئەوروپی، زمانی توورکی، مەنگۆلی، ئەفریکای رەش، دەڤەری زمانی ڤیبتی، هەرێمی زمانی بەربەر، ئامازیغی، هەرێمی زمانی کوردی.

**زمان**، رووالەتێکی کۆمەڵایەتییە، گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، بەپێی بارو دۆخو ئاوو باو کەشو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و داگیرکردنو جەنگو سەرکەوتنو ژێرکەوتن و کاری خێلایەتیو تیکەلاویو بازرگانیو گەلێکیتر..

زمانی وێژەیی و کەنیسەیی، ئایینی و پەیوەندی نێوانیان رەگەزو هۆکاریو کاریگەریو، ئەمانە هەرهەموو لێکۆڵینەوەی تایبەتی گەرەکە، بە تایبەتی نووسراوی ئاینی پیرۆز و وتەی پێشینیان و وێژەی نەنووسراو و فۆلکلۆر و کەلچەر و ژیانی خێڵەکیو شارە پیرۆزەکان، وەکو شاری مەککەی پیرۆز و کاریگەری لە یەکگرتنی زمانی ئارەبیدا، بازرگانیش، پایتەختەکان کە وەکو پاڵێوگەیەکی مەزن بۆ زاراوی هاتوو، زمانی لەیەك گەیشتن و سەوداو مامەڵەو تێکەلاوی.

چونکە زمان، کەنارەگیر نییە، بەڵکو دابەشکەری هاوبەشە لەسەر زەمینەیەك، ئەو پرۆسە تێکەڵە مەزنە، بە پوختی تەواو دەبێت، لە ئەنجامی کرداری ئاڤیگەکەدا.

## چاوگو پەراوێز:

1- گۆڤاری المعلم الجدید ، مجلد 39 ، بەرگی 2 – 1978 – وائل بهجت سلیمان ل: 68، 69، 70، 71، 72، 73 – سوودم لێوەرگرتووە.

2- زمانو هونەری وەرگێڕان، کەریم زەند.

3- زمانو هونەری وەرگێران، کەریم زەند.

4- تۆفیق وەهبی، زمانناسی و نووسینەکانی.

5- وێژەی بەراورد، 1832، لە فەرەنسە، سەریهەڵداو گەشەیکرد.

بەراورد، رووکردنە ئەدەبو وێژەی نەتەوەیەکیتر، بە مەرجێ:

- میراتی خۆی بپارێزێت.
- یاساو رێزمانی، نەتەوەکە بپارێزێت.
- سوود لە چاوگە بیانیەکان وەربگرێت.

لە فەرەنسە، بەراوردی مێژوویە، دوورە لە جیهانی ئابووری، بەرەو وێژەی ئەورووپییە، رووی نەکردۆتە نەتەوەکانی خاوەر.

رێبازەکانی:

- ئەمریکیو ئەورووپی.
- سۆڤیەتی، رووسی، زانستیو پەیوەندی دەکۆڵێتەوە.

بۆ ئەمە پێویستە، شارەزایی مێژوویی لە هەردوو نەتەوەکە و زانینی زمانی هەر دوولا، سوود لە چاوگی بیانی.

6- گۆڤاری لێکۆڵینەوەی ئارەبی، ژمارە 12، سالی 15، ت1، ئۆکتۆبەر 1979، بێروت.

7- وتاری ستالین لە کۆنگرەی 14، پارتی کۆمۆنستی سۆڤیەتی، کە وتی: گەرەکە، دەرفەتی لەبار برەخسێنرێت بۆ پەرەسەندنی کەلچەری نەتەوەییو گەشەکردنی، بە مەبەستی دەرکەوتنی تواناو ناوەکییەکانی.

ئەمە وەکو سەرەتا زۆر پەسەندبوو، بەڵام بەشی دووەمی ئاخافتنەکەی وتی:

دەبێت، هەموو هەلومەرجێك بێتە ئاراوە بۆ هەموو یەکبوونو یەکیەتی کەلتچەری نەتەوەیی لەیەك کەلتچەری ئاوکۆ و هاوبەشدا، بە تاکە زمانێکی هاوبەش.

بەشی دووەمی وتەکەیبوو، بەلگەو پەلپو بەهانەو بیانوو بەدەست دەزگا رامیارییەکانەوە، بۆ ئەوەی کە هەموو بنکە کەلتچەرییەکانی کوردی، بتوێنتەوە و بسرێتەوە، فێرگە کوردییەکان دابخرێن و راپێچو راگوێزانو چەوساندنەوە و سڕینەوەی ژیاریو کەلتچەری کوردی، دەستپێکرد، کۆمارە ساواکەی کوردستانی باکوری خاوەر، کراسنی کوردستان – کوردستانی سوور، کە پایتەختەکەی لاچین – لاتشنسکی بوو، 1923، دامەزرابوو، لە بێشکەو لانکەدا، زۆر بە زوویی خنکاو گۆڕکرا وەکو هەڵم با بردی.

# بارزانی
## عەبدوسەلامی دووەم
## کوڕی، شێخ محەمەدی بارزانی
## 1914 - 1864

بارزانییان، لە بەشی خوارووی دەڤەری زێبار، نیشتەجێن، زەوی شاخاوی سەخت، لە باکوری کوردستانی باشوورەوە.

**زێبار**، واتە، ڕۆباری زێی گەورە – مەزن – سەروو – باکور، خێڵی زێبار، هەر لەم دەڤەرەدان.

**بارزان**، ناوی باپیریانە، واتە هەڵگری مافو ڕاستی، لە پارسان – دەروێشان، برازان – برای زانا، لەمانەوە هاتووە.

بارزانی، تیرەیەکی مەزنن، لە بنەڕەتو بنچینەوە دەچنەوە سەر تیرەو هۆزانی هەکاری، گەلێ بەشن:

شێروانی، مزوری، دۆڵەمەڕی، بەرۆژی، هەرکی، بەرۆژی، بەرۆژوان، شێخەکان – شێخان لە نەوەی شێخ تاجەدین نەخشبەندی خالیدی – مەولانا خالید..

لە نەوەکانی: شێخ ئەبدوسەلام و براکانی شێخ ئەبدوڕەحمان شێخ ئەبدوڕەحیم.

شێخ ئەبدوسەلامی کوڕەزای، ڕێبازی نەخشبەندی لە شێخ خالید نەخشبەندی، وەرگرتووە، لە ڕێی شێخانی شەمزینانەوە.

شێخ خالید زیائەدین، بەرزترین زاناو رێپیشاندەریانبووە، لە خێڵی میکایەڵی، کە تیرەیەکی خێڵی گەورەی جافە.

چۆتە هیندستان، رێبازی نەخشی لە شێخ ئەبدوڵای دەهلەوی نەخشبەندی وەرگرتووە، گەڕاوتەوە بۆ کوردستان، لە ئوستانی سلێمانی، بڵاوی کردۆتەوە.

لە بەغداد، چەرخی داودپاشا ئوستاندار – والی، خانەقاو تەکیەی بۆ دروستکردووە، لەسەر کەناری رۆباری دەجلە، هەموو کوردستان گەڕاوە، چۆتە قودس، شام، لەوێ گیانی پیرۆزی بەخاك سپاردووە، ئارامگەو خەوابگەکەی لە گەڕەکی سالحییەی شامە.

کاتی تێپەڕبوونی مەولانا شێخ خالید، بە بارزاندا، شێخ ئەبدوسەلام، رێبازی نەخشبەندی لێوەرگرتووە.

دوای شێخ ئەبدوسەلام، شێخ محەممەدی کوڕی، لەسەر رێوشوێنو رێبازی ئەو دەڕوات، دوای کۆچکردنی شێخ محەممەدی کوڕی جێگریبووە.

شێخ ئەبدوسەلامی 2، شێخ ئەحمەد، خودانی بارزان، شێخ محەممەد سدیق، بارزانی ئەمر، مستەفا ژەنراڵ، شێخ محەممەد شێخ بابو.

لە کوڕانی شێخ ئەبدوسەلام، شێخ سلێمان، شێخ ئیبراهیم، شێخ ئیسماعیل.

لە کوڕانی شێخ محەممەد سدیق، شێخ ئەبدوڵا، شێخ ئەلی، شێخ نوری.

لە کوڕانی سەرۆك بارزانی ئەمر، مستەفا: شێخ ئوبەیدیلا، شێخ لوقمان، شێخ ئیدریس، شێخ سابیر، کاکە مەسعود بارزانی.

لە کوڕانی شێخ محەممەد – بابۆ، شێخ سادق، شەفیع، ئەیوب.

لە کوڕانی برای ئەبدوسەلامی یەکەم، شێخ ئەبدوڕەحمان، شێخ ئەبدوڕەحیم، کوڕو نەوەی ماوە.

یوسف کوڕی سەعید کوڕی ئەبدوڕەحیمە.

ئاغایانی زێبار، نەیاندەویست کە دەستەڵاتی شێخانی بارزان لە دەڤەرەکەیاندا بڵاوببێتەوە، بەرگرییان لێکراوە.. جەنگو کوشتار، پەیدابووە، لە نێوانیاندا، لە ئاکامدا، بارزانییەکان سەرکەوتوو بوون.

بەڵام ئاغاکانی زێباری، کۆڵیان نەداوە، بە پشتگیری دەستەڵاتی نوسمانیو پروپاگندە، توانیویانە، ناوی یاخیگەرێتی بدەنە پاڵ بارزانییان، بە بیانووی ئەوە، کە شێخ ئەبدوسەلام، دەیەوێ لەتەك رووسیا هاوکاری بکاتو پەنای بۆ بەرێت.

ئەمە بوو بەهۆی نیگەرانیو راگرتنی سەفوەت بەگی قایمقامی سەربازی کە ناوانی مەحمود شەوکەت پاشای سەرەك وەزیرانی درابووە پاڵ.. پەنای بردبووە بەر شێخ ئەبدولسەلام ئەیدا بە دەستەوە.. چونکە، خاوەن بەختن و پەناگەن، خاوەنی ئاگردانن، چاوگی ناوی شیرین بوون، مەردومو مەلوومورر لێیان گرد دەبنەوە، وەکو شێخی ئەمر، شامەحمودی کورد.

نوسمانییەکان، داوای سەفوەت بەگیان دەکرد، لەو کاتەدا، کۆمەڵی یەکێتیو بەرزی – الاتحاد و الترقی، لە ئەستانە، توانییان سوڵتان ئەبدولحەمید، لابەرن و دەستوور بڵاو بکەنەوە، 1908، براکەی سوڵتان رەشادی 5، خرایە شوێنی.. دەستەڵاتی نوێ، دەستیانگرت بەسەر کاروباردا، دەستیانکرد بە کوشتنو برینو تۆڵەسەندن.

یەکێ لەوانە، شێخ ئەبدوسەلامی بارزانی بوو، کە بە یاخیبوو دادەنرا.

محەمەد پاشا داغستانی، نوستانداری مووسڵ، هێرشی هێنایە سەر بارزان، شێخ ئەبدوسەلام، ناچاری هەڵاتن بوو.

کاتی کەوتنی کابینەی یەکیەتییەکان، پارتو کۆمەڵەی سەربەستی هاتنە کایەوە، نازم پاشا کرا بە نوستانداری بەغداد، فەرمانی بەخشینی گشتی دەرکرد بۆ هەموو بارزانییەکان.. داوای لە دەرگای باڵا ، ئەستانە کرد، کە شێخ ئەبدوسەلام خەڵاتبکرێت.

سەفوەت بەگیش زۆر کۆششی لەمەداکرد، بەڵام کار وەرگەڕا، نازم پاشا کوژراو پیاوانی یەکیەتی گەڕانەوە سەر کار، نەزیف پاشا کرا بە نوستانداری مووسڵ، کە لایەنگری خۆیانبوو، هەرچەندە کوردیش بوو، بەڵام راکردنو هەڵاتنی سەفوەت بەگی قایمقامی کرد بە بیانو بۆ هێرش بردنە سەر بارزان، داوای سەفوەت بەگیان دەکرد، لە شێخ ئەبدوسەلام، یاخود هاتنی خۆی بۆ مووسڵ.

پیشەو نەریتی کوردایەتی، کاری ناڕەوا ناکا.. پەنابەر و هەڵاتو نادەت بەدەستەوە... شێخ ئەبدوسەلام، ئەم کارە ناڕەوایە ناکات.

بە ناچاری بارزانییەکان چوون بۆ کوردستانی خاوەر، دەڤەری ئورومیە، کات بەهاربوو، شێخ ئەبدوسەلام بوو بە میوانی سەید تاها شێخ سدیق شەمزینانی لە گوندی نەهری، 5 مانگ مانەوە، دوایی چوونە گوندی چار بۆ لای سمکۆی قارەمان، زۆر ڕێزیان لێگیراوە، لە پاشا گەڕاونەتەوە بۆ گوندی نەهری، لە ڕێگە بە فێڵ پیاوانی دەروێش ئەبدوڵا، زۆر لێی دەپاڕێنەوە کە لابداتو میوانداری بکەن، دەڵێن کە دەروێش ئەبدوڵا سوێندی خواردووە کە خانووەکەی بسوتێنی ئەگەر شێخ ئەبدوسەلام لانەداتە لایان و نەبێتە میوانیان.

ئەویش بە دڵپاکی شوێنیانکەوت بۆ گوندی دەروێش ئەبدوڵا.. لەبەر گەمارۆو ناپاکیانداو پەلاماری شێخ ئەبدوسەلامو مرۆڤەکانی دەدەنو یەکوویەکیان لێدەگوژنو دەیانگرنو دەیاندەنە دەست نزیکترین هێزی ئوسمانی، هەرچەندە شێخ ئەبدوسەلام بەخۆشی داوایان لێدەکات، کە ئەم کارە ناڕەواو ناپەسەندە، بەڵام هیچ سوودی نەبەخشی.

کاتێ سلێمان نەزیف زانی، چوو بە پیریەوە، لە ڕێگە پێی وت، بۆچی نەهاتی؟. بەمجۆرە ناچاربویت کەبێیت؟

شێخ ئەبدوسەلامیان هێناو خرایە سەربازخانەی سپاوە.. درا بە دادگەیەکی رووکەش، فەرمانی خنکاندنی خۆیو 3 کەسی تر لە تەکیدا، لەسێدارەدران، 1 کانون 1914، ئەو 3 کەسە ئەمانەبوون:

محەمەدئاغا هیشتی، ئەبدائاغا مزوری، عەلی محەمەد ئەمیناغا.

مزوری، کە لە هەرەتی هەرزەکاریو جەوانیدابوو، لە کاتی سەرکەوتنی بۆ سەر سێدارە، وتوویەتی: بارزانی، نامرن..

هەموویان لە گۆڕستانی ئەلبوبەدران، بەرانبەر مزگەوتی عومەر مەولا، 1 کانون 1914، نێژران.

شێخ ئەبدوسەلام، بالآبەرز، باریك، گەنم رەنگ، سەروسیما جوان، مێزەری سپی، جبەی رەش، بەپێی گەرماو سەرما رەنگی جبەکەی گۆڕیوە.. ئازا، دلێر، پارسا، لە خودا ترسو خوداناس بووە.. لە تەمەنی 50 ساڵیدا، بە ناڕەوا، بەسێدارەدا کراوە.. گەشمردەی نەمرو شامێری کوردستانە، لە ریزی جاویدانە.

گیانی بە بەهەشتی بەرین شادبێت.

**چاوگ:**

- نووسراوی الضحايا الثلاث، عبدالمنعم غلامی.
- گەشتنمای زەند، دەستنووس، زەند کەریم، سوود وەرگیراوە.

بۆ دەستی پیرۆزی پەیکەری دیموکراتیو راگرو ستوونی کۆماری کوردستانی ساوا لە مەهاباد.. فارمەانی هەمیشە زیندوو بارزانی نەمر مستەفا و نەوەو نیزەی پەیدەرپەی.

## بزاڤی بارزان 1945/10/11:

دوای شکستی شۆرش و کشانەوە بەرەو دەڤەرانی شنۆ، لاجان، سندوس، هەرێمی خاوەری کوردستان.

بە فەرمانی بارزانی نەمر، پەیوەندی نوێکرایەوە لەتەك رووسیای سۆڤیەتی – شووروەوی ئەو سەردەمە، لە رێگەی بیمارستانی نورمییەوە، بەهۆکاری نەخۆشیەوە.. کاك عیزەت عەبدولعەزیز، ئەنوەر عەبدولا دڵسۆز، میرحاج ئەحمەد، بە سەروەریەوە، بەشداری خۆشم.. گفتوگۆ لەتەك ژەنەراڵ ئەتاکشیوف، لۆپۆف سپاهود، ڤیلجیڤیسکی، کرا.

بە بێسیم گەیاندرا بە کرملین، وەڵام بە خێرایی هاتەوە هەموو بارزانی وەرگیران، دەرزی نەخۆشییان لێدابن.. بەرگی نوێ و چەك وەرگیرا.

## هەلکردنی ئاڵا:

22 ی کانونی 2 ی 1946، ئاڵای کوردستان هەلکرا، بارزانی نەمر شانبەشانی پێشەوا قازی محەمەد وەستاوە.. بە فەرمایشتی بارزانی نەمر، تەرمی مرۆیەك لە شێوەی کەڵە هۆزانڤانی کورد، حاجی قادری کۆیی‌دا، راست بۆوەو ئاڵاکەی ماچکردو چووەوە ناو دارتەرمەکەوە و راکشایەوە.

## بۆکان – ئابی 1946:

ژەنراڵ بارزانی نەمر لە ناو جیبێکدا، کاك ئەنوەر دڵسۆز لە تەنیشتیەوە، بە دیداری شادبووم، بە شێوەی یاسایی، نامەم پێشکەشکرد، وەکو سەربازێك.. خۆشم مامۆستای دەبیر بووم لە بۆکان.

## هۆکاری چەرخ:

گونــدی ســەراو سەرچـاوەی حەمەداغایــە، نێـوانی شـاری ســەکزو بۆکـان. یەدیۆلکۆنیك، سەرهەنگ، عیزەت عەبدولعەزیز ئامێدی، فەرماندەی هێزە، مێجەر ژەنراڵ بارزانی نەمر ئارایی هەمیشەیی هەیە.

رۆژانی کۆتایی تەمەنی یەکساڵ کەمتری کۆمـاری کوردستانە، بـە فـەرمانی ژەنراڵ بارزانی نەمر، نەخشە دانراوە بۆ گرتنی شاری سەکز.

لە ناکاو، نوری ئەحمەی تەها، لە تەورێزەوە هات.. هەر کە دابەزی، سەرۆك بارزانی فەرموی: ها، نووری چیە؟ گوتی: ئەزیەمنی تەورێز گیرا.

فەرمووی چۆن؟  گوتی: بەڵی ئەزیەمنی..

شێخ محەمەد ئەمینی مەڵحە، کەسی دووەم، دوای هێزا مامەرەزا، لە بـەرەی هەقەدا بە خۆیو 20 چەکدارەوە، لەوێ ئامادەبوو، هـەروەها میرحـاج ئەحمـەدیش و خۆشم... هەمووومان چاوەڕێی فەرمانی سەرۆك بارزانی بووین.

## شەوی کۆتایی:

کانونی یـەك / 1946.. کـاتی خۆئامادەکردنـە بـۆ هێرشـبردنە سـەر شـاری سەکز، بە مەبەستی گرتنی.

لەولاوە، تانکەکانی ئازەربیجانی، جرکەجرکو خرمەخرِ دەکشێنەوە.

هاوکات لەتەك هاتنی کـاك نـوری ئەحمـەد تـەها، کـە هـەواڵی گرتنـی شـاری تەورێز و هاتنەوەی هێزەکانی رژێمی ئێرانی بۆ نـاو ئازەربیجان، کـە بـۆ سـەرۆکی هێنا.

بـارزانی نـەمر، دوای ماوەیـەك رامـان، کـات 12 شـەوە، زسـتانە، پروشـەی بەفرە، ساردە.

سـەرۆك، فەرمانیـدایەی، 200 جـەنگاوەر، شـێخ محەمـەد ئـەمینی مەڵحەو، فەرماندەیی کاك میرحاج.

سەرۆك فەرمووی، بچنە بۆکان، ساینەقەلا بگرن بۆ ئەوەی هێزەکانی بارزانی بە ئاسایی بکشێنەوە.

هاتینە تەغیاباد، گروپی بارزانی بە خێزانەوە لەوێ ئاکنجیبوون.. بە بۆکاندا تێپەڕین، شارێکی خامۆش، بێئاگا لە ڕووداو..

هاتینە میاندواو، بە مەبەستی دیتنی ژەنراڵ عەزیمی سۆفیەتی، بەپێی فەرمانی سەرۆك بارزانی، چووینە سەربازگەی میاندواو، سەربازگەی چۆڵوهۆڵ، ژەنراڵ عەزیمی دیار نییەو تەنها یەك سەربازیشی لێنییە، کە گەرەك بوو ژەنراڵ عەزیمی پلانمان بۆ دابنێ، کەچی خۆی ڕاپکردبوو.

شاری میاندواو، تاقی سەرکەوتنیان لێدابوو بۆ پێشوازی لەشکری ئێرانی. بەرەو مەهاباد هاتین، بەفرو پشۆ دەباری، دیمان کە ئاڵای کوردستان، داگیراوە.

بەرەبەیانە، گازیەوبوو، ئەو دیمەنە کاریگەرە کاریتێکردین، چووینە خزمەت هێزا پێشەوا، لە خانەی خۆی، نوێژی بەیانیمان کرد لە پشتیەوە.

بە خیاباندا هاتین بۆ بارەگای پێشەوای مەزن، بە ڕێزەوە لە پشتیەوە بە پاسای سەربازی، بە چەکو چۆڵو جبەخانەوە دەڕۆیشتین.

پێشەوای مەزن، ئاوڕیدایەوە، ئێمەی بەو قیافەتو جۆرە دی.. فرمێسك بەخوڕ بە هەردوو چاویدا دەهاتە خوارەوە، کوڵی گریانی نەدەوەستایەوە، تاکو گەیشتینە بارەگای خۆی.. یەك کوردی ئەودیوی بەدواوە نەبوو.

### خەزانی تەمەن:

بارەگای پێشەوایە، بەرەبەرە کەسانێك دێن.

میرحاج، ڕوویکردە پێشەوا، گوتی، هێزا، بەڕێز پێشەوا، فەرمانت بە چییە؟

فەرمووی، ئێوە منتان دانابوو بە پێشەوا، کوردان منیان کردووە بە ڕابەر.. ئیستەکە، من سەربازی ئێوەم، سەربازی ڕێزدار بارزانیم.. ئێوە فەرمانتان بەچییە؟

هاتینە دەرێ، بەرگو پۆشاکمان گۆڕی، لەتەك شێخ محەمەد ئەمین مەلحە، تاوەکو گوندی گوێچکەدەرەی نزیکی ڕێگەی سەردەشت هاتین، پۆستەکانمان ئاگادارکردو گەڕاینەوە بۆ مەهاباد.

## ئەنجومەنی کۆماو دانو وەرگرتنی ئاڵای خەباتەو تێکۆشان:

ژەنراڵ بارزانی ئەمر 2 جار هاتە لای پێشەوا.. فەرمووی: هەر پێشەوامانی، لە تەکماندابە وەکو هێمای سەر کۆماری یاسایی نێودەوڵەتی، شانازیت پێوە دەکەین..

پێشەوا فەرمووی، بەڵێنم داوە بەرپرسەم بەرانبەر بەو سوێندەی کە خواردوومە.. لە خۆشیو ناخۆشیدا لەتەك میللەتە کەمدەبم.. لە نیشتمانو خاکی پیرۆزی خۆمدا گیان بسپێرم، إن العهد کان مسؤولا..

سەرۆك بارزانی، فەرمووی: دوژمن جێگەی باوەڕ نییە.. من تا دوا گوللەو فیشکەك ئەجەنگێم، تا ئەگەمە ئاوات چەك دانانێم.

لە سەردانی جاری دووەمدا هەر بەم جۆرە، پێشەوا گوتەکانی دووبارە دەکردەوە.

## وەرگرتنی ئاڵا:

پێشەوا سووربوو لەسەر هەڵوێستی خۆی.. سەرۆك بارزانی ماڵئاوایی لێکرد.

پێشەوا ئاڵای کوردستانی پێشکەشی سەرۆك بارزانی کرد، ئێمەش هەموو بە سڵاوی سەربازی لەبەر دەمیاندا وەستاین بەرپێزەوە.. سڵاوی یاساییو سەربازی بۆ ئاڵای کوردستان دەکەین.

پێشەوا، کلیلی قاسەو جبەخانەی دایێ، فەرمووی ئەمانە بۆ ئێوە باشە.. روویکردە سەرۆك بارزانیو، ماڵئاوایی لەیەکترکرا.

لەو دیمەنە پڕ شکۆدارەدا بە یاساو ڕیسای میری، ئاڵای خەباتو جەنگاندنی پێشکەشی بارزانی نەمر کرد و فەرمووی:

لە پێشینەوە بۆ پاشێن.. لە باشترین پێشینەوە بۆ باشترین پاشین.
من خیر سلف لخیر خلف.

ئێوە پێشەوای گەلو رابەرن.. ئەسپەردەی یەزدان بن، سەرفرازو سەرکەوتووبن.

منیش بە فەرمانی سەرۆك بارزانی، کرام بە بەرپرسی گواستنەوەی خێزانەکانی بارزانی و دامەزراندنیان لە دەڤەری شنۆو لاجان و سندوس و نەغەدە.

نەغەدە:

سەرهەنگ غەفاری هاتە نەغەدە بە دماینەدەیی سپاپود عەلی رەزمارا، هاتە خانەی پاشاخان و قولیخان، سەرانی خێڵی قەرەپاپاخ.. داوای خودانی بارزان شێخ ئەحمەدیان دەکرد.

خودانی بارزان، شێخ ئەحمەد، لە شنۆوە بە سواری داشقە هات، کات زستانو بەفرە.

بارزانی نەمر، ئێمەش وەکو سەرباز لە خزمەتیاندابین.. میوانی پاشاخان و قولیخانین بە ئەفسەرە کوردەکانەوە، کاك عیزت، میرحاج، نوری ئەحمەد تەها، جەلال ئەمین بەگ، بەکر عەبدولکەریم، خەیروڵا عەبدولکەریم، محەمەد قودسی، عەبدوڕەحمان مفتی، ئامادەبوون، وێڕای خۆم.

سەرهەنگ غەفاری، دوای نەوازشو گفتوگۆ، گوتی:

ئالا حەزرەت شاهەنشا، گەلێ نەوازشی هەیە، داخوازە کە بە دیداری شاد ببن، داوای دانوساندن دەکا..

سەرۆك بارزانی ماوەی مانگێ پتر لە تاران مایەوە، بە مەبەستی دانوساندن.

دوای هاتنەوەی هەر لە خانەی سەرانی خێڵی قەرەپاپاخ، لە نەغەدە، میواندارى کراین.

## جەنگی پارتیزانی:

سەرهەڵدان.. لە قەمەراواوە – قاراوا، 48 کم لە سەقزەوە، 64 کم لە بۆکانەوە.

بەرەبەیانی 24 نیسان، گوڵان، 1946 لەشکری ئێرانی بە فەرمانـدەیی سەرهەنگ کەسرە، فەرمانـدەی سەقز بە مەبەستی هەرەشە و تۆقانـدنو خۆتوانـدن 13 کم هاتە پێشەوە، بە ئاهەنگی مۆزیکاو فلوت.

بارزانیـان، بۆسـەیان بـۆ دانـان، لـە هـەموو لایەکـەوە ئاگربارانیـانکردن، 21 کوژراو و زامدار و 40 دیل، هێزان بۆ مەهاباد، ڕێزیان لێگیرا لەلایەن نشینیانەوەو بران بۆ تەورێز، لەوێ بەریاندان.

## مامەشا – مامەشە:

لەشکری ئێرانی بـە فەرمانـدەیی حاجی عـەلی رەزمـارا، سپاپود جـەنراڵ.. بارزانیـەکان، بـە فـەرمانو ئەخشـەی سـەرۆک بـارزانی، بەروپشـتی دەفـەری سەقزیانگرت.

گردی مامەشە، بەسەر شاری سەکزدا، فەرمانڕەوایـە، 2 بـەتالیۆن بـە تۆپـو تانکو فرۆکەی جەنگی هێرشیان هێنا.

بارزانیـەکان، بـە بـەرگو پۆشـاکی خـاکیو شـینکیەوە، نـەدەبینران... 13 جەنگاوەری بارزانی بەسەر گردەکەوەبوون

قارەمـان خۆشـەوێ خـەلیل بـە 30 چـەکداری بارزانیـەوە فریاکـەوت... بـە فەرمانی سەرۆک بارزانی، لە 200 یاردە – مەتردا نەبێ نابێ کەس تەقەبکات.

هاتنە پێشەوەو جەنگ دەستی پێکرد.. کوژراوی ئێرانـی 22.. زامـدار 40.. قارەمـان خۆشـەوێ بـە خەنجـەر هەڵیکوتایـە سـەر شـۆفێری تانکەکـەو بـە گوللـەی فرۆکەکـە گـەشمردەبوو.. بـرا بـۆ تـەورێز بـە زامـداریو لـەوێ گیـانی بـە بەهەشـت سپارد.

فەرمانـدەی جەنگی مامەشە، مستەفا خۆشناو بوو.. ئەخشەو پلانی سـەرۆک بارزانی ئەمر بوو.

## مەرگەڤەڕ:

فیبرایر 1947، لەتەك 2 ئەفسەری ئازەری، کە پەنایان هێنابوو بۆ سەرۆك بـارزانی.. هاتینـە مەرگەڤـەر، بـە مەبەسـتی ڕێگەخۆشـکردن بـۆ ڕووسـیا.. سەرینەگرت، سەید عەبدوڵا فەندی ئەمەری لەوێ نەبوو.

## گەلی کوتور:

ئـادار، 1947.. زنجیرە چیای سنوور.. مێـژوو لـە بۆسـەدا، خـۆی مـەڵاس دەکات، دەوەستێ.. دەنووسێ..

جـەنگی قـەهراوا و مامەشـە دەسـتەبەری ئەنـدازەی ئەمـەنی خۆگریـو خۆڕاگری کۆماری کوردستان بوو.. هێماو ئارمی شکۆمەندیبوو.

گـۆی زەوی لـە تـونی خـولی خۆیـدا، ڕۆژگـار دەپێچـێتەوە.. زەوی مـرۆڤ قووتئەداو دەیکات بە خۆراك.

پەروانە دەوەسووتێ، مۆم کز دەبێ، شەوگار شەق دەبێ.. بەڵام داستانی بارزانی ئەمر کۆتایی نایەت.

## بارزان – بارزانی:

درەوشاوەترین وشەیە، ناوەرۆکە، کرۆکە، پێناسەیە، لە مێژووی کوردا.. ئاڵایە، هەڵکراوە، لە لوتکەو بۆپەی چیا بڵندەکانی کوردستان، جەماوەری کورد خڕبوونـەوە لـە دەوری، ناسـنامەی میللـەتی کـوردە لـە ئاسـتی نـاوەوە و دەرەوەی کوردستاندا، کێشو سەنگو بەهای تایبەتی خۆی هەیە، لە ناوخۆو لە ناو هەرێمو نێودەوڵەتیدا.

زیندووە، ناوەکەت، تاوەکو کورد مابێ، بارزانی.

## جەنگی گۆجار و قاسملۆ:

30 مارسی 1947.. بەرەو قەڵای دمدم، جەنگاوەرانی بارزانی هاتن گوللە گلەیدەکرد بەملاو بەولاماندا.

قەڵاکە، داگیرکرابوو بە شەبەیخون لەلایەن لەشکری ئێرانەوە.. ئێمەش خۆمان گەیاندە ناو دۆڵی گەلی قاسملو.. تانکی رژێمی ئێرانی لە ناو گەلییەکەوە هاتە ناو گوندی قاسملوی مەمەنداغا، تلاوتل خۆمان رزگارکرد.. کشاینەوە بەرەو گەلی کۆتۆر.

سەرۆك بارزانی ئەمر، فەرمووی: ئێوە هێرش مەبەن.. ناردی بەدوامدا، چوار چەکدارم لەتەك خۆمدا برد.. 14 چەکدار بووین لە خزمەتی سەرۆك بارزانی ئەمردا، بەرەو دەفەری خێڵی شکاك، بە مەبەستی وتووێژ لەتەك عەمەرخانی شەرەفی، لە سەرانی خێڵی شکاك لە گەلی بارانەمەز پەڕینەوە و تێپەڕبووین، گەیشتینە گوندی گۆجاری سەید نورەدین ئەفەندی.. بنەماڵەو خانەوادەی سەیدەکانی نەهری.

کەدخودا – کوێخای گوند، مەڕێکی سەربڕی لەبەر پێی سەرۆك بارزانیدا. شەو لەو گوندە ماینەوە، جاڕی قەدەغەی هاتووچۆماندا.

مرۆڤێك لای رەشید بەگی مەوانەی هەرکییەوە هات.. ناو گوندەکە شڵەژاو چۆڵیانکرد.. هەر ئەو شەوە رەشید بەگ راسپاردەی ناردبوو، بۆ سەرۆك بارزانی کە بگەڕێتەوە، با جەنگ بەرپا نەبێو چ خوێن نەڕژێت.

گوندی گۆجار لە چاڵاییەکدابوو.. بەیانی کازیوە، ئابڵۆقەیانداین، سەری چیاکانیان گرتبوو، کە بە بەفر داپۆشرابوو.

سەرۆك بە دەست ئاماژەیدەکرد و فەرمانیدەدا.. دایانگرتین بە شەستیری قورس، سەنگینو سووك.. سەرۆك فەرمووی وەڵامیان بدەنەوە، کە ئەمز شەڕی کوردا ناکەم، بەری خۆ بدەن بۆ دوژمن.

دەستڕێژیانکرد، 4 جەنگاوەرمان لێ شەهید بوو.

سەرماو پشۆو بەفر، وێڕای زیخی تۆپی هاوەن.. سەنگەرەکانمانی داپۆشی.. زیخو قوڕ بە سەرمانەوەبوو.

سەرۆك فەرمووی کەس تەقە نەکات، لەماوەی 200 یاردا – مەترا نەبێت.

دەستڕێژ دەستیپێکرد، شکستیان هێنا.. هێزی پاشەنگ، فەرماندەی قارەمان هێزا ئەسعەد خۆشەوی لە دواوە فریاکەوت، کە هەمیشە هێزی پاشەنگی بارزانی ئەمەربوو.

هێزا ئەسعەد خۆشەوی مزوری گوتی: کەریم ماون؟ گوتم: بەڵێ ئەزبەنی، زۆری پێخۆشبوو..

هەر ئەو شەوە هاتینە گوندی خۆشەکۆیی بناری چیای خەلیل، زنجیرەی ئارارات، 3 رۆژ بەپێ لە شنۆوە دوورە.

خۆمان کۆکردەوە، نشینیان گوندەکەیان چۆڵکردبوو.

بەرەو جەنگی هەورسەو، بە مەبەستی رێگە خۆشکردن بەرەو رووسیا.

گوندی سلیڤانا، ئەرگی، دزگر.. دووبارە بۆ مەرگەڤەر.

## جەنگی هاورسە:

لەسەر سنوور، قەدپاڵی چیای خەلیل، جەنگی چوار شەو چوار رۆژ، تانکو فرۆکەو تۆپ.. بۆمباردمانی بێبەزەیی.. دێهاتەکان چۆڵیانکرد.. کە چاوگی نازووخەوە خۆراکو ژیانی جەنگاوەرانی بارزانیبوون، گەمارۆی ئابووری دراین.. بە سەرکەوتنی هێزی بارزانی کۆتایی هات.

## چیای گادەر:

چیای دالانپەر، سێگۆشەی سنوور، پەیمانی سێ سنوور، بیردەخاتەوە، 1944 قاسمی قادری نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ك. کوردستانی خاوەر، شێخ عەبدوڵای زینو دمایندەی کەرتی باشوور بە یاوەری نوێنەری بارزانی نەمر، مەلا وەهاب، دمایندەی کەرتی باکوور..

مێژوو، لە یاداوەریو بیرەوەری خۆیدا، لە تۆمارگەو مێشکیدا، بیرمان دەخاتەوە.

هەمان سنووره، هێزەکانی بارزانی بە خاوو خێزانەوە، کشاونەتەوە بۆ ئەم چیایە، مۆڵەتیان خواردووە، بە فەرمایشتی سەرۆك بارزانی بەپێی ئەو نەخشەو پلانە، کە رەو بەرەو رووسیا بە خاوو خێزانەوە، زیانبەخشە.

لە هەرسێلاوە، گوشاریان بۆ هیناوین، لەشکری ئێران و تورك و هێزی گەرۆکی عێراقی بە فەرماندەیی عەلی حیجازی.

15 رۆژ، لە گەمارۆو ئابڵوقەدا بووین. برێشکە – گەنمی برژاو بە ئاگری گڕ، سووتاندنی گوێنی کەتیرەی کوێستانەکان، بە خۆڵو زیخەوە، دەمانخوارد، خۆراکبوو.

## هەڵوێستی خۆنەویستی:

ئێوارەیەکی درەنگ، مەنجەڵێکی قاقۆن، ماماوەندی پڕ لە چێشتی برنج، بە دیاری لەلایەن خێڵی هەرکیەکانەوە، کە رەشماڵیان هەڵدابوو لەو چیایە، پێشکەشی بارزانی نەمر کرا... بارزانی نەمر، دابەشیکرد بە یەکسانی بە سەرماندا، هەریەکەو پارووەیەك، بەشی خودی خۆی نەمایەوە.. ئەمەیە دیمەنی خۆبەختکردن لە پێناوی گشتیدا.

ئەنجام:

بڕیار درا کە ڕێزدار و هێژا خودانی بارزان، شێخ ئەحمەد، بە خاوو خێزانو منداڵو پیرو پەککەوتەو نەخۆشو زامدارەوە، بگەڕێنەوە بۆ بندەستی میری سەعیدی لە عێراق، بە مەبەستی پارێزگارییان و رزگاربوونیان لەو رۆزگارە سەختو دژوارە.

خودانی بارزان، خۆیکرد بە قوربانی میللەت.

مێجەر ژەنەراڵ بارزانی نەمر، بە خۆیو جەنگاوەرانو فەرمانانیەوە، بە جەنگی چەکداری تاوەکو دوا هەناسەی ژیان، بەردەوام جەنگا بە گوێرەی ویستو ورەی پۆڵاینی خۆی کە دەیفەرموو:

دوا گوللە بۆ خۆمە، خۆبەدەستدانەوە بۆ من نییە.. ئەم شۆڕشە، شۆڕی کوردە، هەرکەس بۆ خۆیەتی.. شۆڕشی من نییە بە تەنها.

چەکدانان بۆ من نییە، تاوەکو ئەگەمە ئارمانج.. دوژمن جێگەی باوەڕ نییە، ورەتان بەرز بێت..

لێرەدا، گوتە بە نرخەکانی سەرۆک بارزانی کۆتایی دێت.

ئەفسەرەکان خۆیاندا بەدەستەوە، هەریەکەیان چیرۆکو سەرگوزەشتەی خۆی هەیە.. راو بۆچوونی خۆیان، رۆزگاری جیاوازیان، رۆڵی تایبەتی هەبوو لە پرۆسەی خۆبەدەستدانەوەیاندا.

ئەمە تاوەکو ئاپاری 1947 خایاندی.

کۆڕەوی مەزن دەستیپێکرد، 1947/4/19.. خۆئامادەکردن بۆ ئەم رەوە مەزنە کە دووەم کۆڕەوە دوای رەوی مەزنی سەرۆکی وڵاتی چین ماوتسیتونگ.

بڕیاری کۆڕەو زۆر نهێنی و پەنهان بوو، تەنها خودی سەرۆک بارزانی نەمرو راوێژکاری نزیکی کاک میرحاج ئەحمەد نەبێ، کەسیتر پەی پێنەدەبرد.

دوا ئاواتو هیواو گوتەم، ئەوەیە: ئەو سەروەریەم پێببەخشرێت کە بە یەکێ لە کوڕانی باوکی کورد و خوێندکارێکی خویندنگەو رێبازی بارزانی نەمرو سەربازو هەڤاڵێکی بابی کورد بارزانی بناسرێم.

سەری رێز و نەوازش دادەنەوێنم بۆ ئەم یادە پیرۆزە، بە شانازییەوە.

سوپاس.

کەریم زەند

گەڕیدەو جوگرافناس

2002/12/16

## دوا فەرمایشتو گوتەی سەرۆك بارزانی نەمر:

لە سەرەمەرگدا، راسپاردەکەی ، ئەم گوتە زێرینەبوو:

گرنگ نییە، ئەگەر گۆڕەکەم، لە زەلکاوێکی لیخنو پیسوو ئەوت ئامێزدا بێت، یاخود پێگەی کۆتاییم، ئێسکو پروسکم لە کەلووی – تاوار – بەردی مەرمەڕدابێت، لەسەر لوتکەو بۆپەی چیایەکی بڵند، جاویدیێ لە خەونێکی قووڵدا، لەو خەوابگەیە.

نووسینی:

پۆدپۆلکۆنیکی سۆڤیەتی، سەرهەنگ نیکۆلای بیکیلنك، لە دەزگای پاراستنی سۆڤیەتیدا – K.GB یۆری ئەندرۆپۆڤ.. دەربارەی نهێنیەکانی بارزانی نەمر.

## دوا خەونو ئاوات:

هەنووکە، رەوانی پیرۆزو خاوێنی دەکشێ بەرەو ئەم یادە شکۆدارە، بەسەر سەرمانەوەیە، لەم بۆشاییە بەرینەدا دەچرپێنێ بە گوێماندا.

دەفەرموێ:

ئاشتی، ئاشتی..

## چاوگ - ژێدەر:

- حركة كوردستان و آذربيجان التحررية. نشوؤها، طبيعتها، إخفاقها... 1947-1945 - مطبعة كامراني - السليمانية، 1959 - كەريم زەند.
- تۆمارى ئەممەن گەشتى زەند، دەستنووس.
- نهێنییەکانی بارزانی نەمر، پۆدپۆلکۆنیک نیکۆلای بیکیلنك، یوری ئەندرۆپۆف.. دەزگای پاراستنی سۆڤیەتی K.G.B. و. كەريم زەند.

# مفتی

## مەلا عەبدوڵا مەلا کەریم

## 1952 - 1881

مفتی دیاری نەك پێنجوین – پێنجوێنە – پێنج بنەماڵەو خانەوادە.. بەڵکو مفتی دەفەری شلێرو ناوخوانو مەریوانو – میهرەبان، کە بە ناکامی بڕیاری زەمەنو چەرخ هاوتاو ناستو پلەو پایەی قانعی بلیمەت نماینەو هێماو نارمی رەوتی زەمەن بن لە تاکە دراوێکی دوو رووداً.

هۆزانڤانو هۆنەری خاوەن بەرهەم، مەلا عەبدوڵا لە هەستی نیشتمانپەروەریو نەتەوەپەرستیدا، لە دواقۆناخی خوێندنی لە شارۆچکەی بیارە – بوێرە، بە هۆکاری زیرەکیو گوتە رەواییەوە، مەلای گەورەی ئەو کاتو سەردەمو سەروبەندی بیارە، هێژا مامۆستا مەلا عەبدولقادر خوازناوی مفتی پێبەخشیوە، بە پیرۆزبایی مفتی ناوداری شاری سنە - ساناندوژ – سنگلوژ، مەلا عەبدوڵا، هەردوو ناوەکە، لە خوازناوی مفتیدا هەردوو عەبدوڵا کۆ بکاتەوە، عەبدوڵای مفتی سنەو عەبدوڵای مفتی پێنجوین، ئەو لە پیشەو شێواز و کاری مەلایەتیدا و ئەمیش بە دوکانداری جگەرە فرۆشتنەوە.. بژێوی خۆیو خێزانی دابینبکات..

هۆنراوەکانی زادەو بەرهەمی بیرو هزری هەڵقوڵاوی کۆمەڵگەی کوردەواریو نەریتی بابو باپیر، ئێشو ئازاری تێکڕای نەتەوەکەی، گەشبین ، چاوی لە ئایندەو ئاسۆی روونی نەتەوەکەی، پێشکەوتنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی کوردستانی سەرانسەرو سەراپا هەر لە باشووری ئەرمەنستانو کاپکاسەوە، هەتاوەکو کەنارو لێوارەکانی بەندەر دێلم – دێی لم و بەندەر بوشەهرو تەنگی هورمز لە سەر

کەنداو، بە درێژایی و بە پانیش، لە دامێنی چیاکانی زاگرۆزەوە – زاگرۆز، تاوەکو قولگەی ئەسکەندەروونە و گوندی راژۆ لەسەر دەریای نافەند میدیتیرینا، بلیمەتی گەورەی نەتەوەیی حاجی قادری کۆیی 1815 - 1892 وتەنی:

به درێژی له قاف که رابوردن  تا به شیرازو لەکستان کوردن

وەسـەتی پانی 15 رۆژ رێیە  پڕ لە رەشـماڵو خانەو دێیە

کەڵـە هۆزلنقـانو شـاعیرمان لـە 1881ز لـە گونـدی بێسـتانەی دەڤـەری پێنجوین، لـە سـەرەتای خوێنـدنی ئاینیـەوە بـە شـارەکانی کوردسـتاندا، دەڤـەری پێنجوین، مەریوان، بانە، سەقز، بۆکان، مەهاباد سەراو سەرچاوەو دوا جێگیربوونو ئاکنجی بوونی لە بیارەو بڕوانامە وەرگرتنی و گەڕانـەوەی بۆ شاری پێنجوین لـە دووکانێکی گچکەی پـەرپووتی قەڤـەزە شکاوو تۆزاویو خاڵیدا، پشتی جامخانـەی رەنگینی لـە تەختـەی سنوقەچیا دروستکراو، کابرایـەکی لاواز.. چاویلکە لـە چاو، ریش ماشو برنج، تۆزی تـووتن و ناسۆرو سەختیو دژواری ژیانو رۆزگار، سیمای خۆیو جامانـە مەیلـەو زەردو بۆرەکەی سـەری، بـەرەنگاری رۆزگار لەسـەر دووپێ ئاوێتەی دەرونو ئاخو نەفسی بەرز دەبێتەوەو دەڵێ:

لەسایەی زەحمەتی قاچو سەرو شانو دەستو ئەستۆم

لە بۆ کەس چاو لەبەرنانێم و خەیاڵی رێی ریا ناکەم

دووکانەکەی پانـەو خوێندنگەی وێـژەیی وانـەی پـەروەردەیو دەروونناسـیو کـاری مەردانـەو کـاری نەتـەوەیی و دۆسـتو دوژمـن ناسـی و خـەباتی نەتـەوەیو جینایەتی.. سەرمەشقی کارە شاکارەکانی بوو..

دانـانی گچـەکەی لەسـەر ئـەو دووکانـە، هێماو نیشـانەی خـەباتی ئـافرەتی کوردبوو، رەنگدانەوەی لە بەرەنگاری سەختی ژیاندا.

سۆز و هەسـتو نەسـتو کـامو تاسـەو ئـەڤینی خـاکی پیرۆزی نیشـتمان داوای لێدەکات کە تەرمەکـەی، ئـەو قاڵبـە گڵەبێت لـە گـردی سـەیواندا، بارەگـای جیهـانی ژێرووی بێت، ئەسیری هاوپیشەی 1895 – 1962، کە دەڵێ:

**ئەی ئەسیری هێندە عەشقی میللەتی کوردت هەیە**

**بشەری لاموایە گۆڕی گردی سەیوانت دەویّ**

سەیوانیش شەرمەزار نییە، کە تەرمی پیرۆزیان لـە ئـامێز بگرێـت.. چونکە ڕۆڵەی بەئەمەکی خۆین.

ڕاسپاردەکەی نەهاتەدی، برایەوە بۆ پێنجوین کە لە ژیانیدا فەرموویەتی:

**پێنجـوین بەبێتـۆ نزیـکە مەرگـم  لوبنان شکێن بووی داخی بەجەرگم**

**تازە بووکــێـبـووی بەسـەر چیاوە  ئەهاتـە سـەیرت لەملاو لەولاوە**

**پارچە ئەرزێبووی لە پارچەی بەهەشت  زەردوسوور و شین کەژوکێوودەشت**

بـەڵام، خزمـان تەرمـە پیرۆزەکـەیان بـردەوە لـە گۆڕستانیحاجی شـێخ، ناوەندی پێنجوین، ئارامگەو خەوابگەی جاویدی بۆ ڕازایەوە.

مفتی، لـە بـواری پـەروەردەی نـەوەو نـیـژە و هانـدانیان بـۆ خوێنـدن پێـنج خشتەکیەکەی لەسەر هۆنراوی هۆزانڤانی نەتەوەپەرست، ئەحمەد موختار جاف 18998 – 1935، کە دەڵێ:

**دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەیی جەهلە**

**لە سایەی عیلمەوە ئەمڕۆ، ئیتر نۆبەی زەفەرتانە**

**گەلیّ چاتر لە ژینە ئافەتو ئاهون و مردنتان**

**هەتا وا ناحەزی یەکبن، لە بۆ یەکرێکەگرتنتان**

**بە هیچ نابێ هەتا وابن، لە بۆ یەکرێکەگرتنتان**

**بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان**

**هەموو ئانو زەمانێ هەمینی قەڵخانو سوپەرتانە**

وێـڕای بابەخـدان بـە وێـژەی منـداڵان و لـە ئۆپـەرێتێکـدا گفتوگۆی نێـوانی مفتیو گێلاسی کچی، دەڵێ:

**بابە گیان ئەمڕۆ من پێگەیشتووم**

**لە ژینی دنیا باش تێگەیشتووم**

**کوڕو کچ هەردوو بەشداری ژینن**

**هەردوو نەمامی ڕووی سەرزەمینن**

وەکو مەلای گەورەی کۆیە، کچانی خۆی دەخاتە بەر خوێندن لە خوێندنگەی کوڕانی پێنجوێن، کە لەو سەروبەندەدا نەک هەر خوێندنی کچ، بەڵکو خوێندنی کوڕیش تا ڕادەیەک ستەمبوو.

مەلا قادری ئارمەردەی نزیکی شاری بانە، سەرزەنشتی مفتی کردووە بەو هەڵبەستە.

ئێستا ئاخر زەمانە کچ دەخرێتە خوێندنگە ژن ماڵومێرد بەجێدێڵێ و دەچێ بۆ سەیرانو نامە دەنووسێ. ئەمانە هەر هەموو کفرو ناپەسەندو نابەجێن. کە دەڵێ:

**وەکو بیستومە لای ئێوە کچان    ئەچن بۆ مەکتەب بە ئابڕووتکان**

**کاغەزنووسینیش کوردی زمانە    دیارە نیشـــانەی ئاخر زەمانە**

مفتی لایەنو پابەندی خۆی بە خاکەوە فەرامۆشنەکردووە، هەڵبەستەکەی گەواهی چەرخو سەردەمو باپۆگرافیای ڕۆزگاری ژیانیەتی، کە دەڵێ:

**مودەتێکە من بە مەخفی شیوەنو گریان ئەکەم**

**هەر خەیاڵی خاکو قەومی میللەتی کوردان ئەکەم**

**ڕوو بە سەحرا سەر ئەنێمو قوڕئەپێوم پڕ بەدڵ**

**بێخەبەر وا لێدەگەن من بێخەمم سەیران ئەکەم**

**ئاوی چەشمەی چاوەکانم وا بە هەوری خەم تەڵی**

**شۆخیو یاری بە زەردی ئاوەکەی سیروان ئەکەم**

لێڵی ئەسرینو ئەشکو فرمێسکی یاریو گەمە بە لێڵی ئاوی ڕۆباری سیروان – سێروان ئەکات..

لێڵی سیروان سروشتییە و لێڵی فرمێسکی مفتی ئێشو ئازاری نەتەوەکەیەتی.

مفتی هانی کارگەرو جوتیارو ڕەنجدەری کوردی داوە، بە مەبەستی بەرهەمهێنان و هەناردنو هاوردن، دژی بێکارەیی و درۆو سستیو کاری پڕوپووچ

بووە.. دژی تەمبەڵیو دەستپانکردنەوە بووە، بەگژ ئەفسانەو درۆو دەلەسە بە ناو ئایینەوە بەرپەرچیداوەتەوە، هانی پیشەسازی خۆماڵیو جێگەیی بووە کە دەڵێ:

**بە شاڵی خاکەکەم رازیم ئەپۆشم هەتا مردن**

**لە فاسۆنو گەبەردین تا ئەبەد سەڵتەو کەوا ناکەم**

ئەسیری ئاسایی وتەنی:

**لاوی کوردی من لەبەرکەن شاڵی زاخۆو ئامێدی**

**گەر تۆ سەد چاکتر لە ئیشی ماڵی جاپانت ئەوێ**

**دوا گوتەم:**

ساڵی 1942، سەردانی شارۆچکەی پێنجوینم کرد، لە بواری گەشتوگوزاردا، خوێندکاری ئامۆژگەبووم لە بەغداد.. لە کوچەو شەقامێکی باریکدا، تەنیشتی مزگەوتی پاشا، دوکانە پەرپووتەکەیم بەسەرکردەوە، بە نیازی ناسین و دیداری.. پێشوازییەکی بەگەرمی کردم و جگەرەیەکی پێشکەشکردم.. منیش گوتم، ببەخشە بەڕێز، جگەرە ناکێشم، دامەوە دەستی.. فەرمووی بە نەوازشەوە، ئەی جەوان، خەڵاتتکردم بە دانەوەی جگەرەکە، ئەوە ئاواتو خەونمە کە جەوانان جگەرە نەکێشن.. نەك هەر ئەوەی جگەرەکەت بۆ گێڕامەوە، سامانێکت پێبەخشیم، ستایشو سوپاست دەکەم..

هەروەها سەرەتای پەنجاکان کاری لانەوازی بردمی بۆ ناوشاخانو بووبانی پێنجوین، سەرقاڵی وانە وتنەوەبووم لە چێوەی خوێندنگەی سفیلدا وانەم بە هێژا شێخ محەممەدی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی کڕپچنە دەگوت.. سەرم لە رێزدار مفتی دەداو ئارایم لە خزمەتیدا هەبوو، لە خەزانی تەمەنیدا، ئاواتی ئایندەی روونی میللەتەکەی بوو، ماڵئاوایم لێکرد و ئیتر لەیەکتر دابڕاین.. ئەویش کۆچیکرد بۆ جیهانی ژێروو، 1952..

پرشنگداربێت یادی مەردانەت، تاکو 2 دێڕی کوردی بنووسرێت هەر لە یادی ئەوەو نیژەدای.. ئارام بێت لە خەوابگەکەتا، لەسایەی خوێنی گەشمەردەکانی رێبازی پیرۆزی مێجەر جەنراڵ بارزانی ئەمرو سەرانی گەشمەردە کاکە ئیدریس.. ئاواتەکانت هاتۆتەدیو خەونەکانت بەدیهێناوە..

# الميـد

## آخر إمبراطورية 678 – 550 ق.م.

الميديون، هم أصل الكورد.. شكلوا إمبراطوريـة مستقلة في شمال غـرب إيـران واتخذوا من همدان – ئەكبتانا – هەمگمتان – هەكمەتان – ديدارگەی تيرمو خيلان، مركزاً لحكمهم و قد تحالفوا مع الكلدانيين لإسقاط مملكة آشور و دخلوا عاصمتها نينوى – نين ناڤا – مدينة نين – ناڤايى نين – عام 612 ق.ز.

و حكم الميديين استمر زهاء 128 سنة، كانت كوردستان مستقلة تماما، بيد أن الضعف و الانهيار دبا في كيان الدولة الميدية على اثر ظهور الأخميـنين في الجنـوب الذين انتزعوا السيادة من الميديين و اسسوا الإمبراطوريـة الأخمينيـة في زمـن ملكهـم كورش سنة 550 ق.م.

و عقب زوال الميديين فقدت كوردسـتان اسـتقلالها و كيانهـا و اصبحت إقليماً تابعاً للسلطة الأخمينية.

و مــن ثــم تحولـت الى سـاحة و ميـدان للصــراع بـين الأخمينـيين الفـرس والمكدونيين اليونان، و المعركة الفاصلة و الحاسمة في موقعة گوگميلا – كۆك مـەلا – كۆكمله – بەستورە، قرب مدينة اربل – هەولێر، عام 33 ق.م. بين داريـوش - دارا الفارسي و اسكندر المكدوني.

و قد تداول الصراع بين القوى المختلفة المهيمنة على كوردستان نظراً لأهميـة موقعها الاستراتيجي الذي كان بمثابة ممر و كجسر لعبور الجيوش الزاحفة و القادمة من الشرق و الغرب.. بقيت أرض كوردستان سـاحة للصـراع في زمـن الدولـة الفرثيـة البارتيـه 125 – 250 ق.م. و الـتي تأسسـت في خۆراسـان – خۆرناسـتان – إقلـيم

الشمس و اتسعت غرباً باتجاه كوردستان و دخلت في حروب عديدة الى ان بسطت سيطرتها على كل من ايران و ارض الرافدين.

و انتهى حكم الفرثين على يد طائفة اخرى و هم الساسانييون الكودر الذين شكلوا قوة عسكرية عظيمة و سيطروا على مقاليد الأمور في الدولة الفرثية و اسسوا محلها الإمبراطورية الساسانية الكوردية سنة 250م.

و قد دخلت هذه الإمبراطورية في نزاع مستمر مع الدولة البيزنطية – بيزنس، بهدف السيطرة على كوردستان و ارمنستان و بادية سورية.

و في القرن السابع الميلادى تعرضت كوردستان الى حملة أخرى تمثلت في الفتوحات الإسلامية و اصبحت أرض الكورد ميداناً للقتال و الحروب و الوغى ومعارك جلولاء، گولاله – قرمغان و حلوان و نهاوند و شهرزور.

و هنا يقول المسعودي في كتاب مروج الذهب و معادن الجوهر بالنص هنا واغرقوا سكان منطقة شهرزور بالبحر من الدماء و الدموع بحيث تقشعر له الأبدان و تشيب به الولدان.

دار الأندلس – بيروت – لبنان

الطبعة الرابعة 1401هـ - 1981 م

عدد الصفحات مع الفهرس 446.

و يقول الشاعر پوراپۆش؛

هرمزگان رمان ئاتران کشان　　ویشان شاردەوە گەورە گەورەکان

زۆرکار ئارەو کردنە خاپـــور　　گنای پاڵە تا شـــــــــارەزوور

شەنو کەنیکا وەدیل پشـــیندا　　مـــەرد ئازانگـــی وە رووی هوینــا

رەوشت زەردەشت مانەوەیکەس　　پزیکانیـکا هورمــز وەهیچکـــەس

بمعنى؛

هدمت المعابد و اطفئت النيران و اختفوا الأشاوس و الصناديد و العنصرية الفاشزمية العربية شرعت ماكنتها الإرهابية بالعمل و حملة السبى لتحصد الأرواح

الكوردية بغير حساب و دون تمييز الأنفال و السبي و الأسر من Eternal الغوانى والحسناوات و الكريمات و أجساد الجدعان تتلاطم بين الأمواج من الدماء و بقيت تعاليم زەردەشت وحيدة و ظلت فريدة لا نصير لها و إله هورمز _ أهورامزدا لم ولن يشفع لأحد مضاهياً لسبي بابل و كانت أرض الجزيرة في كوردستان معقلاً للخوارج و المارقين و الطوائف الأخرى المعارضة للحكمين الأموي في الشام و العباسي في بغداد و في معركة الزاب التي دارت بالقرب من أربيل – هەولێر سنة 132 هـ - 749م، انتصر الجيش العباسي على الجيش الأموي و في 945 م تعرضت كوردستان للغزو البويهي و إستيلائهم على بغداد، مقر الخلافة العباسية – باغ داد، و أعقبهم السلاجقة و هم طائفة من الترك، نزحوا من بلاد ما وراء النهر باتجاه عاصمة الخلافة العباسية و احتل الجيش السلجوقى أرض كوردستان في زمن ملكهم طغرل بگ عام 1054 م.

و في زمن السلاجقة أصبح الجزء الشمالي من كوردستان منطقة للصراع والحروب بين الدولة البيزنطية و سلاطين السلاجقة و معركة ملازگورد قرب بحيرة ڤان من المعارك الشهيرة زمن السلطان السلجوقى الب أرسلان بك 1070 م.

و بظهور المغول في الشرق و زحفهم باتجاه بغداد، عاصمة الخلافة العباسية، تعرضت كوردستان الى حملة همجية بقيادة هولاكوخان، و صمود الكورد في قلعة أربيل – هەولێر، أمام الغزو المغولي هو بحق ملحمة كبرى و لكن لم يكن بامكان الكورد وحدهم ايقافه او التصدى له، بيد أن تفويت الفرص و عدم الإدراك لمصادر المياه الآتية و انابيبها المدفونة من مصيف بستۆره الى داخل القلعة، فكان الوازع الأساس حيال فشلهم للإستيلاء عليها و الخذلان و الركوع أمامها.. لذا استمر زحفهم حتى أسقطوا الخلافة 656هـ - 1258 م. و دخلت كوردستان مرحلة تاريخية مظلمة لم يسد البلاد الأستقرار و الأمن بل ظلت الحروب و المنازعات بين الطوائف المغولية من الأيلخانيين و الجلائريين ثم النزاع بين الدويلات التركمانية قرەقۆینلو، آق قۆینلو – الخروف الأسود و الخروف الأبيض، تعد أظلم فترة من تاريخ شعب كوردستان.

و في بداية القرن السادس عشر الميلادي شهدت مرحلة أخرى بين قوتين جديدتين، الصفويون الفرس و العثمانيون الترك.. و اتخذ صراعهم ستاراً دينيا ومذهبياً، السنة و الشيعة.. و وقعت أكبر معركة عسكرية بالغرب من مدينة تبريز، بحيرة ئوروميه، عرفت بمعركة چالْديْران المشؤومة – چلديران 1514م.، واندحرت فيها القوات الصفوية الفارسية و اضحت مساحات واسعة مترامية من كوردستان تحت السيطرة العثمانية التركية فكانت نقطة التحول و بدء الاقتطاع و تجزأة كوردستان.

و الصراع الفارسي التركي الدائر على مدار خمسة قرون، ترك أثراً سيئاً على الأوضاع في كوردستان بسبب المعارك و الحروب التي دارت رحاها على أديم أرض الكورد و خلالها تمكنت بعض الإمارات الكوردية الاحتفاظ باستقلالها الداخلي.. بيد أنها ضعفت بسبب الصراع الداخلي الذي كان للفرس و الترك يدٌ في إشعال نيرانه.

و بعيد الاستكشافات الجغرافية و الرحلات دخل العالم مرحلة جديدة و كان روادها الأوروبيون في فترات لاحقة.

جاءت الثورة الصناعية و ازدادت الحاجة الى السلع و مواد الخام، فدفعت الدول الأوروبية الى البحث عن مصادر أولية لإدامة ثورتها الصناعية و اقامة العلاقات الإقتصادية و التجارية و الاستفادة من السواحل في حين ظلت كوردستان بعيدة عن تلكم التطورات بسبب موقعها القاري و تأخر الكورد كثيرا في إقامة الاتصال مع الحضارة الأوروبية و العامل الطبيعي – الطوبوطراڤي، مظاهر سطح الأرض من مرتفعات و منخفضات، سلسلة جبال زاگرۆز – زگرۆز – مولد الشمس من شمال غرب كوردستان الى جنوب الشرق منها.

و تأثير هذا العامل في تكوين المجتمع و اللغة و العادات و التقاليد و العامل البشرى الإنساني، التركيب و التكوين الإجتماعي و التكوين النفسي المشترك والسياسة الدولية و معاهدة زهاو – زهاب 1639 بين العثمانية التركية و الفارسية و بين السلطان مراد الرابع العثماني و الشاه صفيالدين الصفوى الإيراني.. مما مهد للسلطان سليمان القانوني لبسط سيطرته و سلطانه و نفوذه على حكم طهماسب

الشاه الصفوي 1555.. اول تقسيم دولي لأرض كوردستان بين دول التقسيم، الدول المقسمة عليها كوردستان و الإبقاء على إرتكاب دول التقسيم الظلم و القمع و ادامة الظلم و الاستبداد اللذين يمارسان بحق هذا الشعب المظلوم المغلوب على أمره، نتيجة ثوراته الدفاعية عن نفسه.

بذلت كل من الدولتين إضعاف الإمارات الكوردية و اصبحت كوردستان مستعمرة دولية مشتركة كما يقول البروفيسور و العالم الاجتماعي التركي إسماعيل بيشكجي عقب الحرب الكونية الأولى 1914 – 1918، تعاني حالة الاقتطاع والتقسيم و التجزأة منذ سقوط دولة الميد و حتى ساعة إعداد و ترقين هذه الأسطر.

فكان الكورد و لا يزالون رابع أكبر قومية في الشرق الأوسط، و ربما الأتعس حظاً و هم اكبر جماعة اثنية في العالم ليس لها دولة خاصة بها.

هكذا يقول جوناثان راندل في كتابه امة في شقاق.. و انا أمريكي أخجل تجاه هذا الواقع المرير.

و يقول رونالد مونش، البروفيسور الألماني، رئيس جامعة بريمن الألمانية في كتابه ( الدولة الكوردية عامل استقرار في الشرق الأدنى) ترجمة حسين نيرگسجارى. و عنوان هذه الدراسة ( الدولة الكوردية مساهمة لإستتباب السلام في الشرق الأدنى وأحدى عوامل الإستقرار، قدمت الى مؤتمر الحرية للشعب الكوردي المنعقد في فينا عام 1992.

و لعوام مضت و الحيف التاريخي و تراكماته يحدو بنا بأن نطالب في هذه الظروف العصيبة و المتأزمة بالحد الأدنى من الحقوق المشروعة، اي الفيدرالية و هي الاتحاد الإختيارى و الطوعي مع المركز عقب تحرير العراق من النظام البعثي المقبور و من الحكم الدكتاتورى البغيض.

و من نكد الدنيا عنه الحرّ أن يرى عدواً له ما من صداقته بدُّ

فيا نكد الدنيا متـــى أنت نازحٌ عن الحرّ حتى لا يقاربه ضدُّ

المتنبي

**قال طاغور**

يا ربيّ لا تجعلني أصاب بالغرور إذا نجحت، و لا أصاب باليأس إذا فشلت، بل علمني إن الفشل هي التجارب التي تسبق النجاح.. يا ربّ علّمني إن التسامح هو أكبر مراتب القوة و إن حب الإنتقام هو أول مظاهر الضعف.. يا ربّ إذا جردتنى من المال، فأعطني الأمل.. و أذا جردتنى من النجاح، اترك لي قوة الإرادة، حتى أتغلب على الفشل و إذا جردتنى من نعمة الصحة، فأعطني نعمة الإيمان. يا رب إذا أسأت الى الناس فأعطني شجاعة الإعتذار و إذا أساء لي الناس فأعطني شجاعة العفو و إذا نسيتك فلا تنساني يا رب.

شاعیر و نووسەرانی کوردستان بووە وەک (مەلا عەبد الکریمی مدرس، هەژار موکریانی، مەلا مستەفای زەلمی، مەسعود محەممەد، هێمن)و چەندانی دیکە

بەشداری لە کۆنگرەی (مەرجەعێکای جیهانیدا کردووە، لە شاری سلێمانیدا سەردانیان کرد و ئەم گفتوگۆیەمان لە تەکدا سازدا.

*** سەرەتای ناشنایەتیت لەگەڵ مەلا مستەفا بارزانی نەمردا بۆ کەی دەگەڕێتەوە؟**

- سەرەتای بە دیدار شاد بوون و ناشنایەتیم دەگەڕێتەوە بۆ/ سالانی ١٩٣٩-١٩٤٣ کات و سەردەمی دەستبەسەری بارزانی نەمرو خوداتی بارزان و بارزانییەکان لە شاری سلێمانی منیش وەکو خوێندکارێکی پڕ هەستو جۆشی نەتەوەیی کوردایەتی لە پارتی کۆمەڵەی برایەتیدا کارمەند بووم، ئەو سەروەرییەم بۆ رەخسا کە خانوو پێشکەشی خزمانو خالوانی بارزانی نەمر بکەم کە لەحۆزی شێروانی ـ شەریف ئاغا حەسەن و خزمانی حەمەد ئاغا مێرگەسووری بوون. . تەنانەت لە کاتی گواستنەوەیاندا بۆ نوستانی بابل، سەرەم لێندەون، چونەتە خزمەتی خوداتی بارزان - هێزا شێخ ئەحمەد بارزانی، بارزانی نەمر بەو هۆکارە دیەنی و سەردانی خانەی زەندی کردووە، دهانەر پێی پیرۆزی هاتووەتە ناو خانوو و خانەوادەی زەند کەریم

بەو بۆنە پیرۆزەوە راسپێری ئەوەکانم کردووە، کە ئەم خانووە نافرۆشرێت گەرەکە پارێزراوبێت، ئەو سەروەرییە دەگمەنە هەدییەیە.

*** لەسەر چ بنەمایەکی سیاسی و سەربازی، بارزانی نەمر بەشداری لە کۆماری (کوردستان) لە مهابادا کرد؟**

- دوای شۆڕشی بارزانی ١٩٤٣- دەرئەنجامی گەڕانەوەی شێری بارزان (مستەفا بارزانی) بۆ لانەکەی خۆی بە کۆمەکی کۆمەڵەی برایەتی ١٩٣٧-هاریکاری شێخ لەتیف حەفید و ئەحمەد مەحوی وێڕای رۆڵی پارتی هیوا بە سەرۆکایەتی مامۆستای بالا رەفیق حیلمی، خەفەر کەوتنەوە و خامۆشی ئەو شۆڕشە، زەمینەی سیاسی هاتە کایەوە بۆ بەر پابوونی - شۆڕشی بارزانی ١٩٤٥-

گەرمەی جەنگی دووەمی جیهانییە، گوشار خراوەتە سەر رووسیای سۆڤیەتی لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانیای هیتلەرییەوە. گەرمەی جەنگی چەکی سپی بوو لەناو شاری ستالینگراددا لەسەر رووباری ڤۆلگا و هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەر تێهران و دابەشکردنی بە کردنەوەی رۆخی دووەم - بەمەبەستی سووکبوونی گوشار و فورسایی بۆ سەر رووسیای سۆڤیەتی.

کشانەوەی هێزەکانی بارزانی بۆ کوردستانی خاوەر دوای شکستی نسکۆی، پەیدابوونی میانەی سیاسی و نەتەوەیی و سەربازی لەتەک شۆڕشی سپی کوردستانی خاوەر بە سەرکردەیی کۆمەڵەی ـژ.ک ـ پارتی دیموکراتی کوردستان ـ بە رابەرایەتی پێشەوای مەزن (قازی محەممەد).. بەشداری بارزانی نەمر لەکاتی هەڵکردنی ئالای کوردستاندا لە مهاباد و جاڕنامەی کۆماری میللی کوردستان ـ ١٩٤٦/١/٢٢ رێکەوتی ٢ی رێبەندانی ١٣٢٤ی هەتاوی بارزانی نەمر کۆڵەکە و ستوونو راگرو پەیکەری دیموکراتی ئەو کۆمارە ساوایە بوو. لەبەرجەستە بوونی رۆڵی بابی کورد هێزی بارزانی بە ٤٠

**KM: Arabic and other Islamic countries have blamed Kurds for being a friend of Israel. For its part, however, Israel has not had any relations with the Kurds; indeed sometimes they have betrayed Kurds. Are there any political, economic or social relations between Kurds and Jews? Including the Kurdish-Jewish in Kurdistan and Israel?**

Mr. Zand: Relationships among nations are based on interests. To have better power, it is in Israel's interest to befriend us. I know there is a committee working to enhance Kurdish-Jewish social relationships, but I am not aware of any political relationship between Kurdish authorities and Israel. But, it is important for us to come forward and play a role in the region's political arena.

**geographers and politicians, excludes some of the Kurdish regions, town, and lakes in it?**

Mr. Zand: That is due to Kurdistan's geographic change by the regimes of Iran Iraq, Syria, and Turkey. These regimes had worked hard to shrink the geography of Kurdistan. I have seen the historic geography map of Kurdistan everywhere, even when I visited Israel in the Israeli Hall of Maps. A Kurdish-Jew gave me a copy of this map, and written in Hebrew, refers to Kurdistan. Definitely, this is the official and exact map of Kurdistan. All Kurds must recognise and use this map as the 'Koran of Kurds.'

**KM: What is your advice for the Kurdish authorities in southern Kurdistan?**

Mr. Zand: Not only what I request from the Kurdish ruling parties, but also the dream, hope, and aim of all ordinary Kurds - that these two Kurdish administrations in Hawler and Sulaimani be united. While Kurds in the Governing Council of Iraq are working hard for unification of Iraq, Kurdistan is divided into many parts and Kurds themselves are not united!

Federalism must be implemented within a united geography of Kurdistan including the newly liberated Kurdish regions.

Recently, a group of Kurdish intellectuals visited the US Administrator of Iraq, Paul Bremer, who told them that until now the US does not know what the Kurds are asking for! Now, after realizing that, these intellectuals have established a referendum agenda.

**KM: You mentioned referendum. Is it the people of Kurdistan's strategy, or the Kurdish political parties' temporary plan?**

Mr. Zand: I raised my voice and asked the Kurdistan Democratic Party (KDP) and Patriotic Union of Kurdistan (PUK) to get united, and do not miss this historic opportunity. If the PUK and KDP don't merge their administrations, Kurds cannot achieve their goads, including holding a referendum.

**KM: Are you optimistic about Kurdish future in Iraq?**

Mr. Zand: Yes, I am. Since the Kurds, especially in the capital of Kurdistan, Kirkuk, have survived the worst policies of the defunct regime, known as Arabization, Ba'athification, and forceful displacements, Kurds must be optimistic.

Now, the "war on terror" in the region is in Kurdish interest, and Kurdish support for the West is as essential as Israel's support for the West. The extremist Islamic groups and nationalistic Arabs have also realized the importance of the possibility of a Western-Kurdish relationship; therefore, they call Kurdistan a "second Israel" in the region.

For 3 reasons, it is true though. Firstly, geographically Kurdistan is located in a strategic region, which plays an important role for the West's future plans. Secondly, economically Kurdistan is rich in many resources including oil and water. Thirdly, Kurdistan is powerful in terms of manpower, in comparison to the other nations in the region.

چونکە نایندەیەکی گەش و رووناکە بۆ گەلی کورد بۆ ئاواتی دوورو نزیکی کاریگەرییەکی هێجگار زۆری هەیە بۆ سەر کەرتەکانی دیکە و دەبێت هەموو لایەنەکان سەرکردەکانمان بەتایبەتی ئەم راستییە گرنگە مێژووییە نابێ فەرامۆش بکرێت.چونکە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا لەخەباتی رزگاری خوازی سەردەمدا گەش و گوڕسایەکی تەواوی هەیە.. ئەبێ ئەمە لە دەستووردا بچەسپێت وەسوور بێن لەسەری.

• دوا پەیڤت و ئامۆژگاریت؟

- دوا پەیامم یەکگرتن و تەبایی و ریز بەندی و سەرداتەوانەدن بۆ لەخۆ تواناتر. کوردایەتی و هێزی نەتەوەیی و سۆزلایەتی. چونکە سیاسەتی دەرەوە لەسەر بنەمای سیاسەتی ناوخۆی ناوەوە بنیاد دەنرێت.

یەک دەنگی لەپەرلەمانەدا و یەک هەلوێستی ویەک سندوقی نەتەوەیی یەک ستراتیجی نەتەوەیی سەرانسەری و بەرەی نیشتمانی سەرابای یەک بازاڕی نەتەوەیی یەکگرتوو و پتەوکردنی خەباتی لەزناغی رزگاری و سەرتاپا هاوکاری حزبی و ناحزبی چونکە بێلایەنی نییە- هەموومان هاوپەیمانی حزبی و ناحزبین و هاوکاری پیرو جەولن- شێوازی کاری شۆڕشگێری- هێزی پیرو دەست و توانا بەرەمی ئەمەیە شێوازی کاری رامیاری و سیاسی و کە لەیەکخستن ویەکگرتوو هاوکاری- هاوخەباتی - پێشمەرگەی هەر هەموو کۆمەڵ و پارتە سیاسییەکانی کەرتە کوردستانییەکانمان بۆ جێگیرکردنی ئەم فیدرالیەتەی کەرتی باشوور کەجێگە پێیە بۆ کەرتەکانی تری کوردستان و خۆی دەبینێتەوە رەنگدانەوەکەی لەسندوقی یەکگرتووی نەتەوەیی دلەدەی دەچێنرێت و لەو کۆمەڵەلە سەراتسەرییەدا و کە گەرەکە رەچاو بکرێت.

گەرەکە سەرکردەکانمان ئەو راستییە بچەسپێنن کەماکوری عێراق نییە و کوردستانە وکەرتی باشوورە ـ لەدەستووردا بەئاشکرا ناوببرێت بەفیدرالی هەرێمی کوردستان جێگیر بکرێت.. تاکەی عێراق گەری ؟ نابێ لەدیموکراتی بترسێن ـ سۆزلی بچەسپێ بۆ شوێنی شیاوی کۆنفیدرالی بۆ کوردستان.

لەکاتێکدا ئێمە داوای یەکپارچەی خاکی عێراقی دروست کراو دەکەین کەچی کوردستانی باشوور دووپارچەیە؟!

• زۆر سوپاست دەکەین.

- منیش زۆر سوپاسی رۆژنامەی جەماوەرو ئێوە دەکەم کەئەرکتان کێشا و هیوادارم هەموو ئەوکەسانە بەسەر بکەنەوە کەخزمەتی نەتەوەکەیان کردووە دووبارە سوپاس.

Thursday 6 of August 1992

Dear all family !

Now, back in Sweden since Monday, I will out of my heart thank you ever so much for your kind hospitality to me during my visit.
I will never forget your kindness and hope to be able to see you again in the future.
I feel greatly honoured to have been able to meet with you all and to have been able to meet as many representatives from your people as I did.
I was sick those days till today, but recovering I will do my best to fullfill the tasks of helping your country with what I promised during my visit.

The trip by car through all the different countries, unknown to me mostly, was a hard business. I was glad to be able to act as a co-driver.
The nice little grandchildren of yours behaved bravely, beeing the most kind children I have ever met with.
I tried to play with them, making the trip enjoyable for them.
A call from Aso yesterday told me that they are all well back in Karlstad again. Karlstad is about 600 kilometres from where I live, so when leaving me here they had to go on driving for hours.
Your son entered my life in May this year at a conference by the Swedish gouvernement about taking care of refugees in Sweden. Beeing extremly interested in the question of the kurdish people and the Middle East area, I started to talk to him about it. At that time I had closed my heart to any relation with a man and decided to stay alone for the future happy with the odd family I made myself by taking an iranian refugee with wife as my son and daughter. What will happen to me and Aso is written in the stars. I have sincerely asked him to think of the matter of his family, to stay with them whatever happened with us. His children needs a caring

